ناوی کتێب بە عارەبی و کوردی:
المجتمع البشري؟ لماذا يشبه مستشفى المجانين؟
نووسەر: مەسعوود محەمەد
کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی؟ بۆچی بە شێتخانە دەچێ؟
و: حەکیم کاکەوەیس
حەساری گەورە / کەرکووک / کوردستان 2009

* * *

العنوان: المجتمع البشري لماذا يشبه مستشفى المجانين؟
اسم الؤلف: مسعود محمد
من منشوارات دار ئاراس رقم: 18
تنضيد: المجمع العلمي الكردستاني
رقم الايداع في مكتبة المديرية العامة للثقافة والفنون ـ اربيل: 1999/309
مطبعة وزارة التربية ـ كردستان
الطبعة الاولى: اربيل ـ 1999

ئەو پرسیارە کە دەیەوێ بگاتە سەر سروشت و ڕەهەند و جەوهەری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، تا ئەو ئاستەی جیهانی مرۆڤە، بە مرۆڤ خۆشیەوە، کە هۆشی تیایدا دەگاتە زەحمەتترین و وردترین و مەترسیدارترین و شاراوەترین و ئاشکراترین دیاردە لە سروشتی مرۆڤ و ئەو جیهانەی سروشت کە مرۆ بە کەرەسە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆی سەردانیان دەکا.

من کە لێرەدا دەڵێم جیهانی سروشت مەبەستم ئەو جیهانە ماتریالییەیە کە دەکەوێتە ناو جغزی هۆش و هەستی مرۆڤەوە و ئەو ئامێرە سیحریانەشی دێنە سەر کە لە ئاستی ئیعجازدان، ئەوانەش وا دەکەن بڵێین جیهانێک هەیە، دەشێ ناوی بنێین (بیندراو: شاردراوە)ی مەودای تارمایی و خەونی بە ڕاست گەڕاو Telepathy و خوێندنەوەی هزری کەسانی تر و کەرامات و بزواندنی تەن لە دوورەوە... هتد[1] هەمووو ئەوانەش لە ڕواڵەتدا ڕەنگدانەوەی ڕەنگ و دەنگن کە بەڵگەی ماتریالانەی بوونیان لە خۆیاندایە بەڵام نە دەپێورێن نە دەکێشرێن نە بە سەری پەنجە درکیان پێ دەکرێ.

ڕەنگە سڕینەوەی سەرسوڕمان لە سەر ئەوەی کە گوتم کۆمەڵگە بە شێتخانە دەچێ، سوودی هەبێ. لە سەرەتادا، ئەو دەربڕینە بەر مەودای چاو دەکەوێ ئەوجا فکری خوێنەر تێکدەدا چونکە ئەوە قسەیەک نییە لە حوکمی بەڵگەنەویستدا بێ. ڕەنگە کەرتکردنی ئەتۆم و سەردانی ئاسمانەکان بۆ بەرپەرچدانەوەم بەس بن و لە بەڵگەنەویستییەوە بگاتە سەلماندنی تەواو، بەڵام نا ئەوە نییە کە دەیڵێن!

کەرتکردنی ئەتۆم و گەڕان بە ئاسمانەکاندا و هونەری تری عەقڵی ساغ و دەروونی ئارام، هەموویان بەڵگەی گردەبڕن بۆ جیاکردنەوەی عەقڵ و شێتی ناو کۆمەڵگە چونکە خاوەن داهێنان و شارەزایانی حەقیقەتی بوون کەمایەتییەکی دەگمەنن و لە ئەکسیر دەگمەنترن و پێم وانییە لە 1 / 10000 ی ئەو پێنج شەش ملیارد بەشەرە پتر بێ کە هەیە، بۆیە داهێنەری کارەبا کەسێکی دیاریکراوە و بەر چاوی خەڵکی گێل و خەڵکی تری ڕووناک کردەوە و چاکەی ڕووناکایی هەرزانی لە هەموو شەوانی تەمەنیاندا پیشانداون... گێلایەتی خەڵکی دەوڵەمەند و مام ناوەندیش لەوەدایە بە جۆرێ سواری فڕۆکە دەبن وەک ئەوەی خۆیان نهێنی فڕینیان دۆزیبێتەوە و ئەوانە تەمبەڵترین و بەرچاوتاریکترین خەلقەندەی خودان. کۆپەرنیکوس و ئیسحاق نیوتن و ئەنیشتاین و ژمارەیەکی زۆری وەک ئەوانە وەلا نێین کە بە زانایی و لێهاتوویی و سووربوونی خۆیان لە بواری زانست و ئەخلاق و کۆڵنەداندا چاکی مەردانەیان لێ هەڵماڵیوە و بە هاوکێشەی زانستی نەبیندراو ئاسمان و جێی دووریان ئاشکرا کردووە. ئەوەی پێی دەڵێن پارادۆکس Paradox نموونەیەکی زەقە بۆ

پشوودرێژی بلیمەت و توندوتیژی ئەوانەی کەڕ و لاڵ و کوێرن و قسەیان لە باسەکاندا نییە. ئەوانە خۆیان گۆڕی و خۆیان ڕازاندەوە و خەڵکیان لەناوبرد تا هەر یەکەیان لە گومڕایی عەقڵ و ویژداندا و لە بواری پڕوپووچ و وێرانکردنی وڵاتی خۆیان و وڵاتانی دراوسێدا گەیشتنە پلەی سەرکردایەتی و بۆ گەشت و گوزاریش ڕوویان لە هەر جێیەکی جیهان کردبێ بە خوێن و ئاگر و وێرانکاری ڕازێندراونەتەوە.

ڕێم نییە بڵێم جگە لە من کەسی تر لە تانوپۆی کۆمەڵایەتی مرۆڤ و خەرمانی شێتیی و جۆرەها نەفامی و تورەهات و گومڕایی و کوێرەڕێی زۆری لە ژماردننەهاتووی بەرپەرچدانەوەی بنیاتنان و دزێوکردنی چاکە و هەڵگەڕانەوە لە عەقڵ و عاشقبوونی شێتی و تاوانبارکردنی چاکەی نەکۆڵیوەتەوە کە بەرانبەر لایەنی ڕوون و تروسکایی عەقڵی پێشکەوتوو و ئامانجی چاکەخوازی بوونەتەوە و کۆمەڵگەی مرۆڤ بە ئاستی جیاجیا لایەنی تاریک و ڕوونی هۆشی قەبووڵ کردووە: بە قەدەر دواکەوتنی هۆشیش، خاوەنی هۆشی کۆڵەوار لە بەرچاوڕوونیی دوور دەکەوێتەوە چونکە بەرهەمهێنانی نەرێتی هاندانی تێدا هەیە، ئەوەتا گەلی ئەفغانستان دەستی بە تێکدانی هەموو شتێ کرد کە پاشاکەیان دایمەزراندبوو بۆ هەندێ بەرژەوەندی وڵات سەردانی ئەورووپاشی دەکرد. ئەگەر یەکێ لەو زانا چاکەخوازانە بەرەنگاری باسی دوور و درێژی(مرۆڤایەتی) بووەوە مەزەندەم لە پێکگەیشتندا لەگەڵ باسەکەیدا بە ڕاست دەرناچێ. ڕەنگە (برتراند روسل Russell Bertrand)ی مەزنی سەردەمی خۆی، نا بەڵکو مەزنی هەموو سەردەمەکان کە لە ڕوانگەی مەترسییەکانی وزەی ئەتۆمییەوە گرنگی بە مرۆڤایەتی دا، بە هەموو توانایەکیەوە دەستودامێنی باوەڕهێنان دەکەوێ تا ئەوە خوایە خەڵکی دەسەڵاتدار و بەڕێوجێی سیاسەت و دارایی، عەقڵ بهێننەوە سەری خۆیان و بەر لە خەڵکی تر بەزەییان بە خۆیاندا بێتەوە. ئەگەر دێوی ئەتۆمی لە قومقومی خۆی هاتە دەرێ نە بەزەیی بە مەلایەکەتدا دێتەوە نە بە عیفریت، بەڵام نەمدیت "روسل" لە دەستنیشانکردنی کەموکورتیەکان و هەنگاوی چاکەخوازان و شەڕخوازاندا بەر دیدی خۆی فراوان کردبێ. کتێبی (ئایە مرۆ پاشەڕۆژی هەیە؟)ی ئەوم خوێندەوە کە خوالێخۆشبوو عەلی حەیدەر سلێمان وەریگێڕاوە، سەرنجم دا: لە زۆربەی ڕوونکردنەوەکانیدا لە سەر ڕەوتی سیاسەتی نێودەوڵەتی و ئاشتی جیهانی ڕۆڵی ڕۆژاوا زەق دەکاتەوە و لە بەرانبەریشدا هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت دەکاتە کاردانەوەی ڕەفتاری ڕۆژاواییەکان. لە بارەی هەڵگیرسانی دووەم شەڕی جیهانەوە (1939 ـ 1945) دەبێ ئاماژە بۆ ڕاستییەکی زۆر تاڵ بکەین کە پەیوەندی بە نیەتپاکی بەرەی دژە هیتلەرەوە هەیە کە لایەنی سۆڤیەت و بەرەی ڕۆژاوایە. زۆر بە کورتی، ئەوەی ڕێی بە داگیرساندنی فتیلەی جەنگەکە دا ستالین بوو، چونکە ئەو لەگەڵ ئەڵمانیا لە سەر ئەوە پێکهاتبوو پۆڵۆنیا دابەش بکەن، لە کاتێکدا ڕۆژاواییەکان سەربەخۆیی پۆڵۆنیایان گرتبووە ئەستۆی خۆیان و

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئامادەیی تەواویشیان بۆ جەنگ نەبوو و ئەڵمانیای هیتلەر لە تەوقی سەرەوە تا بنی پێ بۆ شەڕ ئامادە بوو، شەڕیان ڕاگەیاند. هێڵی ماجینۆی لایەنی فەرەنسا ڕاگەیاندنێکی ئاشکرا بوو بۆ لاوازی هێزەکەی لە هێرشکردنە سەر ئەڵمانیا، پشتی بە هێزی ئەو هێڵە ناوبراوە بەست، ئەوجا دوای دابڕانی لە سوپای فەرەنسا و سووڕانەوەی سوپای ئەڵمانیا بە دەوریدا، چ کەڵکی نەما. ستالین کە دەستی هیتلەری والا کرد، دوو هەڵەی کوشندەی کرد: یەکێکیان خەریک بوو سۆڤیەتی پێ لەناو بچێ و دوەمیان لە نەمان دەربازی کرد. پێی وابوو جەنگێک لە نێوان ئەڵمانیا و ڕۆژاواییەکاندا دەقەومێ و دوا تنۆکە خوێنی هەردوو لایان بە خەرج دەدا. بەڵام ساڵێکی نەبرد ئەڵمانیا هێزەکانی فەرەنسای نەهێشت و بە تەواوەتی تێکیشکاند و زۆربەی هێزەکانی بەریتانیاش دەرباز بوون و پەڕینەوەی ئەرمادا بۆ بەریتانیا وەک موعجیزە بوو.. ساڵی 1941یش بە تەواوەتی نەسووڕایەوە سوپای ئەڵمانیا بە هەموو توانا و ئارەزووی قووتدانی نێچیرێکی بەربەرینی وەک ڕووسیا، لە ڕوووسیا هەڵگەڕایەوە و ئەگەر دواهەڵەی ستالین لە حیساباتدا نەبوایە لاپەڕەی سۆڤیەت دادەخرا، هەڵەکەش ئەوە بوو ئەگەر دابەشکردنی پۆڵۆنیای قەبووڵ نەکردایە ڕۆژاواییەکان لەگەڵ ئەڵمانەکاندا ڕێکدەکەوتن و سوپای ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەریتانیا دەچوونە شەڕی لەناوبردنیەوە. ئەوەش زۆر لە ڕاستییەوە دوور بوو چونکە بەریتانیا بە تەنها مایەوە و زۆری نەما توانای بەرگریکردن لە دەست بدا. هیتلەریش (هێس)ی جێگری خۆی نارد تا لەگەڵ بەریتانیا ببێتە شەریک لە ناوچە ئیستعمارکراوەکاندا. بەڵام بەریتانیا لەگەڵ ئەوەشدا کە مەترسی لەناوچوونی لەسەر بوو، ئەوەی ڕەت کردەوە و ستالینیشی ئاگادار کردەوە کە ئەڵمانیا هێرشی دەکاتە سەر و با ئاگادار بێ. بەڵام ستالین قسەکەی بە فێڵ وەرگرت تا کتوپڕ ئەوەندەی بە خۆی زانی لەشکر و فڕۆکەی ئەڵمانیا وەک بروسکە پەلاماریاندا... هەڵەکردنی لەو حیسابانەدا بووە هۆی دەربازبوونی.. بۆ دووەم جار لە هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە هەڵەی کرد و بە هۆی ئەو هەڵەیەوە دەرباز بوو.

ئەوەی لەو بوارەدا جێی سەرنجە ئەوەیە لایەنە ڕووسییەکان لە دوای جەنگ داستانیان بە ناوی (پیلانی گەورە لە دژی ڕووسیا) بڵاو دەکردەوە، لە کاتێکدا چ پیلانێک جگە لە پیلانی ستالین لە ئارادا نەبوو ئەوەش بە هۆی ئەو خەسڵەتەوە کە پێشتر باسم کرد و هەموو بابەتەکە پێویستی بە باسێکی دوور و درێژ هەیە و ئێرە جێگەی نییە. ڕەنگە باسکردنی هەڵوێست و سووربوونی لینین لە سەر ڕێکەوتنی ساڵی 1917 لەگەڵ ئەڵمانیادا زەرەر نەدا ئەگەرچی بەرهەڵستکاری بەهێزی شۆڕشگێڕانیش هەبوو. لە خوێندنەوەی نەخشەی هێزەکانی جەنگدا بە هەڵەدا چوو و هێزی ماددیی و مرۆیی زۆر و زەبەندەی ئەمەریکای نەخستبووە ناو حیسابی سەرکەوتن و دۆڕاندنەوە لە کاتێکدا ئەڵمانیا لە جەنگ ماندوو ببوو و زۆریشی پێ نەچوو دانی بە دۆڕاندندا نا. ئەگەر ڕووسیای

کۆمۆنست بە شێوەی عەقڵانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڕووداوەکاندا بکردبا نەک بە خەیاڵ و ئایدۆلۆژیا، دەیتوانی کێشانە و پێوانەی باوی لە دەستدا بن و بە هاوپەیمانەتی ڕۆژاوا بمێننەوە کە هەڵوێستێکی لەوە شەریفتر دەبوو کە هاوپەیمانی ئەڵمانیا بێ و دەست لە ڕووبەرێکی زەوی هەڵگرێ کە پەنجا ملیۆن بەشەری تێدا بوو[2]. هەندێ لەو نووسینانەی لینینم خوێندۆتەوە کە بیانوو بۆ ئەو ڕێکەوتنە دێنێتەوە، گوایە بە ڕێبوارێک چووە ڕێگری لێ پەیدا بووبێ و داوای چەکەکەی لێ کردبێ. ئەگەر بەرگری بکردبا ژیانی دادەنا و چەکەکەشی دەچوو، بەڵام ژیانی هەڵبژارد تا دوایی چەک و پارەکەش وەرگرێتەوە.. بەڵام لە ڕاستیدا، بە هۆی سوپای هاوپەیمانانەوە ئەو شتانەی وەرگرتەوە لەگەڵ ئەو سەرنجەشدا کە دەرفەتێکی دەگمەن لە دەست دەسەڵاتی لینین چوو، ئەوەش ئەوە بوو نەیتوانی لە دانیشتنی سەر مێزی هاوپەیمانان وەک شەریکێکی سەرکەوتوو دانیشێ و بەهۆی ئەو پەیمانەوە کە لەگەڵ ئەڵمان بەستی، هەموو ڕێیەکانی ژیان لە بەردەمیدا داخران، بۆیە رووسیا بووە شەیتانۆکەیەک سەروەرییە شۆڕشگێڕییەکانی خۆی، لە سەر برسێتی و ڕووتی و دواکەوتوویی هەموو بوارەکان جگە لە سوپا، کاوێژ دەکردەوە. جێی سەرسوڕمان نییە ئەوەی لە شەڕی 1914 ـ 1918ی سەردەمی لینین ڕووی دا، لە 1939 ـ 1945 لە سەردەمی ستالیندا دووبارە ببێتەوە کە هەردووکیان ناواقعییان تێدا بوو و مەزەندەیان تێدا بە هەڵەدا چوو و لە هەردوو بارەکەدا بە هۆی توانای دەوڵەتە ڕۆژاواییەکانەوە کە ڕووسیا بە شەیتانی سەر زەوی دەزانین و ئەگەر چارەنووس وا بوایە لە هەردوو جەنگەکەدا ئەڵمانیا ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسای تێکشکاندبا، لە هەردوو بارەکەدا چارەنووسی ڕووسیاش تەواو لە قاڵبی سۆڤیەتیدا جیاواز دەبوو و لینین و ستالینیش لە جیهانی کۆمۆنیزم و ناکۆمۆنیزمدا وەک دوو زەبەلاح بڵند نەدەبوونەوە. دەبێ ئەو سەرنجەشمان هەبێ کە ڕۆژی ستالین هەر بە جارێ ئاوا دەبوو و کەسایەتی لینین کز دەبوو و پەیکەری دەڕووخا و لینینگرادیش دەبووەوە پەترۆگرادی جاران.

ئەگەر زیاتر لە سەر بەرتراند روسل و بارودۆخی ڕووسیا بەو شێوەیە بوەستین کە وامان بە هەڵەدا دەبا چڕیی ناونیشانی ئەم کتێبە لە لایەنی شێتیی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کەم بێتەوە، ئەوەی من دەیبینم ناوەڕۆکی هەردوو بابەتەکە لە بازنەی ناونیشانەکە دەرناچێ بەڵام بە جۆرە تایبەتمەندییەک کە ڕووبەرێکی دیار لە شێتایەتی (شارستانەتی!) دەگرێتەوە، وەک ئەو نەفامی و پڕوپووچانەی کە ملیاردەها مرۆڤی ئاسایی، سەعات بە سەعات ئەنجامیان دەدەن. بە ئەدەبێکی تەواو و ڕێزێکی زۆرەوە دەڵێم: فەیلەسووفێک لە مرۆڤە باڵاکان کە بەرتراند روسولە ڕۆح و ویژدانی خۆی بۆ بەرگریکردن لە چارەنووسی مرۆڤایەتی هەڵڕشتووە، کە هەڕەشەی بۆمبای ناوکی و ئەلیکترۆنی لە سەرە، هەر بە قارەمانێکی مەزن دەچێ کە لە جێبەجێکردنی ئەرکە پیرۆزەکەی

خۆیدا، خۆی لە بیر کردووە و بە بێ ئاوڕدانەوە لە هەوڵ و ماندویێتی و گوتەی ئەم و ئەو بەرەو ئامانجەکەی دەچێ بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە گوێ بە بوارەکانی تری ملیاردەها بەشەر نادات کە سەرقاڵی شتی پڕوپووچ و بێبەها و ئەوانەن کە بە هیچ جۆرێ سوودیان نییە، بەڵکە زیانی گەورەشیان هەیە... پێنج ملیارد[*] بەشەر بە دووی جەنازەی شازادە دایانەدا دەڕۆیشتن بەڵام هیچیان ئامادە نەبوون کراسەکۆنێک بە کەسێکی نەدار ببەخشێ تا خۆی پێ داپۆشێ: شێتایەتی لە پێشبڕکێی ڕایسز و سەکۆی زۆرانبازی و جۆرەها وەرزشدا کە تۆپێن یەکێکیانە و بە ڕاستی بۆتە نەفرەتی ئەم سەردەمە... ئەندامەتی یاریزانێکی لێوەشاوە بە دەیان ملیۆن دۆلار دەکرڕدرێ و یارییەکەش بۆ خۆی بە گرنگیدان و ماندووبوون و مەسرەفی دەیان ملیۆن کەسی ئەم شێتخانەیە سەرکەوتن بە دەست دێنێ و شێت دەستکەوتی لەو شەقوەشاندن و ئەو قەسابخانە مرۆییە نییە کە ڕێی تێ دەچێ ڕوو بدا کە پشت بە دەست و پێ و کەللە بۆ ڕێگرتن لە تۆپەکە دەبەستێ تا نەچێتە گۆڵەکەوە، لە کاتێکدا روسل لە زاناکان دەپاڕێتەوە تا بەر بە ئەتۆم بگرن و دەرکەوتنیشیان بە ئاشکرا دەبێتە مایەی گاڵتەپێکردنی ملیاردەها کەمهۆش و بێعەقڵ و نیمچەبەشەر و زۆر جاریش، سیاسەتمەداران پشتگوییان دەخەن و ئەو حکوومەتانەی توانا و هێزی وێرانکاری بەرفراوانیان هەیە لە سەر نەخشەی سیاسەتی ئەتۆمی، خۆیان دەڕۆن و ئاوڕ لە ڕوسل و ئەو خەمخۆرانەی وەک ئەو نادەنەوە کە هیوایان هەیە: دەڵێم هیوایان هەیە چونکە دڵنیام ئەوانەی دەنگیان لە نەخشەی سیاسەتی وڵاتی خۆیاندا هەبێ، بیرکردنەوەیان لەئاستی بازاڕ و پشک و ئەو بوارانەدان کە دەرگایان بۆ هەموو کەسێک والایە و بە دەگمەن نەبێ کەسی وەک روسلیان تێدا نییە گوێ لە پوختەی ڕۆشنبیری هەموو سەردەمەکان بگرێ، چونکە لە جیهانی کاروباری ئاسایی و خەڵکی ئاساییەوە دوورن و تیایاندا بێگانە و سەرسامن و پێم وا نییە ئەم کێشەیە چارەسەری هەبێ، چونکە ئاسۆی بینین و هەڵسەنگاندنی فەیلەسووفەکان بە وردترین کەرەسەی زانستی دەپێورێن و وەزیر و میر و هۆشیار و مەست تێیناگەن و ئەگەر وەهاش دانێین تێیدەگەن، هەر بە زمانی سەرجەمی خەڵکەکەوە وابەستەن و پێداویستی ناچاریان دەکا بە دەنگی سەرجەمی خەڵکەوە بچن. ئەگەر وەهاش دانێین ئەم بۆچوونە لەگەڵ وردبینی و پەیامی روسل و هاوڕێکانیدا یەک دەگرێتەوە، ئەگەر گەلی وڵاتێکی تر بە ئاڕاستەیەکی وادا چوو وەیل و تاریکەشەوی بۆ ئەو گەلە تێدا بێ کە جڵەوی شل کردووە. جیاوازی گەورە لە هەوڵی روسل و هاوڕێکانیدا ئەوەیە هەوڵی مەردانە دەدەن تا کارەساتی ناوکی نەکەوێتەوە و بێلایەنی و ناوداری و شەهامەت و مرۆڤایەتی لە بەرپێگرتن و پشووداندا ڕۆڵیان نییە چونکە بڕیاردانی چارەنووسساز ئەو سیاسەتمەدارانە دەیدەن کە ژیانی ڕۆژانەیان لەگەڵ ئەو ڕەشەخەڵکەدایە کە لە "تورەهات"ی ئەو زانایانە بێزارن کە خەیاڵ

[*] دیارە مامۆستا مەبەستی پێنج ملیۆنە و لە جێی تریشدا بە پێنج ملیۆن باسی دەکا نەک پێنج ملیارد ـ وەرگێڕ

دەکـەن و دەمەتــەقێی بابەتگـەلێک دەکـەن کـە ناچنــە مــەودای تێگەیشــتنی سیاســییەکان و ئابووریناسان و گێرەشێوێن و مۆدێلچییەکانی جلوبەرگەوە...

خـەڵکی وەک ڕوسل، تاقیکردنـەوەیان لـە سـەرقاڵیەکانی خـەڵک کەمـە و زۆربـەی ئـەو سـەرقاڵیانە پووچ و منداڵانەن و لەوەش کەمترن، بەڵام تامی قاوەی عارەبی دوای وەجبە خۆراکی باش دەدەن و نەفس دەیەوێن و دوور لە بیرکردنەوەی روسل زۆربەی کاتەکانی خەڵک دەگرنەوە.. ئیتر تا ئەو ڕۆژەی هەڵکەوتووەکانی بواری زانست دەکەونە ناو بازنەی باسە گرنگەکانی خـەڵک و گـەڕەک چ هیوایەک نییە. لێرەدا چەند دێڕێکی لاپەڕە 51ی کتێبە ناوبراوەکەی ڕوسل دەگوازمەوە کە دەڵێ:

"زۆر جێی سەرسوڕمان و پەژارەیە کە دەبینین ئەنجامی ململانێی چەکداری لادانـە لـە هەسـت و ڕەوشت. ئەگەر من بە ئانقەسـت ببمـە هۆکـاری شـیرپەنجەی کەسـێک، ئیـدی دەبمـە دڕندەیـەکی تۆقێنەری شەڕانگێز، بەڵام بە ئانقەست ببمە هۆکاری ئەو نەخۆشییە بۆ چەند هـەزار کەسـێک، بـە نیشتمانپەروەرێکی پایەدار دادەنرێم".

دەبینی ڕوسل لەو چەند ڕستەیەدا سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێ، بەڵام پێم وایە ئەگەر ئـەو کارە وەک تۆڵە ئەنجام بدا یا پێش دەستوەشاندنی دوژمن، بە ڕاستی نەک بە بیـانوو، دەسـت بوەشـێنێ، هۆکار بۆ سەرسوڕمانەکەی نامێنێ. زۆر لەو قسە نەستەقە کۆنانەی کە سەردەمیان بە سەر چـووە، لە کاتی خۆیدا ناوکی تێگەیشتن و ژیری بوونە. لە سەر ئەوەی کە فیرعەونـەکان خوشکی خۆیـان مارە دەکرد و کچیان بوایە ئەویشیان مارە دەکرد تا خوێنیان بە تەواوەتی پاک بێ چ دەڵێی؟ ئەی لەبارەی ئەوەوە کە حاجی، لە پێش ئیسلامدا بە ڕووتیی دەچوونە کەعبە چ دەڵێی؟ ڕەنگە هۆکاری ئەوە، ئەوە بووبێ تا لە هەموو خڵت و خاشێکی ژیان، با گەڵا هەنجیرەکەی ئـادەم و حـەوایش بێ، دابـڕێن ئـەوجا بـە دەوری مـاڵی خـوادا بسـووڕێنەوە، چونکـە ئیحـرام شـەڕڕاگرتنی نێـوان ڕووتـی و پۆستەییە. عائیشەی پایەدار گوتوویەتی یەکێ لە جۆرەکانی هاوسەرگیری پێش ئیسلام ئەوە بـووە کابرا ژنەکەی خۆی ناردۆتە لای فەحلێکی بەشـەریی بـەهێز تـا لێـی ئـاوس بێ و منـداڵێکی بـەهێز بخاتەوە.. بـە دڵنیاییـەوە ڕوسـل مرۆڤێکی لێهاتووی ئاسـتێکی بـاڵا بـوو و لـە سـەر بابـەتی قـورس و هەسـتیار و لێکـدووری نووسـیوە و بـە هۆیانـەوە تووشـی سـەرهێشـە بـووە و بەنـد کـراوە و دوور خراوەتـەوە و سـزا دراوە و خەسـڵەتی تایبـەتی خـۆی هـەبووە و ئەوەنـدە بەسـە بڵێـین پێـنج جـاران هاوسەرگیری کرد و بە تەڵاق لە چواریان جیا بـووەوە و لـە تەمـەنی هەشتا ساڵیدا ژنی پێنجـەمی هێنـا و کـە سـاڵی 1970 کـۆچی دوایـی کـرد لەتەمـەنی نـەود و هەشـت سـاڵیدا بـوو. نـازانم ژنـی پێنجەمیشی تەڵاق دا یا لە کۆتاییەکانی ژیانیدا هێشتیەوە! بێگومان هەوڵی مەردانە بۆ بەختـەوەری

مرۆ خۆی لە خۆیدا شەرەفێکی گەورەیە بەڵام قسەکردن لە سەر کاریگەری و بێئاکامی ئەو هەوڵە بابەتێکی تەواو جیاوازە، چونکە ئەنجامی ئەو هەوڵەی بە خەرج دەدرێ بە ئەنجام و قەبووڵکردنی پێشنیازەکەیە نەک جوانی و بەرزیی پێشنیازەکە. بە پێی نەریتی باو تووشکردنی کەسێک بە شیرپەنجە تاوانێکی گەورەیە بەڵام لە بەرگریکردندا لە وڵات، کوشتنی هەزاران کەس بە بۆمبای ئەتۆمی یا ئاسایی دەچێتە خانەی ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە، ئەوەش شێوەیەکە لەناونیشانی ئەم کتێبە و ملیۆنەها نموونەشمان لەو بارەیەوە لە بەردەستدان و لە شەرعی ئیسلامدا هەندێکیان لێ هەڵدەبژێرین کە لە ناخی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییەوە هەڵقوڵاون، وەک هێنانی دوو ژن و سێ ژن و چوار ژن و ئەوەندەی بۆتان دەلوێ و لە بەهەشتیشدا حوری بێ ژمارە، بەڵام ژن لە هەردوو دنیادا هەر مێردەکەی خۆی هەیە. داگیرکردنی وڵاتی بێئیمانان، ئەوەندەی بۆیان دەلوێ، لە سەر موسوڵمان ئەرکە. لە باسە مێژووییەکاندا هاتووە کە ئەبو لوئلوئە لە تۆڵەی داگیرکردنی نەهاوەند دووەم خەلیفەی کوشت، ئەوەش بە تەواوەتی بەشەر و ئاژەڵ و هەموو ئەوانەی گرتۆتەوە. کە لایەنگر دەبن. ئەگەر روسل ململانێی چەکی شەیتانی دەکرد، هەڵبژاردەیەک لە زانای موسوڵمانانیش لە هەندێ ڕۆژگاری سەردەمی عەباسییەکاندا ئاژاوەی "داهێنانی قورئان"یان دروست کرد و نازانین چەند زانا بە هۆی باوەڕی گردەبڕیانەوە بەوەی کە قورئان کۆنە و خەلق نەکراوە، کوژران.

ئەم ئاوڕدانەوە سەرپێییە (بێ قووڵبوونەوە ـ چونکە قووڵبوونەوەی پێویست نییە) لە لایەن زانا و فەیلەسووفەکانەوە بە لای کێشەکانی سەردەمەوە کە یەکەمیان ترسی ئەتۆمییە، هەروەها هەڵوێستی لینین و ستالین لە هەردوو جەنگەکەدا، خوێندنەوەی ڕەفتاری خەڵکانێک بوو کە پشکی باشییان لە ڕۆشنبیری جیهانیدا بووە (ڕوسل و هاوڕێکانی) و لە سیاسەتیشدا لە بەرزترین پلەدا (لینین و ستالین) دیتمان فەیلەسووفەکان لەگەڵ ئەوەشدا ویژدانیان ئاسوودەیە زۆر لە لۆژیکی سەردەم و حوکمی واقیعەوە دوورن... لینین و ستالینیشمان دی (زۆر لە سیاسەتمەدارانی تری ئەو سەدەیەش) هەڵبژاردنی گونجاوتریان پەسەند کرد. ئەگەرچی هەڵوێستی ڕوسل و هاوڕێکانی لە خراپترین باردا بێزەرەر بوو ـ بە پێی باوەڕی من ـ ڕەفتاری لینین پڕ بوو لە ئارەزووی تایبەتی کە ناودەرکردنی لێ دەچروسکایەوە لە کاتێکدا بە تەنیشتیەوە لە کوژانەوەدابوو و زۆربەی کاتیش نەدەما. هەر ڕا و هەڵوێست و ڕەخنەیەک لە سنووری ئاسۆی بەردەمیدا نەبێ بە تایبەتی لەو گۆڕەپانەدا کە ئەو ئەسپی چینایەتی و دارشتن و دیموکراتی تێدا تاو دەدا، هەموو قایلنەبوونێکی خەباتگێڕێک یا بیرمەندێک یا سیاسەتمەدارێک بە بۆچوونی ئەو، کفرێکی تەواو و لەرێلادانی یەکجارەکی و خیانەتێک بوو دەمەتەقێی هەڵنەدەگرت. ئەوجا دوای تێکچوونی تەندروستی ئەو و درەوشانەوەی ئەستێرەی ستالین کە ئارەزووی دەستبەسەرداگرتنی تەواوی ڕووسیای سۆڤیەتی و

ئاراستەکردنی خەباتی چینایەتی شۆڕشگێڕی دنیا و سەرکەوتنی یەکجارەکی بە سەر رەببولعالەمیندا لە کەللەی دابوو، ئاگاداربوونەوە لە هەڵەکانی خۆی دادی نەدا. ئەوجا دوای مردنیشی بە چەندین ساڵ پەرستنی بەردەوام بوو و پیرۆزییەکەی بۆ ئەرک بۆ تێگەیاندنی دەیان ملیۆن کۆمۆنست تا ئەو ڕۆژەی لە گۆڕیان دەرهێنا و بە زۆر هەڵەی گەورە تاوانبار کرا. ئەو دیمەنەی لە توێژی سەرەوەی زانیاری و سیاسەت خستمانە ڕوو وێنەیەکی ئیرۆستوکراتی بڵندی ئەو شێتخانەیەیە کە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا بڵاومان کردەوە و ئەوەندەشی بەسە کە پشتی بە حیساب و مەزەندەی وا بەستووە لە ناهەمواریدا دەگاتە پێچەوانەی ئامانج یا ئەنجامێکی تر...

تیۆری و خەیاڵکرد و ڕاو بۆچوون کە تا ئەمڕۆمان بابەتی سەرقاڵی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و خودی مرۆڤ بوونە لەو بوارەدا کە ببێتە بیانوو بۆ پێشنیازی ئەوەی لەم کتێبەدا ناوی "شێتخانە"ی لێ بندرێ، لە هەموو ئەوانەی لەو بوارەدا خوێندوومەتەوە و بیستوومە یەکێکیان ئەنجامی نەپێکاوە و بایی پێویست لێشی نێزیک نەبۆتەوە: کە من ئەو قسە گەورەیە دەکەم، لەبەر گەورەیی زانست و ناوداری نییە چونکە فەیلەسووفەکان خوا خێریان بنووسێ، لە خوێندنەوەی مێژوو و کۆمەڵایەتی، کە هەردووکیان یەکێکن و لە خودی مرۆڤ کەوتوونەتەوە، بە چاوی خێلەوە مێژوو ئاراستە دەکەن و پێویستی ئەوە بۆ ڕەخنەگرانیان ناهێڵن بۆ بەرپەرچدانەوەیان زانستی کۆن و نوێ بە سەر بکەنەوە. ئەم قسەیەش لە بارەی باوەڕ و فەلسەفەوەیە نەک زانستی موختەبەری تایبەت بە تاقیکاری و سەپاندن کە هەڵەکردن بە سەر خۆیدا دەشکێتەوە..

هەموو فەلسەفە و بیر و ڕایەک کە بە بێ تاقیکاری لە هۆشی مرۆڤ دەکەوێتەوە، بە یەکێ لەم چوار شێوەیە دەردەکەوێ: 1ـ ڕاستی ڕەها 2ـ تێکەڵەیەک لە ڕاست و هەڵە 3ـ هەڵەی زۆر و ڕاستی کەم 4ـ هەڵەی کەم و ڕاستی زۆر 5. سەرجەم هەڵە. ئەگەر بۆچوونێک تێکەڵێک بێ لە هەڵە و ڕاست، ڕێی تێ دەچێ لە لایەن خەڵکەوە بە یەک هەڵوێست یا زیاتر پێشوازی لێ بکرێ: 1ـ قەبووڵکردنی هەندێ لە هەڵەکانی و هەندێ لە ڕاستەکانی. 2ـ ڕەتکردنەوەی لایەنە ڕاستەکانی. 3ـ قەبووڵکردنی هەڵەکانی. 4ـ قەبووڵکردنی ڕاستەکانی. 5ـ ڕەتکردنەوەی هەڵەکانی. 6ـ قەبووڵکردنی هەڵەکانی و ڕاستەکانی. 7ـ ڕەتکردنەوەی ڕاست و هەڵەی. ڕەشەخەڵکەکەش لەو بوارەدا بە ڕێیەکدا دەڕۆن کە ـ زۆربەی کات ـ مامۆستایەکی ماستاوچی ڕێگەی بۆ خۆش کردون و هەندێ جار وای لێ دێ پێشڕەوێک کە ئاماژەی بۆ دەکرێ سووک و چرووک دەکرێ و تا ئەو ئاستە دادەبەزێ ببێتە گەمەی منداڵان و خرفکردنی شێتەکان، وەک ئەوەی خالید بەگداشی سکرتێری حیزبی کۆمۆنستی سووریا لە دوای مردنی ستالین و لە گۆڕدەرهێنانیدا پێی کرد، کە گوتی: "ئەوە بۆ مارکسیزم دەوڵەمەند بوونە" منیش هەر ئەوەم پێ کرا بڵێم: ئەگەر ئابڕووبردن دەوڵەمەندبوونی

مارکسیزم بێ ئیفلاسکردن چۆنە؟ ئەگەر بەگداش ڕێی هەبێ گەوهەری ئاوها پەرت بکا پیاوی ئاینیش ڕێی هەیە بە کوفردا هەڵبڵێ و بیکاتە هۆکاری بەهێزبوونی باوەڕ لە ڕۆژی قەیامەتدا!!

تۆ بڵێی ئەو شێتخانەیەی کە باسمان کرد شێتی مەزنیش لەخۆ بگرێ؟

بۆ ئەوەی قسەکانم بۆ ئەوە نەگێڕنەوە کە دوژمنایەتی ماتریالیزم دەکەم، دەڵێم: لە بواری ئاینیشدا خەڵک هەن بە هەموو توانای جەستەیی و هێزی عەقڵ و تەڕوبڕی زمان، دەیانەوێ بیسەلمێنن کە گەشتی ئاسمانەکان درۆیە. بۆ سەرەتای سەردەمی وەرگێڕان، لە سەردەمی عەباسییەکاندا بگەڕێوە دەبینی زاناکان فەتوای کوفریان بۆ هەموو زانست و قسەی نەستەق و لۆژیکێک، کە لە یۆنانییەوە وەرگێڕدرانە سەر زمانی عارەبی دەرکرد و تەنانەت ئەندازیاریش خرایە ئەو بوارەوە بەڵام خۆشبەختانە خەلیفەکان کەهنووت نەبوون و بە لایانەوە ئاسان بوو چاو لە زانست و هونەر بپۆشن مادام بە سەر شەراب و ئەوین و خۆشگوزەرانیدا کەوتبوون.

ئیبن خەلدوون دەڵێ: کەمترین زانستمان پێ گەیشتووە چونکە عومەری کوڕی خەتابی گەورەمان فەرمانی بە فەوتاندنی زانستەکانی فارس دا... با ئاوڕ لە عیلمانی بدەینەوە، لە بیرەوەرییەکانی ئاغاخانی هنددا خوێندمەوە کە گەورەترین زانای فیزیای ئینگلیز لەسەرەتای هەوڵی فڕیندا ڕایگەیاند: ئەوەی بڵێ تەنێکی لە هەوا قورستر بێ دەفڕێ شێت و گێلە. کۆمەڵێ لەوانەی لایەنگری ئەرستۆ بوون بۆ ئەو قسەیەی کە دەڵێ تەن چەند قورس بێ خێراتر بەرەو زەوی دادەکشێ، هەندێ کەس ئەوەیان ڕەت کردەوە و لەسەر بورجی پیتزای لارەوە دوو تەنی جیاوازیان هەوادا و پێکەوە گەیشتنە زەوی. بەڵام دەروێشەکانی ئەرستۆ لە سەر هەڵەی خۆیان سوور بوون..

کەهنووتەکانی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست زانایەکی فەلەکییان سووتاند چونکە سوور بوو لە سەر ئەوەی کە زەوی بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە. گالیلۆ ڕاکێشرایە دادگای کەنیسە و بۆ پاراستنی ژیانی خۆی، ناچار بوو سووڕانەوەی زەوی ڕەت بکاتەوە.

ئەو نموونانە زاناکان لە نەزانەکان پتر لەخۆ دەگرن چونکە نەزانی ساکار شتێ دەڵێتەوە کە لە مامۆستاکانی بیستوون و ڕێی تێ دەچێ بە دوای هەڵەیەکی تر بکەوێ و قسەی سەروەرێکی تری زمانشیرینتر دووپات بکاتەوە. بەڵام یەکەم پێشڕەو ماوەیەکی زیاتر بە دوای هەڵە دەکەوێ، ئەوەش لە بەر دوو هۆ: یەکەمیان قووڵیی ڕەگی باوەڕەکەی لە چاو قوتابیەکانیەوە. دووەم خەمخواردنە لە لەدەستدانی دەروێشەکانی بێ ئەوەی بتوانێ بە ئاسانی لە پێستە کۆنەکەی دەرچێ و بچێتە پێستێکی تازەوە. مامۆستایان خەڵکانێکن ئاماژەیان بۆ دەکرێ بۆیە گۆڕینی باوەڕ و

هەڵوێست کات و ماندووبوونی دەوێ و بۆ کەسێک دەبێ تاقیکردنەوەی لەو بوارەدا هەبێ. هەر بۆ نموونە دەڵێم کەسێکی وەکو فەهد چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکرا بەرەو لیبرالییەت لابدا و سەید قوتبیش هی ئەوە بوو ژیانی خۆی لە پێناوی پەیامەکەیدا بەخت بکا.

لە بواری لێکدانەوەی سەیری ئایندا شتی زۆر بێ لزوومی لە هۆشەوە دوورم خوێندۆتەوە، موفەسیر دەڵێ گوتنی بوونی شفا لە دەرماندا شیرکە، چونکە خوا خۆی شفا لە دەرماندا خەلق دەکا. لەو ڕۆژانەی دواییدا لە یەکێ لە کتێبەکانی مامۆستا عەباس مەحمود ئەلعەقاددا خوێندمەوە (ئەمە قسەی 1998/6/17مە) نابێ بڵێی ئاگر خۆی لە خۆیدا سووتێنەرە بەڵکو ویستی خوا هێزی سووتاندن بە ئاگر دەدا. ئەگەر خۆ بە دەستی ئەو جۆرە قسەیەوە بدەین خورافەتێک پەیدا دەبێ ئاین بۆ کەسی عاقڵ ڕاست دەرناچێ، چونکە خوای جیهانان دەبێتە خولقینەری هەموو ئیرادەکان کە زۆربەشیان خراپە و زاڵم و شەرمهێنەرن و کەرامەت دەڕووشێنن.. ئەو فاسقەی حەز لە زینا دەکا شەهوەتی بە ویستی خۆی نابزوێ بەڵکو بە ئیرادەی خوا دەبزوێ و جگە لەوە، بە ئیرادەی خۆی بەرەو فەسادی ناچێ بەڵکو بە ئیرادەی خوای جیهانان هەنگاو بەرەو جێی بەڵالێدراو دەنێ و توانای زینای نابێ ئەگەر خوای جیهانان جێیەکی دیاریکراوی جەستەی ئامادە نەکا... تەنانەت ئافرەتی لەشفرۆشیش بە ویستی خۆی دەرفەت نادا پیاو دەستی پێ بگا.. بە کورتییەکەی، هەموو کارێک بە چاک و بە خراپەوە ئافەریدەی دەستی خوایە. ئەوەی لە خەیاڵی ئەوانە دەرچووە کە ئەو جۆرە قسانە دەکەن، ئەوەیە کۆمپیوتەر و ئامێرە جادووییەکان کە تێگەیشتنی مرۆڤ بە دەستیانەوە داماوە، لە کاتی دیاریکراوی خۆیاندا دەستبەکار نابن ئەگەر خوا نەیانخاتە کار، وەک ئەوەی خوا حەرەسی بریگری ئاگادارکردنەوەی ئەو ئامێرانە بێ. ئەم ئەنجامگیرییە بەوەمان دەگەیەنێ کە ئامێری لەکارکەوتوو تا چاک نەکرێ ناکەوێتەوە کار. بزانە ئیرادەی خوا چوند بە ئیرادەی وەستاکانەوە پەیوەستە. ئەگەر ئامێری تەلەفۆن پەکی بکەوێ ئیرادەی خوا بەخۆ ناکەوێ تا مرۆڤێکی ئاسایی کە پێی دەگوترێ وەستا نەیەت و چاکی نەکاتەوە: ئەوجا ئیرادەی خوا بەخۆ دەکەوێ تا ئیرادەی کرێکارەکە ببزوێنێ، ئەدی ئەگەر ئەو وەستا مەلعوونە یاخی بوو چی بکەین؟ لەو بیرۆکە ساکارانەوە بەوە دەگەین کە مرۆ بەر لە دۆزینەوەی بزاوتنی زەوی دەبوو باوەڕیان وابێ کە هەموو ڕۆژێ خۆرهەڵاتن و ئاوابوونی بە فەرمانی تایبەتی و ڕاستەوخۆی خوا دەبێ و تیشکهاویشتنی بەیانیانی ئەرکێکە و دەبێ جێبەجێی بکا.. مەسەلەی مانگیش لە گەورەبوون و چواردە شەوی و بچووکبوونەوەیدا وەک مەسەلەی خۆرە لە کاتێکدا مانگ هەموو مانگێک ماوەی نیو مانگی قەمەری لە یەکێ لە جەمسەرەکانی زەوی دەباتە سەر و خۆریش نیوەی ساڵ لە جەمسەری باکوور و نیوەکەی تر لە جەمسەری باشوور کوێستان و گەرمیان دەکا و لە جێیەکانی تر هەموو بیستوچوار سەعاتی شەو و ڕۆژ جارێ هەڵدێ و ئاوا دەبێ. دەبێ ئەو کەسەی بەر لە

دۆزینەوەی ئەو ڕاستیانە و بڵاوبوونەوەیان چی لێ چاوەڕوان کرابێ ئەگەر پێی گوترابێ جەناب خۆرەکەت شەش مانگە لە جەمسەری باکووری زەوی خۆی شاردۆتەوە و دوایی بە پێچەوانەوە دەبێ؟

هەڵوێستەی درێژم لەگەڵ عەقاددا هەیە. ئەو لە زانیاری و قووڵبوونەوە و بڕینی بەربەستدا مەزنە و لە کۆتاییەکانی ژیانیدا نێوانی لەگەڵ کاروباری سەلەفییەتدا خۆش بوو، بەڵام لە پشتی ئەو شووره قایم و تۆکمەیەوە کە لە دارشتنی بەپێزی درەوشەدار پێک هاتبوو کە لە وێنەی دەگمەنە، نا لە کۆن و نوێدا لە دەگمەنیش دەگمەنترە، لە کتێبەکەیدا "ئیبلیس" هەندێ ڕستەی لە سەرەتاوە گوتووە، لەمەزنی و بەهاداری و گردەبڕیدا بە دڵم بوون و خۆی تیایاندا زۆر لەو جیهانە زیاتر باوەڕی بە خۆی هەیە کە بەڵگەنەویستەکان دەڵێتەوە و دەستبەرداری بەڵگە دەبێ و قسەکەی وا دەست پێ کردووە ئەگەر مرۆڤ بەخۆی شەیتان بخولقێنێ و لەودا نەفرەت لە خراپەکاری و بەدایەتی بکا، بە حیکمەتیکی گەش دەگا. ماوەی دەوروبەری دە ساڵ ئەو بیرۆکەیەم لەگەڵدا ژیا، دوایی کتوپڕ گەورەیی ڕاستییەکم لێ روون بووەوە کە لە هێزی دەربڕینی عەقاد پەنهان بوو، ئەوەش ئەوە بوو ئەگەر شەیتان وەک داستانێک داهیندرابێ، لە یەک چاوترووکاندا یا لە ماوەی نەفەسێکدا هەموو ئاینە ئاسمانییەکان هەرەس دێنن و تەنانەت دەبنە گەورەترین درۆ لە مێژووی مرۆڤی شارستان و ناشارستاندا و ڕۆژوو و نوێژ و حەج و زەکات و غەزا و دەریای کتێب لە بەرزڕاگرتنی خوای جیهانان بە بەرزڕاگرتنی فەرمانی نەهیکردن، دەبنە ناڕەوایی و ڕێبزری. ئەنجامیش ئەوە دەبێ خوانەناسێک کە پەیکەرێک لە بەرد یا لە دار دادەتاشێ و لەو ڕێیەوە داهێنەری کەون دەپەرستێ (لە خوا نێزیکمان دەکاتەوە) لە ساختەکار و شەعبەدەباز شایستەترە بچێتە بەهەشتەوە. دوو سەد ساڵ جەنگی خاچ لە نێوان ئەو هێرشبەرانەدا کە دەیانویست شەعبەدەبازان بهاڕن لەگەڵ ئەوانەدا کە بەرگرییان لەو کەلەپووره دەکرد کە بۆ پێغەمبەر گوازرابۆوە... وای بۆ ئەوانەی تێنووی قومێ ئاوی کەوسەر و ناسکیی حورییەکان بوون.

نێزیکەی شەست ساڵ بەر لە ئێستا و لە یەکەم خوێندنەوەمدا بۆ کتێبی "سەلەف" کە هی فەیلەسوفێکی کەموێنەی هاوشێوەکانی خۆیەتی ئەویش ئیمامی غەزالی، زانا و فەیلەسووفی ئیسلامە، وام بینی بۆ ڕەتدانەوەی هەندێ بۆچوون کە دەدرێنە پاڵ سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) و لاوازییان زۆر ئاشکرایە و لەگەڵ زەینی زانایەکی زەریائاسادا نایەنەوە، شەرمێکی زیادەڕۆیانەی هەیە.. ئەوەی بەر چاوم کەوت و بەلامەوە جێی سەرسوڕمان بوو شتێ بوو لە کتێبی مەزەبێکی ئیسلامیدا خوێندمەوە، دەڵێ: ئەستێرەیەک لە ئاسمانەوە بەربووەوە و عەباسی مامی پێغەمبەر ئاواتەخواز بوو لە ماڵەکەی ئەودا بکەوێتەوە، بەڵام ماڵەکەی عەلی (ڕ.خ) هەڵبژارد. کتێبەکەش لە

ڕۆژگاری ئێمەدا چاپ کراوە و هەمووماڵ دەزانین ئەستێرە وەستاوەکان، هەموویان بە ملیۆنەها جار یا بە لای کەمەوە هەزاران جار لە زەوی گەورەترن دەنا نەدەبیندران. ئیدی بیری لێ بکەوە ئەو قسە بێ سەروبەرانە چ کاریگەرییەکی دەروونییان لە سەر خەڵکی هەبووە و ئەگەر هەموو تەمەنت بۆ ئەوە ببەیتە سەر یەکێ لەوانە بێنیتە سەر ڕێ کە باوەڕیان پێی هەیە، هەر بەو ئەنجامە دەگەیت ئەو خەفەت بخوا کە تۆ بە ڕێی نابەجێ و هەڵەدا ڕۆیشتویت.

ئەوانە نموونەی هەڵبژێردراو نین لە ناو بێبنەمایانی نەخۆشخانە دەروونییەکەدا. ساڵی 1935 لە یەکەم سەردانمدا بۆ بەغدا گەورەترین زانای ئاینی کەرکووکم دیت لەکازمیەوە بۆ بەغدا سواری (ئەلکاری) ببوو و لەو گوناحە گەورەیە بێزار بوو گوایە ئەگەر ناچاری نەبێ حەرامە.

ئەگەر من بم یا خوێنەرێکی شارەزای فکر بێ یا یەکێکی دوودڵ لە نێوان قوتابخانە فکرییەکاندا، بە کەڵکی ئەوە نایێ لە سەر خوێندنەوەی ئەم کتێبە بەردەوام بێ ئەگەر ئەم خاڵانە ڕەچاو نەکا:

1. سیاسەت و ئابووری وەک پێوانەی ڕاست و ناڕاست لە باسەکەدا لە بیری خۆی بەرێتەوە.

2. باوەڕی خۆی بداتە پاڵ بوون بە گشتی تا بە پێوەری خۆی بۆچوونەکانم نەپێوێ و ئەگەر نەیتوانی بێ لایەن بێ و بۆچوونی خۆی بە سەریدا زاڵ بێ، با شێوەی جیاوازییەکان و هەر ڕایەکی تر کە دیەوێ، ڕابگەیەنێ.

3. ئەگەر زۆربەی تەمەنی خۆی لە سەرهێشەی وردبوونەوە لەبەشەر لە ناو سەرجەمی بووندا سەرف نەکردبێ، کوتانی ئەم دەرگایە بە کەڵکی نایێ.

4. ئارەزووە تایبەتییەکانی خۆی لە کێشانەکردنی بیردا لە هۆش و ناخی خۆی بسڕێتەوە چونکە نەفس فەرمان دەردەکا...

نامەوێ تەمێی زیاتر بکەم.. ئەوەشی دەخەمە سەر کە زۆر کەس لەوانەی ڕووبەڕووی بۆچوونەکانی من بوونەتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی ئەنجامیان بە ڕاست گەڕاوە، خۆ زل دەنوێنن ئەگەرچی لە ویژدانیاندا چەسپاوە کە من بە چاوی ورد و ویژدانی پاکەوە دەڕوانم... لەعنەتی هەموو کەون لەوانە بێ کە بۆ مەبەستێک درۆیان دەکەن یا خۆیان لە هەق گێل دەکەن.

ئەگەرچی بۆ ململانێی ئەو جۆرانە چالاک و توندم بەڵام بۆ نارەزایی لە هەندێ توێژە فکرییەکان ـ سیاسیش دەچێتە ناو تەمومژەکانی قسە توێکڵاویەکانیەوە، ئەگەر دارشتنەکەم ڕاست بێ ـ خۆ

ناگرم. لە جیهانێکدا بە توندوتیژی و گرگرتوویی وتوندڕەوی ڕۆژ بێتەوە، باوەڕ ناکەم خەڵک لە بیریان بێ چۆن نان دەخۆن و چۆن لەبەر دەکەن و چۆن پێدەکەنن و بە دڵنیاییەوە لا بە لای چێشتلێنان و گسکدان و خەمە مرۆییەکان ناکەنەوە بەڵام بە هونەرمەندی و شاعیریێتی پڕن تا ئەوەی تاکەتاکەیان دەگاتە ئاستی ئیعجاز، جا لەگەڵ مندا ئەم قسانەی سارتەر بخوێنەوەکە دەڵێ: "پەرژینەکە بزاوتنێکی گەورەی سەوز بوو و دەتگوت شەپۆلێکی زەریایە و لە چرکەساتی بڵاوبوونەوەیدا بەستوویەتی"... ئەوەندەم زانی لە دوای قەسابخانەکەی مەیدانی سوور، یا نازانم ناوی چییە، دەبینم ڕۆژنامەی حیزبی کۆمۆنستی چینی لە پەکین دەفرۆشێ.. بێگومان خۆتەرخانکردن ئامانجێکی پیرۆزە و تەنانەت گرنگیشە و لایەنی گرنگی قارەمانێتییە، ئەوەتا پیاوێکی وەک جەلالەددینی ڕۆمی لە یەکێ لە شیعرەکانیدا ڕوو لە شەمسی تەبریزی دەکا و شتێکی لەم بابەتە دەڵێ: هێشوە ترێیەکم لە باخچەکەت کردەوە و بە جوببە و عەمامەکەم نرخیم دا.. جەلالەددین زانایەکی گەورە بوو بەڵام کە چاوی بە شەمس کەوت بارودۆخی گۆڕا و کۆڵان بە کۆڵان و شوێن بە شوێن بە دەسووڕایەوە، ئەوجا بە دەیان هەزار بەیتی ئاگراوی (مەسنەوی) نووسی و لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بووە نایابترین قەسیدەی ویژدانی. دیوانێکی بچووکیشی هەیە هەمووی ڕووی لە شەمسە و سەرجەمی سووتان و هەڵقرچانی جگەرە. یەکێ لە قەسیدەکانی ئەو دیوانە بە تەرنیمەیەکی سۆفیانەی وا کۆتایی دێ، کە جگە لە یاهو، واتاکەی دیار نییە، ئەوەش "تەنەنناها یاهو"ە و مەبەستیش لە یاهو خوایە. سەمەرەی بەیتێکیم لە بیرە کە بە فارسی دەڵێ:

که سر از پای ندانم تنناها یاهو

واتا، چی دی سەر و پێ لێک جیا ناکەمەوە تەنەنناها یاهو. یەکێ لە بەیتەکانی تری ئاوهایە:

تەننەنتەن تەننەنتەن تەننەنتەن یاهو
تەننەنتەن تەنەننەنتەن تنناها یاهو

لە ڕۆمی دەگەین و ناهەقی نییە، چونکە ئەو پیاوێکی ئاینییە و تووشی سۆفییەکی کاریگەر هاتووە و سۆفیانە عاشقی بووە و ڕکێفی لێ وەرگرتووە و چ دژبەر لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا نییە و هەڵچوون لەو ڕووداوەدا نەبووە. بەڵام سارتەر لەوەی ئەنجامی داوە بیانووی نییە مەگەر ئامانجی خۆسەپاندنی لە بواری ڕۆژنامەفرۆشیدا بووبێ، ئەوەش بە دەستبەردان لە پێوەری ڕەفتاری باو ئەگەرچی ئەوەش هەڵوێستەیەکی پێ دەوێ چونکە مەسەلەکە دەبێتە جۆرە نواندنێکی شانۆیی. ئەدی ئەو هەموو خوێنەی لە مەیدانی پەکین ڕژا بۆ کوێ چوو و ئەوانە خۆدەرخستنێکی بچووکی سارتەرانەیان بۆ خۆیان و خەڵک دەیانویست. ئەوە دەڵێم و دەزانم جەماوەری مەیدانی پەکین

ئەگەر دەسەڵاتیان لە دەست بوایە هەر وەکو کۆمۆنستەکانیان دەکرد و ئەگەرچی تێکەڵەیەک بوون لە خەڵکی بێپێناسەی ڕوون، ئەوەش لەبەر ئەوەی لۆژیکی ڕاپەڕینی جەماوەری لە بارودۆخی وادا دەسەڵاتی تازەی پێدەوێ تا یاخیگەریتی جێگیر بکا، ئیدی بەڵگەنەویستە کە دڕترین و توندترین کەسانی ڕاپەڕینەکە دەبنە سەرکردەی نوێ… ئەوەش بەڵگەنەویستە کە ئەوانیش هەر ئەوەیان دەکرد کە ماو تسی تۆنگ دوای ماوەیەک لە وەرگرتنی دەسەڵاتی پارتی کۆمۆنستی چین ئەنجامی دا و لە سەرەتادا وەک سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەستی پێ کرد. قسە لەم بارەیەوە درێژە دەکێشێ و ڕەنگە دواتر تووشی ئەو بابەتە قسانە ببینەوە بەڵام بە ئەرکی خۆمی دەزانم لە چەند ڕستەیەکی کورتدا ستایشی سارتەر و جەماعەتەکەی بکەم و خاڵ لە سەر هەندێ پیت دانیم تا مەوداکە فراوانتر بێ و خەڵکی بەرچاڕوونی تریش، کە خاوەنی دیدی تایبەتی خۆیانن بۆ چارەسەری کێشەکان، لەخۆ بگرێ و چارەسەریش لە ویستی زاتی دوور نەبوو و چاوەڕوانیش نەدەکرا تەرازووی ژیان بەرەو چاکتر بگۆڕێ: بە دڵنیایی و سووربوونەوە دەڵێم لادانی دەستەیەکی فکری یا هونەری یا سیاسی یا هەر شتێکی تر لە تەرازوو و شێواز و یاساگەلێک کە پێویستی خەڵک بە گشتی دابین دەکەن و بەرەو کەشوهەوایەکی قەبووڵکراوی بێترس و ئازادی ڕەفتارکردن دەڕۆن، بە بێ هیچ گومانێک بەرەو ئامانجێکی بەرهەمهێنیانی چاک ناچێ. لە ڕاستیدا هونەری بەڕێوەبردنی ژیان و بە دەستهێنانی جۆرە هەبوون و ئاسوودەییەک، هەرگیز لە ڕێی ڕتووشی قسە و هێڵکاری هونەری تەشکیلی و جوانکاری شانۆ و سینەماوە ناکرێ، بەڵکو نەبووە ئابووری و بازاڕ بە فەلسەفە ملیان بابدرێت و بەرەو ئەو خەیاڵە جوانکاریە ببرێن کە هاوتەریبی ئاواتە بەرزەکان بێ لە تێرکردنی برسی و داپۆشینی ڕووت و گردکردنەوەی کەرامەتی خەڵکی و تەنانەت جیاوازییەکی گەورە لە نێوان دروشمی بەرزکراوەی شۆڕشەکان و بەڵێنە بەدیهاتووەکان (یا بەدینەهاتووەکان)دا دەبینی لەگەڵ واقعی ئەو هەوڵەی بەبێ پەلامردان و هیتاف و خۆپیشاندان بەدی هاتووە، هەموو شۆڕشەکان بە بێ جیاوازی، بە گوێرەی پەیام و بەڵێنە تێروتەسەلە شیرینەکانیان شکستیان هێناوە ئەگەرچی لە کاتی پەلاماردانی دەسەڵاتدا دڵنیایە دوای سەرکەوتن بە ئاسانی ئەو بەڵێنانە دێنە دی. ئامانج لای خاوەن تیۆری ڕێی نییە جێبەجێ نەکرێ. بۆ شیکردنەوەی ئەوەش زۆر بە کورتی دەڵێم دوو هۆی زۆر گرنگ وا دەکەن شۆڕشگێڕ بەڵێنەکانی خۆی نەگەیەنێتە جێ، یەکەمیان ئەوەیە لە هەموو سەرزەمیندا شۆڕشگێڕ کەلیشەی زاراوەی شیرین و نەرم کاوێژ دەکاتەوە و وا دەزانێ کەلیشە و واقیع یەک شتن و بە تەواوەتی لە دابینکردنی خۆراک و پۆشاک و کونجی حەوانەوە بێ ئاگایە… لە هاوکێشەیەکی هەرە ئاساندا، ئارەزوو جێی ئیمکانیەتی بۆ پڕ دەکاتەوە. خەڵکی حەز لە تێروتەسەلی دەکەن و شۆڕشگێڕان دەست بە سەر سەرچاوەی تێروتەسەلیدا دەگرن و شۆڕش دەبێتە پارێزەری دەستکەوتەکان. هۆکاری دووەم ئەوەیە بیناسازی خۆی لە خۆیدا زۆر زەحمەتە و ئەگەر وا دانێین شۆڕشگێڕ ئەو

نەزانە نییە کە لە هۆکاری یەکەمدا باسمان کرد و ئەگەر وا دابنێین بە سەر چەند پرۆژەیەکدا دابەش دەبێ نەک هەموو پرۆژەکانی نیشتمان، دەستی لەوە کورتترە و لەوە بێ دەسەلاتترە یەک پرۆژە جێبەجێ بکا و نەگونجان و بەخیلی و فێڵ بۆ وەرگرتنی دەسەلات و تێکشاندنی نەیاران و ئارەزوومەندانی سەرۆکایەتی لێ دەگەڕێین. ساکاری جەماوەریشی بخەرە سەر کە لە مەیدان و شەقامەکاندا دروشمی ناڕوون و ئاڵۆز و مەحاڵ بەرز دەکەنەوە بەڵام دروشمەکان مادام داوای قارەمانێتی و تێکشکاندن و ڕووخاندنی زاڵم دەکەن، لە بەر گوێ و تام شیرینن.. ئەوجا دوای بەسەرچوونی کلێشەکان و جوینەوەی وشەکان، خۆشی و شادی شەوان گم دەبن و لایەنێکی خۆشگوزەرانی گرنگ کە لە پێش شۆڕشدا هەبوو، نامێنێ و بە دوعا و نزای شۆڕشگێڕانەش ناگەڕێتەوە و گەنم و ڕۆن و شەکر و قوماشی فوستان و هەنگوین بەرهەمی ڕەنجدان و ماندووبوونن و ناو و ناوەڕۆکیان هەیە و ناگەنە ئەو قوڕگانەی شەو و ڕۆژهاوار دەکەن: مردن و وێرانی و سەرشۆڕی بۆ تێرخۆرە خائینەکان و ژیانی سەروەری بۆ هەژاری نەدار (بە عەنتەرییان هەژارتر بوون و هازارانیان بوونە ئاردی دەستاڕی شۆڕش و شەڕی چینایەتی...) و بە جۆرە زیرەکییەک واقیعە نالەبارەکە بۆ عەنتەرە شۆڕشگێڕەکان ڕوون دەبێتەوە و پیاو هەق بڵێ بۆ قووتدانی ماڵی کۆمەڵکراوی تێرخۆرەکان دەکەونە خۆ و چاویان تا ئەو جێیە بڕ ناکا کە ئەوەی ئەو بۆرژوا مەلعوونانە کۆیان کردۆتەوە کۆتایی دێ (بۆرژوا نامەلعوونەکان کە خۆیان بە دۆستی جوتیاران و کرێکاران دەزانن ڕیزپەڕن). کورتەی قسە:

1. هەموو شۆڕشەکان، بە بێ جیاوازی، سڕینەوەی ئەو واقیعە لەهەناویاندایە کە بە شێوەیەکی سروشتی هاتووە و دەیانەوێ تۆوێک لە جێیدا شین بکەن کە لە بەهەشتەوە هێناویانە.. ئەوەش خۆی لە خۆیدا مەحاڵی کۆمەڵایەتییە.

2ـ شۆڕشگێڕەکان بە شێوەیەکی گشتی توندڕەون و بەرەو توندترین و ڕیشاڵیترین بۆچوون ڕادەکێشرێن و سەرنەکەوتن و شکست دوو خەمن لەو خەمانەی کە پشتیان دەشکێنن.

3. دروشمی (کرێکارانی جیهان یەک بگرن) یەکێ بوو لە هەنگاوە سیاسییە هەرە دوورەکان لە عەقڵەوە کە خۆشباوەڕییەکی تێدابوو کە لە واقیعدا نییە. ئەگەر ئەو دروشمە بەرتەسکیش بکرێتەوە بۆ (کرێکارانی ئەوروپا و ئەمەریکا یەکگرن) دیسان ئەوەندە ناواقعییە بەشی سەرنەکەوتنی بکا. یەکگرتنی کرێکارانی گەلە جیاوازەکان کە هەندێکیان ڕقیان لەهەندێکیانە و دەیانچەوسێننەوە و بە مرۆڤێکیشیان نازانن شایستەی ئازادی بێ، چەند سەیرە و ئەگەر موعجیزەش بقەومێ (کە ناقەومێ) کرێکاران بوونە برا، نازانن چۆن لەسنوورە دەوڵەتییەکان

بپەڕنـەوە و بـە چ زمانێـک یـەکتر بـدوێن و هەڵوێـستی ئـەو حکوومەتانـەی کـە هـەن بەرانبـەر داواکاری حکوومەتی کرێکارانە،کە بە تەواوەتی ڕۆژنامەیان پێ ناخوێندرێتەوە چ دەبێ (ئـەوە ساڵی 1848 بوو) و لە داڕشتنی یاسا بە تەواوەتی بێئاگا بوون و زۆربەیان نەخوێندەوار بوون. ئیدی چۆن دەبنـە وەزیـر و مامۆسـتای زانکـۆ و شارەزای فەلـەک و ئەنـدازیاری بەربەسـتی ئـاو و ڕێگاوبـان و خـەبیری بێتـەل و سـەرۆکئەرکانی سـوپا؟ لـە پاشەڕۆژیشـدا دەبنـە زانـای ئـەتۆم و گەشـتیاری ئاسمانەکان! ئەرێ بۆچوونەکانیان وێران نین؟ بە داخەوە بۆ بەفیڕۆدانی هەوڵەکانیان! دەبێ عاقڵانە دانی پێدا بنـرێ کـە دابەشـکردنێکی نادادپەروەرانـەی ڕزق هەیـە و پێویسـتە بـە ژێـری چارەسـەر بکرێ.. دەبێ دان بەوەشدا بنرێ کە خـەڵک مـافی هـەڵبژاردنی یاسایی و سروشـتی و کۆمەڵایـەتی ئەو ڕێیە بێ فێڵ و گزییەیان هەیە کەپێیان وایە سەروەت و سامانیان پێ زیـاد دەکا. لـە ڕاسـتیدا، ئـەو پێشـکەوتنەی کـە لـە واقیعـدا هەیـە و لەناوەڕۆکیـدا و بـۆ بەرژەوەنـدی دەسـتەیەک زەرەر بـە ڕەشەخەڵکەکە ناگەیەنێ، لە زۆر وڵاتی پێشکەوتوودا بە ناچاری (باج)ی داهاتیـان لـە سـەر خـەڵک دووقـات زیـاد کـردووە تـا وای لـێ هـاتووە زۆر لـە مووچـەخۆرانی بانـک و حیسـاباتی کۆمپانیاکـان دەست لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی هەڵگرن و ببنە بەڕێوەبەر تا لە چنگی باج ڕزگار بـن کـە بـە پێـی داهاتی تایبەتی بەڕێوەبەری گشتی زیاد بووە… هەروەها لە ڕاستیدا مسۆگەرکردنی ژیانی کرێکار و خاوەن داهاتی نزم لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کە ئازادی ڕەخنە و خۆپیشاندان و دەربڕینی ناڕەزایی هەیە، بە یاسای توندوتیژ پارێزراوە و کرێکاری ئەو وڵاتانەی کـە کۆمـۆنیزم بـەڕێوەیان دەبـا، مـافی نییـە داوای شـتێک بکـا یـا لـە شـتێک تـووڕە بـێ یـا نـاڕەزایی لـە شـتێک دەربـڕێ، چونکـە وەک کەرپووچێکی دیوارێک، بە بەشێکی کیانی دەوڵەت دانراوە، بەڵگە بـۆ ئـەوەش بەسـە کـە قسـەیەکم لـە ڕۆژنامەیـەکی ڕووسـی سـەردەمی گلاسـنوس خوێنـدەوە کـە هـی گـەورەترین سـەری سسـتەمی یاسایی سۆڤیەتی بوو: دادگا لە وڵاتـی ئێمـەدا نییـە چونکـە حیزبـی شیوعی هـەموو شتێکە و قازی فەرمانی لە جێیەکەوە بۆ دێ کە وەزارەتی داد نییە.. ئەوە یەکێکە لەو وردە سووکایەتییانەی کە بە مرۆڤ ومافەکانی و مرۆڤایەتییەکەی دەکرێ، ئـەوەش بەسـە کـاتێ سـەرەکوەزیرانی سـوید بـەر لـە چەند ساڵێک کوژرا، کوردێک دەستگیر کرا چونکە لە ئاخاوتنێکی تەلەفۆنیدا وای پیشان دابوو کـە ئەو کوشتوویەتی.. دوای چەنـد مانگێـک ئـازاد کـرا و دڵـێ هـەرگیز ژیـانی تێروتەسـەلی وەک ئـەو ژیانەی بەندیخانەی بەخۆیەوە نەدیوە. لە کۆشکێکدا ژیاوە و لەگەڵ بەرپرسانی بەندیخانـەدا چۆتـە سینەما و هەر ڕۆژێ ویستبێتی چۆتە خلیسکانەی سەر بەفر.. کاتێ ئازادیشیان کرد، سەدان هەزار دۆلاریان بۆ پڕکردنەوەی زەرەر پێ دا. کاتێ ئەوەم خوێندەوە گوتم: ئەو شێتانە! بـۆچی یـەک دوو ساڵێک بەندم ناکەن تـا دوایـی بـەو پارەیـەی لـە بـری بەنـدکردنم دەمـدەنێ لـە بەغـدا خانوویـەک بکرم. کوردێک حەوت ساڵ لە ڕووسیا ژیا، لەو قەتارە بە هەڵەدا چوو کە دەبوو سواری بێ، چووە

ناو سنووری سویدەوە. شەوێک لە بەندیخانە هێشتیانەوە. ئەو شەوە خۆشترین شەوی هەموو ژیانی بوو، بەو حەوت ساڵەی سۆڤیەتیشەوە بە پێی قسەی خۆی کە باوەڕ پاڵپشتی دەکا..

دەزانین و هەر دەشبێ بزانین کە خەڵک کۆمەڵە بلیمەتێک یا مەلایەکەت نین تا ڕەفتاریان لە ژیانی ڕۆژانە و لە دەمی لێقەومان و نەبوونیی (کەمیی بەرهەم)دا لە وردیی هەڵەنەکردندا وەک کۆمپیوتەر بن و ڕێمان نییە بە هۆی هەڵەگەلێکەوە لۆمەیان بکەین کە چار نییە و دەکرێ یا هەڵەکردن لەکارێکی ئاڵۆزدا یا خۆلادانێکی پەراوێز لە ڕاستگۆیی بەرەو دروستکردنێ کە زەرەری نەبێ یا حەزی خۆدەرخستن یا پێشکەوتن کە لە سروشتیدا چێندراون. بە کورتییەکەی ئەمە دەڵێم: کە لە هەڵە و زەللە و نووچدانی خۆمان دەبوورین، دەبێ لە خەڵکی تریش ببوورین و ئەگەر کەسێکم دیت یا تۆ دیتت لەکونی کلیلەوە دەڕوانێتە کچێکی جوان سەرزەنشتی مەکە و منیش نایکەم، ئەگەر وەک ئەوت کردبێ و وەک ئەوم کردبێ. شاعیرێکی عارەب دەڵێ:

نەهی لە کارێک مەکە کە خۆت ئەنجامی دەدەی
ئەوە بکەی، ئابڕووچوونیکی گەورەیە

پێویستە بزانین پەیوەستبوون بە خەسڵەتی بەرزەوە کە بەربەستە لە بەردەم ئارەزووی نەفسدا، لە زەحمەتە هەرە زەحمەتەکانە، ئەگەر مرۆ بتوانێ بە بێ سزا ئەو ئارەزووە بە دەست بینێ.. هەموو ئەوانە و شتی تری تۆمارکراوی ڕێنمایی و قسەی نەستەقی زانایان و فەلسەفەی فەیلەسووفان و خۆپارێزی پیاوچاکان لە ناوەڕۆکی ژیاندا، ئەگەر دڵ درکیان پێ بکا بێ گومان سوودیان هەیە و ئەگەر پشتگوێش بخرێن بە هەدەر دەچن... حیکمەتێک کە بە هۆی بێئاگایی یا نەفامی یا شتی (ماددی یا مەعنەوی) لەو بابەتانە بە فیڕۆ دەڕوا، لەگەڵ دەسەڵاتدارێکدا کە بە بیانووی پارێزگاریکردن لە ئەدەب و بەرژەوەندی خۆی، بۆچوونی خۆی دەسەپێنێ، جیاوازییەکی وای هەیە دەستی لێ بەرنادرێ و لە بیر ناکرێ و پشتگوێش ناخرێ. بەربەست نییە ڕەچاو بکرێ ئەگەر یاسایەک دیاری نەکا کە کۆمەڵگا قەبووڵی بووبێ یا لە پیرۆزیدا لە ئاستی ئایندا نەبێ، بۆ نموونە نابێ کەسێک بە ڕووتی بە بازاڕەکاندا بسووڕێتەوە یا مێزی خواردنەوە لە شەقامی شارێکی موسوڵماندا ڕێک بخا.. من کە بۆ بەرینکردنی گۆشەنیگا بەرانبەر شتی جیاواز بە هەوەسی خۆم باسی ئەو وردەکاریانە دەکەم، بە تەواوەتی درک بەوەش دەکەم گەورەترین کارەسات کە تووشی کۆمەڵگا دەبێ ئەوەیە زۆرداران بە هەوەسی خۆیان هەڵیسوڕێنن و هەوەسیش سنووری نییە و چەوسانەوە و دەمداخستن و لەناوبردن و دەستبەسەرداگرتنی خەڵک، بە پێی هەوەسی خۆیان زیاد دەکەن. ڕەنگە خوێندبێتمانەوە شەوی زاوایەتی لە سەردەمە کۆنەکاندا بەشی سەردکردەی

خەڵکەکە بووە و بە لامەوە دوور نییە لەم سەردەمەی ئێمەشدا شتی وەها لە بن پەردەوە یا بە بێ پەردە هەبێ بە تایبەتی لە کاتی شەڕی وەحشیگەرانەی دواکەوتووان و سەرکەوتنی لایەک بە سەر لایەکی تردا، چونکە ژنی دیلی جەنگ دەبنە موڵکی ئەوەی بە دەستیان دێنێ و پیاوە دۆڕاوەکانیش وەک کەلوپەل و ئاژەڵ دەبنە موڵکی سەرکەوتوو...

سەرجەمی ئەو وێنە شێواوانەی شێتخانەکە و وێنەی تری وەک ئەوانە و لەوانەش بەدتر لە تێگەیشتنەوە نێزیکن ئەگەر عەقڵ دووچاری کەمایەتی یا تێکچوون نەبووبێ. ئەوانە هی ئەوەن جۆرە دڵدانەوەیەک هەڵگرن چونکە کۆمەڵگەش تێکەڵێکە لە هەزار ڕەگەز و هەزار دین و هەزار ئاوات و هەزار تێگەیشتن و هەزار ڕەوشت و هەزار زمان و هەزار نەریت و بەها، کە هەندێکیان ئەوەندە لە یەکتر دەکەونەوە نێوانیان ناپێورێ و هی ئەوەن جۆرەها بارودۆخ و بەها و پیرۆزی و نەفرەت و پلەی تێگەیشتنی وا بخەنەوە کە بیر بۆیان نەچێ و بگاتە ئەوەی تیایدا هەبێ شێلم تێکەڵی خەڵووزی بەرد بکا و بیخوا یا لووتی بووکێ بۆ جوانکردنی ببڕێ یا حوشتر لە کلکەوە سەربڕێ یا دەست لە بەر باران پان بکاتەوە تا مەلایەکەت لەگەڵ دڵۆپە باراندا بکەوێتە ناو لەپیەوە.. خۆ ئەگەر ئەو نموونانە لە ڕووی ئیمکانەوە خەیاڵکرد بن هەڵگیرسانی فیتنەی نێوان هندۆس و موسوڵمان بە هۆی سەربڕینی مانگاوە لە هەموو جەژنێکی قورباندا کارەساتی خوێناوییە و ڕاستییەکە هەموو ساڵێک دەقەومێ.. جیاوازی مەزەب لەنێوان ئێرلەندای باکوور و ئێرلرندای باشوور کارەساتێکە هەتا ئەمڕۆمان کاریگەری خۆی هەیە لەگەڵ جیاوازی لە پلەی شارستانەتی نێوان ئێرلەندا و هتد... شانازی عارەبایەتی بە جەنگی بەردەوە کە لە فەلەستینی داگیرکراو دەکرێ بە پێی پێوانەی لۆژیک ئایەتێکی ئاوەژووە چونکە مەحاڵە لە هیچ وڵاتێکی عارەبیدا شتی ئاوها بە بێ خوێنڕشتن و وێرانکاری ئەنجام بدرێ ئەگەرچی هۆکاری شەڕی بەرد بۆ منداڵی عارەب لە شارە عارەبییەکاندا زۆرە.. ئەو نموونانە و نموونەی تری وەک ئەوانە (لەوانە شەڕی نێوان حیزبە کوردییەکان لە کوردستانی عیراقدا) و هی تری وەک ئەوانە کە نقومی تورەهات و ساکاری و عەقڵ لە دەستچوونن زۆر جار ڕوو دەدەن و هۆکاری ڕوودانیشیان لە کۆمەڵگەی دواکەوتوودا کە ئێستاش بۆ مانگگیران تەپڵ لێ دەدەن و (نەهەنگ مانگمان بدەوە) دەڵێن، لە زیاد زیاترن. بۆ بەرپابوونی ئاژاوە ئەوەندە بەسە دەستەیەکی گرژ چالاک بکەیت و ئاڵای خۆیان بەرز بکەنەوە و شیر و تیر هەڵکێشن و پەنا بەخوا ناهەقی تێکبشکێنن. ڕەنگە بیانوو لای ئەوانە ببینین کە باوەڕیان بە هێزی ناسروشتی هەیە و تەماحی زیاد لە لای بەتوانا ببینین و کەم هەستی لە لای زەلیلکراو لە ڕۆژی لەدایکبوونیەوە ببینین ئەوجا بەرز بینەوە و بڵێین ڕەنگە یەکێ لە لایەنەکانی جەنگێکی توندوتیژ مافی خۆی بێ بەرگری لە خۆی بکا و ڕەشەخەڵکەکەش بە هەمان شێوە، بەڵام... بەڵێ، سەد جاران بەڵام، بەڵکو هەزار جاران بەڵام سارتەر لە شانازیکردن بە فرۆشتنی ڕۆژنامەی

پیاوکوژە چینییەکان لێبوردە نییە بەڵام لە ڕووی چییەوە؟ بە هەقی شەرەفی مرۆڤایەتی نازانم لە کوێوە ئەو هەنگاوە تاوانکارییە ناهەموارەی نا! گەورەترین شەرەف کە بەدەستی هێنا ئەوە بوو بەرەو قەشمەریجاڕیی چوو چونکە دابەزینی نرخی لایەنێکی گرنگی بەرزییەکەی لابرد کە پێی بە هەڵەدا چوو و لەوەش کەمتر بوو وەک ساختەکار و تەنافبازی لێ بێ چونکە دیمەنەکەی دڵخۆشکەر نەبوو!!

ئەگەر هەموو توێژەکانی کۆمەڵگە بۆ دابینکردنی ئاسایش و ئاسوودەیی و گۆڕان بەرەو بەرزایی ڕێگای ئاسایی تاقیکراوە بگرنە بەر، لایەنەکان بە پێی بەرژەوەندی گشتی بەرەو پێش دەچن بەڵام وەبیری بێنەوە ئەوەی چەند سەدەیەک لەمەپێش پێی دەگوترا (ڕێگای ئاوریشم)ی نێوان ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ڕۆژاوای ئەوروپا. بە دڵنیاییەوە خەڵک هەبوون نەفرەتیان لە و ڕێییە و چەوساندنەوە دەکرد چونکە ئەوانەی ئاڵوێری بازرگانییان دەکرد دووی قازانج کەوتبوون، کەوابێ تاوانکار و خوێنمژ بوون و ئەو نەغمەیە هەتا ئێستا ماوە و دەمێنێ. بەڵام حەقیقەت ئەوەیە ئەگەر ئەوە نەبوایە کە پێی دەگوترێ گەڕان بە دووی قازانجدا یا بنیاتنانی بەرژەوەندی - وەک دروستیکردنی خانوو، ڕەنجدەریش نەیدەتوانی لوقمەی خێزانەکەی دابین بکا و دروستبوونی شار نەدەبوو و شارستانەتی پێشنەدەکەوت و مرۆڤی پێش مێژوو هەر لە ئەشکەوتدا دەمایەوە یا لە ناوچە گەرمەکاندا لە سەر دار دەنوست و ئەوەش لە عورفی ئەوانەدا کە ڕقیان لەدادۆشین دەبێ مرۆڤی شەریف و پاکن و بیر لە داهێنانی تیغێک ناکەنەوە نینۆکی خۆیانی پێ بکەن.

ئەو توێژاڵانەی کە بە دەم باسکردنەوە ناویان هات ئەو حیزب و کۆمەڵە و شتانەی تری کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرن کە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو پێکهێندراون. لەم بوارەدا ڕێ بە خۆم دەدەم لە بارەی حیزبی کۆمەڵگە دواکەوتووەکانەوە بڵێم لە بۆشاییەوە و لە سەر بنەمای لاساییکردنەوەی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان دروست بوونە چونکە، بۆ نموونە لە عیراقدا، هیچ حتزبێک زەروورەت دروستی نەکردووە. هەر ئەوە بەسە بیهێنیتە بەر چاوی خۆت هیتلەر چۆن بووە پەرستراوی جەماوەر! ئەو خەڵکەی کە نەیاندەزانی ناوی خۆیان بنووسن لە بەر سێ هۆ شەیدای نازییەکان بوون، یەکەمیان ئەوە بوو ئاگایان لە بەرژەوەندی و لەناوچوون نەبوو لە هەرای دووەم جەنگی جیهانیدا. دوای ئەوە سەرسامبوونی خوێندەواران و نیمچەخوێندەواران بوو، چونکە ڕۆشنبیری بە شێوەیەکی مەیلەو گشتی بە کەسایەتی هیتلەر و سەرکەوتنی سوپاکەیەوە بەند بوو. دوای ئەوە ڕۆڵی ئەو قینە دێ کە لە ئینگلیز هەبوو ئەگەرچی دەسەڵاتی ئەوان بە گوێرەی دەوڵەتە ئیستعمارییەکانی تر توندوتیژی کەمتریش بوو و بۆ بەڵگەش ئەوە بەسە کە شاژنی بەریتانیا لە دوای سەربەخۆیی هنددا سەردانی کرد و بە گەرمی و خۆشەویستییەکی وەهای

ڕاستەقینەوە پێشوازی لێ کردا، کە سەرکردەکانی کرملن لە سەردانی دوای ئەودا بۆ هند نە ئەوەندەیان بۆ کرا، نە بەشێکی ئەوە. کاتێکیش ئەڵمانیا هەرەسی هێنا و ڕووسیای سۆڤیەتی هاتە مەیدانەوە، سەرجەمی لایەنگرانی نازییەکان بەرەو لای کۆمۆنستەکان باياندايەوە و وەچەی تازەش کە گوێیان لە دروشمی ئومەمیەتی شیرین بوو، بە دوایاندا چوون. سەیرترین دیاردەی سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیست ئەوە بوو جەماعەتێک لە کۆیە ـ شوێنی لەدایکبوونم ـ پەیدا بوون ناوی بەلشەڤیکیان لە خۆیان نا. من ئەو دەمە منداڵێکی چوار ساڵان بووم و هەستم بە بوونیان نەدەکرد، دوایی وەک دەڵێن، وەک بەفرەکەی پار توانەوە. کۆمۆنیزم لە دوای دووەم جەنگی جیهانی پەرەی سەند و چۆن پێشتر نازییەت گۆڕەپانەکەی داگیر کردبوو، ئەوانیش ئاوها داگیریان کرد و واقعی کۆمەلایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری و تەنانەت سیاسیش چ دەخلیان بە سەرەوە نەبوو چونکە جیهانەکەمان ئەوسا و ئێستاش سیمای دواکەوتنی پێوەیە و لە ڕووی شارستانییەوە خاوە و مەرجەکانی ئابوری بۆرژوازی تێدا نین کە لە هونەر و ڕۆشنبیری و پیشەسازیی دەکەونەوە. نەتەوەی کورد تا چەند دە ساڵێک پێش ئێستا سەرافێکی نەبوو و لە هەموو مێژوودا یەک بانکی نەبوو و لە هەموو کوردستانی عیراقدا دوو سێ خانوو هەبوون کە دەکرا بە نەختێ لێبوردنەوە ناوی ڤێللایان لێ بنێی.

قسەیەکی خەتەرناک لە سەر هەموو ئەو بزووتنەوە و شۆڕشانە دەکەم کە لە دوای ڕۆیشتنی تورک و هاتنی ئینگلیزەوە لە عیراقدا ڕوویان داوە: هەموو ئەو ڕۆحانەی لە دەست چوون و هەموو ئەو ماڵانەی تاڵان کران و ئەو بینایانەی ڕووخێندران و ئەو ئارامییەی بووە گەرداو و ئەو ئاسایشەی بووە ئاگر و پروشک و پشکۆ، بە فیڕۆ چوون و هەڵگەڕانەوە و بوونە غەزەب. "هەر کاتێ نەتەوەیەک هاتبێ نەفرەتی لە نەتەوەی دەستەخوشکی خۆی کردووە"و ئەو گرژی و ئاڵۆزی و ڕاپەڕینانەی شەقام و کۆڵانان، تیایاندا نەبوو نوسخەی دەسەڵاتێکی ئیفلیجیش بێ و شەقامەکان پاک بکاتەوە و حەوشەکان بسڕێ، چونکە هەڵچوونی توند و نەزانانە توانایەکی عەقڵانەی وای نەبوو بەرنامەیەک، هەر بەرنامەیەکی لێ بکەوێتەوە مەڕ و بزن لە بەر ڕۆشناییەکەی بچنە لەوەڕگا. واز لە دەرهێنانی نەوت و ڕاکێشانی سکەی ئاسن و دروستکردنی فڕۆکەخانە و کردنەوەی زانکۆ دێنم چونکە ئەوانە خەمی خەڵکی ترن کە لایەنی بەرانبەر گرژیی و ئاڵۆزین و بە عادەت، لەبەر ئەوەی هیتاف لێنادەن و خۆپیشاندان ناکە، بەڵکو خەریکی بیناسازین، بە خائین و خۆفرۆش ناویان دەبرێ. ئێوەش و ئێمەش بینیمان ئایەتوڵلا خومەینی چی کرد و ئەوانەی چنگیان لە چارەنووس گیر کردووە چییان کرد. سەیری گاڵتەجاڕی ڕێکەوت بکە کە هند و پاکستان بە داردەستی سەر بە ئەتۆم گەمە لەگەڵ یەکتردا دەکەن و خەڵکیش لە برساندا و بە ڕووتوقووتی و نەخۆشی لە هەردوو وڵاتەکەدا دەمردن، خوا بۆ ئەوە هیدایەتیان بدا لە ئینگلیز بپاڕێنەوە بۆ

دەسەڵاتی پێشوو لە هندی کۆن بە (بەنگلادیش)یشەوە بگەڕێنەوە و خوا باوەڕداران لە کارەساتی ناکۆکی بپارێزێ: چەند ساڵێکە دەڵێم ئەگەر بتوانم دەوڵەتێکی کوردی دامەزرێنم تەندەرێکی بەڕێوەبردنی ڕادەگەیەنم تا یەکێ لە کۆمپانیاکانی سکەندەناڤیا بەڕێوەی ببا، چونکە ئەوان بە سێیەکی نرخیش بە باشترین شێوە حکوومەت بەڕێوە دەبەن... لە ڕووی ڕازیبوونیشەوە بە واقیع، گوتوومە ئەگەر بتوانم حکوومەت دامەزرێنم لە سەر عەموود دایدەمەزرێنم تا لە گێرەشێوێنەکانی سەر زەوییەوە دوور بێ. خوا کار و مەبەستی بە خەڵکی خۆی هەیە.

بەڵێ و هەزار بەڵێ، عیراق تلّپاتەی تەڕی لە شۆڕشەکانی و ڕێپێوانەکانی و هیتافەکانی و خۆپیشاندانەکانی لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیەوە دوای ڕۆیشتنی تورک هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ دەست نەکەوت و لە ئاسۆی نێزیکیشدا چ نیشانەی دەربازبوون دیار نییە. دەزانم و تۆش دەزانی ئەم قسانەم لە لای ئەوانەی کە مێژوو بە گوێرەی ئەندازیاری دەپێون و بەرز و نەوی دەکەنەوە لە سەر تا بۆر ڕەت دەکرێتەوە، چۆن دەگوترێ ڕاپەڕینی (1948) بزووتنەوەیەکی شێتانەی حیساب بۆنەکراو بوو و خوێندکارانێک پێی هەستان هیچیان لە سیاسەت و کۆمەڵایەتی و چاکە و خراپە نەدەزانی و بەشێکی گرنگی پاڵنەریان بۆ خۆپیشاندان ڕێکەوتنی پۆرتسموت بوو جگە لەو ڕقەی کە لە ئینگلیز هەیانبوو، دابڕانیش بوو لە یاساکانی خوێندن و توندووتیژی مامۆستایان[3] و خۆپیشاندان پەرەی سەند و خەریک بوو بگاتە ئەوەی شەقامی ڕەشید بە هۆی نەبوونی کڕین و فرۆشتنەوە ئیفلاس بکا. ڕەنگە بشگوترێ ڕاپەڕینەکە ئامادەکارییەک بووە بۆ شۆڕشی 14ی تەممووزی 1958!!

بەڵای هەرە گەورە لەوەدایە، کە ئەو ئەفسەرانەی لە ژیاندا ماونەتەوە پەشیمانن و تەنانەت دانی پێدا دەنێن کە بەو کارەیان زیانیان بەعیراق گەیاندووە.

ئەو ئاماژەیە کە ڕۆشنبیران وا دادەنێن کە مێژوو سەرکەوتنێکی بەردەوامە، پێویستی بە ڕوونکردنەوەی باوەڕپێکراو هەیە تا ڕووپۆشی ڕوخساری هەڵماڵدرێ، لە سەرەتاوە دەڵێم کۆمەڵایەتی و مێژوو یەک شتن و پێم وا نییە بە بیرتدا بێ ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدا دەژییت و تەماشای دەکەیت، سەرکەوتنێکی ئەندازەیی بەردەوامی هەبێ، چونکە چەندین مانگ بە سەر دەبەی بێ ئەوەی هەست بەگۆڕانێکی درک پێکراو بکەیت لە کاتێکدا کۆمەڵگا مێژووی ئێستایە و هەیە و نەبۆتە ڕابردوو و تەنانەت ئەو ڕابردووەش کە بە سەرت بردووە بە مێژوویەکی وەک مێژووی ڕۆم و فارس و هەکسوس و سۆمەرییەکان، کە لە پێشنەکەوتن بار کراون، حسێب ناکەیت، چونکە لە عادەتی گشتیدا مەرجی کۆنیی یەکێکە لەمەرجەکانی ئەوەی پێی دەگوترێ مێژوو. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ڕەشەخەڵکەکە یا زۆرینەیان دروستکەری ئەو مێژووە

نین کە بە ڕێژەی ئەندازەیی سەردەکەوێ بەڵکو قارەمانگەلێک کە دنیایان گێژ کردووە و چەندین شاریان وێران کردووە و بە ملیۆنەها خەڵکیان کوشتووە، پشکیان لە مێژوودا نەفرەت و سووکایەتی و تفکردنە چارە نەبێ هیچی تر نییە، ئەو مەلعوونانەی وەک جەنگیزخان کە مێژوویان خەساند و گەڕاندیانە دواوە و بینایان وێران کرد و باخچەیان کردە تەراویلکە و پووشکەی دەم با. ئەوانەی هەناسەی سەرکەوتنی بەردەوام لە هەیکەلی مێژووی ڕابردوو و ئێستا و داهاتوودا دەدەن کەمێکی هەرە هەرە کەم و دەگمەنی داهێنەر و کەشفکەرن کە پێشتر بە 10000/1 ی سەرجەمی ژمارەی مرۆڤ مەزەندەم کردن و ئەو ژمارەیەش لەخۆوەیە و وەنەبێ پشتی بە سەرژمێر بەستبێ، بەڵام لە ڕاستییەوە نێزیکە. تەنانەت لە ماوەی حەفتا ساڵی ڕابردوودا یەک پیشەوەری دەوروبەری خۆمم نەدیت پەرەی بە هیچ ئامێرێک دابێ و داهێنەران هەژارتر بوون، ئەگەر ئەو نەوانەی پێش خۆمان بخەینە سەر حیساب کە بە بێ داهێنان ماونەتەوە، ڕێژەکە دەبێتە 100000/1 و تەنانەت هیچم لە بارەی داهێنەرانی پیشەسازییەوە نەبیست ئەوە نەبێ کە باوکم باسی مەستی ئەفەندی[4] کرد کە ئامێرێکی داهێناوە بە تەلی تەلەفۆنەوەی بەستووە و قسەی لەگەڵ کەسانێکدا کردووە کە خۆی ویستوویەتی. پرۆژەیەکی تەمابەخشی لەوەدا هەبووە کە لە ڕێی تیشکۆوە کە بە دەوری گۆی زەویدا دایاندەنێ، تیشکی خۆر لە هەر 24 کاتژمێرەکەدا دابین دەکا. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی ئاوڕیان لە پرۆژەکەی نەدابۆوە.. داهێنان لە لێهاتوویی قسە و داڕشتن و توانای شیعریدا سنووردار بوو، (نالی و سالم..) پێش دوو سەد ساڵ و پێش ئەوانیش مەلای جەزیری و ئەحمەدی خانی بەر لەچەند سەدەیەک و بابا هەمەدانی پێش ئەوان و کوردێکی سەردەمی عەبباسییەکان، وەک لەبیرم مابێ ناوی شەیتانی عیراقیان لێ نابوو و شیعریمان بەر دەست نەکەوتووە. بەڵام خوێندنی دینی و ئەو زانستە یۆنانیانەی خوێندووە کە بە شێوەیەک لە قاڵب درابوون دژی قورئان نەوەستنەوە، زانا ئاینیە کوردەکان تیایاندا لێهاتوو بوون و لە خەڵکی تر لەپێشتر بوون. یەکێ لە چاکەکانی ئەو خوێندنە ئەوە بوو هەزاران خوێندکاری دینی ماوەی سەدان ساڵ بەمسەر و ئەوسەری کوردستاندا بە دوای زانایەکی لێهاتوودا گەڕاون کە لەو بابەتە شارەزا بووبێ گەرەکیان بووە و بە ڕاستی ئەوانە مەزنترین ستوونی مەعنەوی بوون کە نەتەوایەتی لە سەر دەوەستێ و وەک بڵاوکراوەی هەواڵی بەشەری بوون دەنگوباسی شوێنە جیاوازەکانی کوردیان بە هەر چوار لادا بڵاو دەکردەوە.. (ئەمانە لە نووسینی تری چەند ساڵێک لەمەپێشمدا بڵاو کراونەتەوە).

دەشێ بەو پێچانەدا هەتا جێیەکی بێکۆتایی و نادیار شۆڕ ببینەوە و ئەو نەلوانەی لەنێوان عیلمانیەت و باوەڕی غەیبیدا هەیە بەشی ئەوە دەکا لێی قووڵ ببینەوە و بە بەرینیدا بچین و چەندین بەرگ بە بەڵگە و دژوەستان پڕ بکەینەوە، چونکە ئەگەر زمانت بۆ قسەکردن لە بارەی ئەزەلییەت و دروستبوونی کەونەوە سووڕاند و پشتت بە لۆژیکی تیۆری و بەڵگەی دوو سەرە

بەست دەشێ زۆربەی تەمەنت لەو بوارەدا بە سەر بەریت و نەشگەیتە ئەنجام یا باوەڕپێکردن ئەگەر بەرگری لە یەکێ لەو دوو ئاڕاستەیە نەکەیت. ئەگەر بەراورد لە نێوان فەلسەفە جیاوازەکانیشدا بکەیت، زۆربەی تەمەنت بۆ ئەوە سەرف دەکەیت لە مەسەلەی دروستبوونی ژیاندا بە یەقین بگەیت. ئەبو عەلای مەعەری یەکەم کەس بوو بە دەست ئەو بابەتەوە گیری خوارد و گوتی:

ئەوەی دەشت و دەر لێی سەرسامە
زندوو لە ماددەی مردوو داهێندراوە

کورتەی قسان، کۆتاییهاتن بە بەڵگەهێنانەوە و گەیشتن بە یەقینێکی سەلمێندراوی مەسەلە جیاوازەکان کە وەک مەتر و رەتڵ و قووڵێ پێوانەیان نییە مەسەلەگەلێکن لە دەرەوەی هیواکانن و ئەوەی بەو ڕێیە بزرانەدا بڕوا دووچاری ئەنجامی ناهەمواری ململانێی بێ ئاکام و تۆمەتبارکردنی وا دەبێ کە لایەقی شوانیش نییە. بەڵگەی بی ئەملا و ئەولای سووکایەتی بە بەهاکان، کە لە ڕابوردووانەوە گواستراوەتەوە نارەزایی دەربڕینە بەرانبەر گێچەڵکردن بە زانایانی ئاین، دەقەکەی ئاوهایە: ئەوەی لە حزووری زانایەکدا بزە بکا، وەک ئەوەیە لەگەڵ دایکی خکۆیدا زینای کردبێ. ئەدی ئەگەر پێبکەنێ یا پشتەملی خۆی بخورێنێ یا بەر بە پژمینی خۆی نەگرێ چی لێ دێ! لە شێتخانەکەماندا زۆر شتی سەیروسەمەرەمان تووش دەبێ و هەموویان زەوقی ئەوانە سەرگەرم دەکەن کە حەزیان بە نوکتەبازییە و ئەوانە و شتی تری وردی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕووبەرێکی فرەوان لە زەوقی ئەو هەرزەکارانە دەگرنەوە کە حەزیان بە سەرگەرمی و شێتی و شتی لەو بابەتانە هەیە ئەگەر لەگەڵ برایان و سەربازانی خەباتدا بەراوردیان بکەی کە بە پەتی خەبات و بۆمبای نوکتە و تۆمەتی وەک خیانەت و بەکرێگیراوی و ئەتککرنی شەرەف ناشێ پشتگوێ بخرێ. شاعیرێکی عارەب دەڵێ:

برینی شیر و تیر چاک دەبێتەوە
ئەوەی زمان برینی بکا دارێژ نابێ

بەڵام کوڕگەلی گێچەڵ و هەرا دەتوانن ئەو تۆمەتە گەورانە بدەنە چاو کە ئاڕاستەیان کراوە، لەوانە پایەماڵکردنی شەرەف تا بیانکەنە بەڵگەی ڕەسەنایەتی خەباتیان و نەبوونی پێکەنین و پێچوپەنا لەو خەباتەدا.

بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی پەرەسەندنی ڕق و نامۆیی لە نێوان خەڵکیدا کە لە ناو ئاژەڵاندا نین نموونەی کەم لە زۆر نموونان دەهێنمەوە کە خەندەک لە نێوان تاکەکاندا هەڵدەکەنن و ئاشنایەتی لاواز دەکەن یا زەحمەتی دەکەن: 1. جیاوازی زمان (لە نێوان گەلاندا) 2ـ جیاوازی شێوەزار. 3ـ جیاوازی عورف و عادەت. 4ـ جیاوازی ئاین. 5ـ جیاوازی مەزەبی و دینی. 6ـ جیاوازی مەزەبی سیاسی. 7ـ جیاوازی میزاج. 8ـ جیاوازی ڕاستی و درۆ. 9ـ جیاوازی جلوبەرگ. 10ـ جیاوازی خۆراک. 11ـ جیاوازی بۆچوون لە ڕیزبەندی گرنگیپێدانـدا. 12ـ جیاوازی نارەزابوون لە پەسەندکردندا. 13ـ جیاوازی شەهامەت لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە خەڵکانێکەوە بۆ خەڵکانێکی تر. 14ـ جیاوازی لێهاتوویی و زیرەکی سامان و ناوبانگ و پلەوپایە و دەنگ و لێهاتوویی لە هونەردا. 15ـ بەخیلی بەوەی دڵ دەیوێ وەک خۆشەویستێکی جوان و ئەسپێکی زۆر ڕەسەن و بەدەستهێنانی ڕێزی خەڵک.. یا..یا هەتا کۆتاییەکی نەبینـدراو لە هۆکارەکانی دابڕان و تا ئەوەی هەڵماتێنیش دەبێتە هۆکار بۆ نانەوەی ئاژاوەی ناخۆش..

ئەو نموونە و وێنانە کە لە ڕەفتاری ناشرینی بەشەرن، بە شێوەیەکی گشتی، بە سەر بیرمەند و ڕۆشنبیرەوە دەبنە ئەرک، ئەگەر ئەم کتێبە بخوێننەوە یا نەیخوێننەوە، کە لە خۆیان بپرسن: بۆچی جگە لە بەشەر، هیچ گیاندار و زندەوەرێک، لە زندوویەکی یەک خانەوە بگرە تا دەگاتە مەیموونی چەشنی بەشەر، بەو لێهاتووییە دوژمنایەتی هەمەجۆر و قووڵکردنەوەی خراپەکاری بۆ تێرکردنی ئارەزوو و لەزەتبردن لە وێرانکاری و داهێنانی مەترسی و... تا لە ژماردن نەهاتووی شێتییەکانی ئەنجام نادا، تا ئەوەی دووچاری نەخۆشی دەروونی وەک سادیەت و شێتی مەزنایەتی و حەزی دزیکردن و لادانی جنسی و ترس لە تاریکی و.. دەبێ؟. ڕوون و ئاسکرایە لەدەستدانی ئیرادەی ئاگایی لە کاتی تووشبوونیدا بە یەکێ لە نەخۆشییە دەروونییەکان لەوە زەقتر و گردەبڕترە بەرانبەر ئارەزووە شەرعی و ناشەرعەیکانی لاواز بێ. دەزانم وەڵامی ئەم کێشەیە لای پزیشک و زانا دەروونییەکان و ئەوانەیە توانای سروشتییان لە زانینی توانای ئاسایی مرۆڤ هەیە بەڵام ڕووبەرێکی فراوان لە پرسیارەکەدا هەیە و دەشێ کەسێکی وەک منیش بێ ئەوەی تووشی هەڵەی گەورە بێ، بە بەشێکدا بچێتەوە، چونکە من ڕاکێتەی دەرمان بۆ نەخۆشی دەروونی دانانێم بەڵکو بەو وشە قامووسییانەی لەگەڵ ناوەڕۆکیاندا یەکدێنەوە، باسی ڕەفتاری بەشەر دەکەم جا چ ئەوەی نەخۆشیی دەروونی بێ و لە دەرەوەی دەسەڵاتی نەخۆشدا بێ یا ئارەزویەک بێ ئارەزوومەند هار بکا و هەردوو حاڵەتەکەش دەچنە بازنەی شێتخانەوە و هەردووکیان لە دەرەوەی جیهانی ئاژەڵدان.

لە پێناسەکردنماندا بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤ بەو ناوە نەفرەتییەی کە بووە ناونیشانی ئەم باسە، نیشانەیەکی جیاکەرەوە هەیە کە لێناگەڕێ جیهانی مرۆڤ تێکەڵی جیهانی گیاندارانی تر بێ (لە

مـەیموونی بـاڵاوە تـا زندوویـەکی یـەک خانـەیی  ـ جیهـانی ڕووەکیشـی دێتـە سـەر بـە هێـزی گەشـەکردنیەوە) جگـە لـە مـرۆڤ، لـە هـیچ زندەوەرێکـدا بێهـوودەیی و خۆبـەزلزانین و ئـەتککردنی دڕندانە و بەرەڵایی سەرەخۆرە و درۆ و دەجەل (گیانداران قسە ناکەن) نابینم کە تەنها خەرمانیان پێ کەم دەکەن و لـەناوی دەبـەن و ڕەنگە پشیلە و بزن و بەچکـەی (نسانیس) و چۆلەکـەی ناو هێلانەی ماڵان و سەر دارانیش ماندوو بکەن و ئەو گیاندارانە، لە وەرزی گونجاویشدا نەبێ زاوزێ ناکەن. ئەوەش جێی سەرنجە کە هەندێ لە گیاندارە ماڵییەکان لـە ژێـر کاریگـەری مرۆڤدا دژیـن سروشتی خۆیـان و لـۆژیکی زاوزێیـان لـە دەسـت داوە و چـی دی گـوێ بـە وەرزی گـەرم و لـەوەڕ نادەن و تێکەڵاوییان لەگەڵ مرۆڤدا کاریگەری هەبووە و سروشتە کۆناکانیان گۆڕاون.

دوای ئەو پێشەکییە، یا بڵێ هەڵبژاردنی ئەو نموونانەی کە شایستەی شێتخانەن، کاتی ئەوەیە بڵـێم لایـەنی کاریگـەر لـە سـەر دروستبوونی کۆمەڵگـەی مـرۆڤ بـەو شـێوەیەی کـە کورتمـان کـردەوە، (عـەقڵ)ە و لـە نـاو هـەموو بوونەوەرانـدا، بـە حـەیوان و ڕووک و تەنـە بێگیانەکانـەوە تـەنها مـرۆڤ هەیەتی و عەقڵیش خۆی لە خۆیدا مێژوویـەکی هەیـە و هـەتا ڕۆژی ئـەمڕۆ ڕێـڕەوی پەرەسـەندنی ناڕوونـە.. ڕەنگە جێی خـۆی بـێ سـەرنجێک لـە بارەی پەرەسـەندنی زنـدووی یـەک خانەییـەوە بـۆ بەرزترین نموونە دەربڕم و دوو پرسیار بکەم: یەکەمیان ئەوەیە مانەوەی زندەوەری یەک خانـەیی بە یەک خانەوە لەماوەی ملیارەها ساڵدا ناڕوونە لە کاتێکدا پەرەسەندن دەیەوێ هەموو گیاندارێک بەرەو جۆرێکی پێشکەوتووتر بچێ. پرسیاری دووەم ئەوەیە نەمریی بوونەوەری زنـدووی سـەرەتـایی لە ئەنجامی پەیدابوونی بوونەوەری سەرەتاییەوە لە هـەموو سـەردەمەکاندا دێ ئـەوەش بـە پـەڕینی وزەی ژیان بۆ ئەو جەستۆکانەی چاوەڕوانی ژیانن؟. بە داخەوە، هەتا ئێستا ڕایەکی زانستیم نەدیوە ئەو لایەنە باس بکا و بابەتەکە بەو شێوەیەی من دەیبینم بە بێ شیکردنەوە لە سەرچاوەکاندا باس کراوە. لە ڕواڵەتدا وا پێ دەچێ زندەوەرە زۆر سەرەتاییەکانی پێش ملیارەها ساڵ هـەموویان بۆیـان هـەبوو پلـەی سـەرەتایی جـێ بهـێڵن چونکـە مـاقووڵ نییـە گیانـدارێکی یـەک خانـەیی گیانـدارێکی زنـدووی لـە خـۆی پەرەسـەندووتری لـێ پەیـدا بـێ و خـۆی، هـەر وەک خـۆی بـە یـەک خانـەیی بمێنێتـەوە. هەرچەنـدە ئـەم باسـە پـەیوەنـدی بـە بابـەتەکەوە هەیـە، بـەڵام وازی لـێ دێنـین چونکـە کاوێژکردنەوەی بی ئەنجامە.

گوتمان عەقڵ مرۆڤی لە هەموو گیانلەبەران جیا کردۆتەوە و لە سەرەتاوە[5] زۆر دواکەوتوو بـووە و سەردەمی دوور و درێژی بڕیوە تا توانیویەتی قسە بکا و جەستەی ئەو شێوازە وەربگرێ کە عەقڵ و ئاسۆی بیرکردنەوەی پێی دەوێن بە بەراورد لەگـەڵ ئاژەڵانـدا و تەنانـەت بـە ڕووبەڕووبوونـەوەی پەنجەکەڵە لەگەڵ چوار پەنجەکەی تردا لەبەر ئەوە بـووە دەسـت لـە هونـەری فێـڵ و ئاسـانکردنی

قورس و جوانکردنی ناشرین بە گوێرەی فەرمانی عەقڵ بکا و باسکردنی ئەوەش لە باسکردنی هۆی بەپدابوونی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی و دۆزینەوەی ئەنجامی لۆگاریتم قورسترە.

لە هەندێ شوێنی نووسینی پێشترمدا باسی ئەوەم کردووە کە مەزنترین شتێ عەقڵی مرۆڤی پوشکاندبێ هەستکردنی بووە بە جیاوازی نێوان شتە ئاساییەکانی نێوان هەموو گیانداران لەگەڵ (جیهانی سەرەوە)دا کە لە ئاو و نێچیر و زاوزێ دابڕاوە، بە جوانی ئاسمان، بە خۆر و مانگ و ئەستێرە و داڕژانی ئەستێرەوە و ئەوانەی سەر بە ئاسمانن وەک هەور و بروسکە و باران کە هەموویان لە زەینی مرۆڤی ملیۆنێ ساڵ لەوەپێش، بوونەوەرگەلێک بوون کە لە زێدی ئەو، بە خۆڵ و لم و ئاو و تەڵەوە دابڕابوون و پەیوەندی زۆریان بە ئاسمانەوە هەبووە و جیاوازییان لەگەڵ ئەوانەی خوارەوەدا بووە. ئەوجا بە شێوەیەکی نارۆشن و ئاڵۆز، لە زەینی مرۆڤی کۆندا پیرۆزیی وابەستە بە غەیبەوە چەکەرەی کرد و نزا و وردەخوێندن و پەیکەر و هەیکەلی بۆ پەیدا بوون و بۆ ڕازیکردن قوربانیشی بۆ درا. ئەو پیرۆزییە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ ماوەتەوە و تەنانەت خەڵکانێک هەن ئینکاری ئاین و خوا و زندووبوونەوە دەکەن بەڵام بە شێوەیەکی سۆفیانە سەرکردەیان بە لاوە پیرۆزە و دەروێشایەتی تێدەپەڕێنن و بە ناوهێنانی هیتلەر و ستالین و ماو حاڵ دەیانگرێ. جۆرە سەرسامبوونێک هەیە جیاوازیی لەگەڵ بە پیرۆززانینی سەرکردە هەیە، وەک سەرسامبوونی لاوان بە عەبدوحەلیم حافز یا خەڵکی تری سەر بە تۆپێن یا ئەو زۆرانبازانەی ململانێی گا دەکەن. هەموو ئەوانە بەردەوامیی پەیدابوونی بە پیرۆززانینە کۆنەکانن و لە جیهانی ئاژەڵاندا شتی وا نابینی. ئەگەر ئامادەیی مرۆڤ بۆ درەوشانەوە لە بەردەم "بەها بەرزەکاندا" نەبوایە کەس ئامادە نەدەبوو بۆ مردنی پەرستراوێک خۆی بکوژێ. زۆر حاڵەتی هەمەجۆر و هەمە بابەت هەن پاڵ بە فڵان کوڕ و فڵان کیژەوە دەنێن خۆیان بسووتێنن یا خۆیان بهاونە بەر پێچکەی قەتارەوە یا ژەهر بخۆن.. هەموو ئەوانە بە هۆکاری هەمەجۆریانەوە، بە شێوەیەکی ئاڵۆز لە ئامانجی گیانبەخشیندا لە پێناوی شتێکی لە گیان شیرینتردا یەک دەگرنەوە. قەت نەماندی ئەوەی خۆی دەکوژێ، لەناوبرنی تاوانبارێکی گەورە بکاتە کەرەسەی خۆکوژی، مەبەستیش ئەو کەسەیە هەر وا خۆی دەکوژێ نەک خەباتکارێکی حیزبی کە کوشتنی سەرکردەیەکی خائین بە ئەرکێکی پیرۆز دەزانێ. ئەمە دیمەنێکە عەقڵ ڕادەگرێ: کیژێک کە "دەیناسم" بە هۆی شەڕێکی نێوان خۆی و دایکی و خوشکێکیەوە خۆی سووتاند. ئەو باوەڕی وابوو کە شایانی شەرەفی خۆکوشتنە، بەڵام لە خەونیشدا بە خەیاڵیدا نەهاتووە کە دەتوانێ قارەمانێک بێ و هەوڵی کوشتنی دکتاتۆرێک بدا مەگەر سیاسی بێ، ئەوساش بە لای خۆکوژییەوە نەدەچوو.

له بنەڕەتدا، لایەنی عەقڵیی مرۆڤ، سەرچاوەی زۆربەی هەرە زۆری ڕووداوەکانی جیهانی مرۆڤە بە چاک و خراپەوە، بە ناشرین و جوانیەوە، بە زوڵم و دادپەروەرییەوە، بە چرووک و بەرزیەوە.. لە تورەهاتی داستانەوە تا پەرستنی بت و مانگا، تا دەگاتە عەرشی تیۆری ڕێژەیی و کەرتکەردنی ئەتۆم و گەشتی بۆشاییەکانی ئاسمان. ئەگەر جیهانی ئاژەڵان قووڵاییەکی کەمی لە بواری خۆپاریزی و زاوزێدا هەبێ و ڕەفتاری تاکی هەر جۆرێکیان لە سەر یەک بابەتە و جیاوازییەکی درکپێکراو لە نێوانیاندا نییە، مەگەر هێز و قەوارە و کەمیکیش زیرەکی. بەڵام کۆمەڵگای مرۆڤ لە ڕەفتار و مەودای زیرەکی و زانست و نەفامی و لادان لە دین و باوەڕیدا، ئەوەندە جیاوازییان هەیە هەندێ جار دەبێتە دژەبەر و ململانێ. ئەگەر بەراورد لە نێوان زانای سروشت و ئەوانەدا بکەیت کە ڕوخساری خۆیان ڕیخاوی و قوڕاوی دەکەن، پێت وا نابێ ئەو دووە سەر بە یەک بنەچەن، چونکە تاکەکانی مرۆڤ دەشێ بە هۆی کاریگەری عەقڵەوە هێندەی هێڵێکی ڕاستی 180 پلەیی جیاوازییان هەبێ بەڵام جیاوازی نێوان پشیلەیەک و پشیلەیەک لە بیست یا سیی پلە زیاتر نابێ، لەگەڵ ئەو سەرنجەدا کە ئەو جیاوازییە مەترسی لێ ناکەوێتەوە چونکە تاکە گیاندارەکان لە ڕێی غەریزەوە هیچ جۆرە داهێنانێک ناکەن تا مەودای جیاوازی نێوان ئاژەڵی داهێنەر و ئاژەڵی ناداهێنەر فراوان بێ، لە کاتێکدا مرۆڤی ئەوروپامان دیت دەفڕین و لە هەمان کاتدا مرۆڤی تریشمان دیت تەپڵیان بۆ مانگگیران و خۆرگیران لێ دەدا و ئێستا فیشەکیان بۆ دەتەقێنن.

دیتت جیاوازی مرۆڤێک و مرۆڤێکم گەیاندە 180 پلە ئەوەش ئەوپەڕی ناتەبایی مومکینی نێوان دوو شتە و دەکاتە جیاوازی نێوان ڕووناکی تەواو و تاریکی تەواو، بەڵام پێشکەوتنی زانستی و شارستانەتی کە خەریکە بە خێرایی ئەندازەیی ژمارەی پێش دەکەوێ دەگاتە ئاستێک کە ئامێری سیحری دەستکاری ناوکی ئەتۆمی بکا تا ئەگەر خێرایی بە سەر خێرایی تیشکدا زاڵ کرد وای لێ دێ جیاوازی نێوان خوێندەوار و نەخوێندەوار ببێتە هەزار پلە نەک سەد و هەشتا: ئەو کاتە مەودای پێکگەیشتنیان و لێکحاڵیبوونیان نامێنێ وەک چۆن پەیوەندی لە نێوان کەسێکی کەڕ و کوێر و کەسێکی چاوساغی گوێساغدا نییە بگرە جیاوازییەکە زۆر لەوە زیاترە بەڵام بە پێویستی نازانم زیاتری لە سەر بڕۆم چونکە ئێمە لە جیهانی سێیەمی پاش سەددا لە ئاستێکی شارستانەتی وادایین یەکێ لەو کەسە هەڵبژاردانە دەڵێ شەڕی نێوان یەکێتینی نیشتمانی کوردستان و پارتی کوردستان ڕیگەیەکە بەرەو دروستبوونی دەوڵەتی کوردی، ئەەش وەک ئەو شەڕەی کە پێش دووەم شەڕی جیهانی لە نێوان فرانکۆ و دوژمنەکانی، لە ئیسپانیادا ڕووی دا و بووە هۆی دروستبوونی دەوڵەت. ئەوە دەڵێ و لە بیری خۆی دەباتەوە کە ئیسپانیا هەر لە کۆنەوە دەوڵەتێکی جێگیرە و کورد سێبەرێکی کارتۆنی دەسەڵاتیشیان نییە. خاوەنی ئەو فەتوایە کوردێکی حەساوەیە و بە تێروتەسەلی لە لەندەن دەژی و فەرمانی خۆی لە بەخائین کردنی ئەم و ئەودا دەر دەکا کە

دەنگ و سەدایان هەیە و لە دارودەستەی خۆی نین و بەخۆشی بەوە تۆمەتبارە کە پیاوی ئینگلیزە و بە زادی ئینگلیز گەورە بووە و لە سەرەتای بیستەکاندا، کاتێ دایکی، لە سەردەمی شێخ مەحمەددا کارەکەری ماڵە ئینگلیزەکان بوو. تەماشای ئەفغان و حاڵوباری عیراق و ئێران بکە لە ماوەی 7 ـ 8 ساڵی شەڕدا ئەوجا ڕووت بە لای ئەفریقیا و ئەمەریکای باشووردا وەرگێڕە سەیروسەمەرەی وا دەبینی، لە سەرەوەی ڕووداوەکانی ناو شێتخانەن.

مەسەلەی مرۆڤ لە ئەلفەوە هەتا یا، لە بزووتنەوە عەقڵییەکەی پێک هاتووە لەو کەشوهەوایەدا کە تیایدا دەژی، جا لە کۆنی کۆنەوە، لە دارستان بووبێ یا لە ناو شاخ یا لە بیابان، ئەوجا لە گوند و لەوێش لە ناو عەشرەتدا و بوونی نەریتێک کە بەردەوامی پێکەوەژیانی پاراستووە بۆتە هۆی ئەوەی گوند پەرە بسێنێ و بۆرژوا بە کاوە خۆ و لە ماوەی چەندین سەدەدا پەیدا بێ تا بە داهێنان و دارشتنی یاسا و ڕێسا و ئەو بەهایانەی کە هاوکێشەیەک لە نێوان تەماح و ئیمکانبوونی ژیان دابین بکا، ببێتە نموونەی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو، جگە لە تەقینەوەی هۆش و توانای خەڵکە لێهاتووەکان لە بواری کار و فکر و هونەردا.. (پێشتریش گوتمان ڕێژەی داهێنەران لە 10000/1 ی خەڵک زیاتر نییە). ئەوەی لە هۆشدا جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لە زۆربەی هەرە زۆری کاتدا باوەڕ بە شتگەلێک دەکا کە عەقڵی ئاسایی باوەڕی پێ نکا، لە بەر ئەوە دەبینین کەلەپووری داستان بە بێ کێشەی جەزادانەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە لە کاتێکدا زانست و هونەر و بیر و ئەدەب بە ماندووبوونی زۆری ئەو خەڵکانە نەبێ کە خۆیان بۆیان تەرخان کردووە و لە کەشوهەوایەکی گونجاودا نەبێ کە هۆش ببزوێنێ و ئەو بۆرژوایەی شۆڕشگێڕ لە ڕۆژی لەدایکبوونەوە نەفرەتی لێ دەکا مەودای بۆ دابین کردوون، ناگوازرێنەوە و تەنانەت ناشتوانن بژێن. ئەوە یەکێکە لەو ڕاستیانەی وا دەکا کۆمەڵگە ناو بنێین شێتخانە.. ئەو بۆرژوایەی دوور بوو لەو پرۆلیتارەی ناوی خۆی پێ نەدەنووسرا و لە گەمەی سەرگەرمکردندا (کعاب) و سێباز زیاتری پێ نەدۆزراوەتەوە، بیرکاری و فەلەکناسی و لۆژیک و فەلسەفە و نووسینی دۆزییەوە و شەترەنج و دامە و هەموو گەمەیەکی پێویستی بە بیرکردنەوە و ڕاهێنان بووبێ، وەک زۆرانبازی و شەڕەشیر، هەروەها پەیکەرتاشی و نیگارکێشان و هونەری ڕازاندنەوە، هەموویان بەرهەمی هۆشی کراوەی بۆرژوای نەفرەتین. نیوە بەیتێکی کوردی دەڵێ: بەو خوایە هاوڕێی ئازیز خەڵەتاوی! بۆرژوا لە پلەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی (مێژوویی)دا وەک بەچکەی ناو زگە و لابردنی ناشێ دەنا چ منداڵ نووزەی لێوە نایێ. ئەگەر بۆرژوا نەبوایە پاڵە و جووتیار، تا ڕۆژی قەیامەت وەک ئەسیری دەستی داس و هەوجاڕ دەمانەوە، ئەگەرچی ئەو دوو ئامێرە سەرەتاییەش لە داهێنانی شارنشینن.. ئەگەر بۆرژوا نەبوایە، ئاسیاویش دانەدەمەزرا.

زۆر بە داخەوە، دەیڵێمەوە زۆر بە داخەوە دەستی جووتیار و کرێکار، لە بەر ئەوەی لە کاری زۆر قورس و سەرەتاییدا بەکاریان دەهێنن ئەو چاپکیەیان لە دەست داوە کە بۆ وردەکاری و دروستکردنی ئامێری ورد پێویستە، تا ئەوەی لە بەر هەمان هۆ بۆی زەحمەتە فێری نووسین ببێ. ڕەنگە پێت خۆش بێ بزانی ئەو ڕۆژەی حکوومەت لە سییەکان و دواتردا ویستی قوتابخانە بۆ منداڵانی تەمەنی قوتابخانە لە گوندەکاندا بکاتەوە، وەرزێرەکان تووشی چ ترسێک هاتن، چونکە خوێندنی منداڵ ئەوە دەگەیەنێ کە نەتوانن بچنە لای کار و بەرخ. بەڵام دوایی، دامەزراندنی ئەو منداڵانە بە مووچەی خەیاڵی وای لە باوکان کرد پێشوازی لە قوتابخانە بکەن. ئەوەش بزانە بڵاوبوونەوەی خوێندنی ڕەسمی لە دەشت و لە شاری سییەکان و چلەکاندا کاریگەرییەکی زۆری لە بڵاوبوونەوەی باوەڕی نازیدا و دوای ڕووخانی هیتلەریش لە بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزمدا هەبوو، جگە لە ڕادیۆ کە لە دنەداندا ڕۆڵێکی باڵای هەبوو. یونس ئەلبەحری ڕۆڵی پێغەمبەران و پەیامگەیەنەرانی لە هاندانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دژی حکوومەتەکانی ڕۆژاوادا گێڕا. تورەهاتی سەیروسەمەرە دەستیان بە سەر هۆشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و زۆر شوێنی تری جیهاندا گرتبوو. ملیۆنەها لایەنگرانی هیتلەر بە بەرنامەکانی یونس بەحریشەوە لە چاوترووکانێکدا دوای ڕووخانی هیتلەر گۆڕان و بوونە ئومەمی و لە هەردوو بارەکەشدا هەڵوێستی ڕانەمەڕیان هەبوو و بە هیچ جۆرێ سەریان لە سیاسەت دەرنەدەکرد و ئەوەندەیان بەس بوو لە بۆشایی عەقڵی و فکریدا مەودایان هەبێ هیتاف بدەن و خۆپیشاندان ساز بکەن. ئەوجا بە پێی بۆچوونی ئومەمییەکانی کوردستانی عیراق بوونی حیزبی کوردی قەومی بۆرژوازی مەلعوونی بەکرێگیراوی دژە چینی کرێکاران، گەورەترین بەربەست بوو، ئەگەرچی ئەو حیزبەش زۆربەی بیرە ئومەمییەکانی لەئەستۆ گرتبوو و مارکس و ماو و لینین و ستالین و فەهدی بە لاوە پیرۆزیش بوون و سەرکردەکانیشی ئومەمی ڕاستەقینە بوون و ئۆکتۆبەر و شۆڕشی چین و کوبا و هەموو ئەو دەوڵەتانەیان لا پیرۆز بوو کە کۆمۆنست تیایاندا دەسەڵاتدار بوو. هەتا ئێستاش ئەو سەرکردانەی لەو حیزبە ناوبراوەدا بوون و ماونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سۆڤیەت هەرەسی هێناوە و ستالین پەردەی لە سەر لاچووە و پەیکەری لینین لە پەترۆگراد وەرگێڕدرا، هەر مارکسی و ئومەمین.

مادام باسەکە پەیوەندی بە ئاگایی و ئارەزووی شتێک یا دژی شتێکی ترەوە هەیە، سەرنجێکی سەرپێیی زەرەری نابێ. ڕەنگە زۆر لە کۆمۆنستەکان دەستبەرداری مەسەلەی شۆڕشی چینایەتی بووبن و باوەڕیان بە یۆتۆپیایی بیری شۆڕشگێڕی هێنابێ لە هەڵکەنینی ڕەگی خاوەندارێتیدا بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگەیەکی بێ چین، لە کاتێکدا زۆرینەیەکی بەرچاویان لە سەر ئەوینە کۆنەکەیان بۆ چەکووش و داس ماونەتەوە و بە عادەت، ژیانی دوور و درێژیش لەگەڵ ئەو دوو هێما پیرۆزەدا سۆز و پێچکردنەوەی بە دوادا دێن.. کۆمۆنستە ئەوروپاییەکان دەستبەرداری شۆڕشی

چینایەتی بوون و ڕێگای دیموکراسیانەیان بۆ ژیانی سیاسی خۆیان هەڵبژارد، بەڵام تێکۆشەری چەپڕەو لە جیهانی وێرانەدا، جیهانی ئێمە، ئەگەر هاشا لە ڕابردووی سیاسی خۆی بکا، نیوەی هەستکردنی بە بوونی خۆی لە دەست دەدا و هیچیش نادۆزێتەوە جێی پڕ بکاتەوە و ئەگەر سەرنجی بەشەرێک بدەین شەعبەدەبازێک دەپرستێ و پێڵاوی دەلێسێتەوە یا سەر و ڕوخساری خۆی بۆ پیرۆزیی ڕیخاوی دەکا، مەودای سەرسوڕمانمان نامێنێ.. پەرستنی ستالینیش نموونەیەکی ئەو گاڵتەجاڕییە تێکەڵەیە لەگەڵ سەرسامبووندا.

ئەگەر بە بێ چاوساغ یا مامۆستا یا خاوەن تاقیکردنەوە لە عەقڵ بگەڕێین، چۆن گیایەکی بەسوود لە گێڵگەیەکدا کە بۆ هەموو جۆرە ڕووەکێکی مشەخۆر کە سەربەخۆ زیاد دەکەن کراوە بێ دەفەوتێ، ئەویش ئاوها لە ناو کەلەپووری دواکەوتندا بزر دەبێ، چونکە گیا و فریز و جۆرەها ڕووەکی تر پەرە دەسێنن و تۆڕی بەهێز پێکدەهێنن و بە سەر ڕووەکی سوودمەندا زاڵ دەبن، بۆیە هەر دەبێ یارمەتی سوودبەخشەکە بدرێ تا لە دەستدرێژی زرەربەخش دەرباز بێ. عەقڵیش لە چنگی دواکەوتندا، لە ڕووەکی سوودبەخشی چنگی تۆڕی ڕووەکی زیانبەخش زەرەرمەندتر دەبێ، بۆ نموونە کۆمەڵگەی ئەسکیمۆ یا هوتنتوتی بەر لە سەدان ساڵ یا قەبیلەکانی دارستانەکانی ئەمەزۆن لە دەستی ئەو تەڵەکەبازانە دەربازبوون کە لادان و تاریکی دادەهێنن جونکە هەر بە دابڕانی ئەو کۆمەڵگایانە لە شارستانەتی و ڕۆشنبیری، سەربەخۆ لە پێشکەوتن خاو دەبنەوە و هەر دەبێ پاڵنەر و هاندەری ڕووناک هەبن تا ئەو دابڕاوانە بخەنە سەر خەتی گونجان. ماجەلان لە کۆتایی ئەمەریکای باشووردا خەڵکانێکی دیت لە دڕکردندا زیاتر بە منداڵ دەچوون و باوەڕ ناکەم بیانتوانیبا لە ماوەی هەزاران ساڵدا لە شەیتانۆکەی دواکەوتن دەرباز بن ئەگەر دراوسێتی مرۆڤی پێشکەوتوویان نەکردبا. پێم وایە قامووسی وشەکانی (پیگمی Pigmy)[6] ناوەڕاستی ئەفریقیا، ئەو ڕۆژەی دۆزرانەوە لە سەد وشەی تێپەڕ نەدەکرد و هەموو ئەو وشانەش یەک بڕگەیی بوون. وشەی (پیگمی)ش لە قامووسەکاندا، لەوانە مەورید، واتای کورتەباڵا دەگەیەنێ. ئەگەر دابڕان لە جیهانی شارستانەتی ببێتە هۆی کورتیی باڵا بۆچی نەبێتە کورتیی تێگەیشتن؟ پرسیارەکە بە شێوەیەکی تریش کراوەیە چونکە خەڵکانی دابڕاوی تر لە شارستانەتی، لە ئەفریقیا بەژنیان بەرز بوو.

سەرنجی ئەوە دەدرێ چڕیی پەیوەندییەکان و ڕێچکە هەمەجۆرەکانی دانوستاندن لە ماوەی چەندین مانگ و ساڵاندا لە کۆمەڵگای شارەکاندا، بۆ خۆیان هاندەرن بۆ ڕوانین لە خەڵکی چالاک و سوودبەخش لە داهێنانی لایەنی ئاسانکاری و چاکترکردنی ئامێر و دۆزینەوەی ڕێگا بۆ زیادکردنی بەرهەم، کەچی وەرزێر لە ماوەی هەزاران ساڵدا بەرەو شتێکی ئاوها نابزوێ و

هەوجارەکەشی لە شارەوە بۆ دێ و گیاکوتیش لە بری ولاغ  بۆ وردکردنی قامیش دیاری ئاسنگەر بوو بۆی چوو. کەوان و مشار و شمشێر و تەنانەت چەقۆش، هەروەها مەنجەنیق و هونەرەکانی (زۆرخانە) بەرهەمی شارن، هەروەها حکوومەت و یاسا و باج.. نووسین و زانست و هونەر و هەرچییەکی بەشەر پەرەی پێ بسێنێ لە داهێنانی شار، واتە بۆرژوای نەفرەتییە کە شۆڕشگێڕی چینایەتی دەیەوێ لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا بیتاسێنێ. لێرەدا قسە لە سەر سەردەمە مێژووییە بەسەرچووەکان بەردەوامە تا ئەو ڕۆژەی بە هۆی زانایی بلیمەتانەوە کە مێشکیان خۆشاوی شارەستانەتی پاراوی کردبوون باسکی زانست بەهێز بوو لە سەر مانگیش دابەزین و وای لێ هات فڕین بەشی ئەوەی نەدەکرد توێژینەوەی زانستی تێربکا و ئەو هۆشانەی، بە تایبەتی لە شارەکاندا ئەوجا بە پلەی دەیەم لە گوندەکاندا، مانگیرانیان بۆ ئەوە دەگێڕایەوە کە نەهەنگ قووتی داوە چۆن بەلادا هاتن، چونکە دەماغی شارنشین ئاشنای بۆچوونەکانی بەتلیمۆس و نۆ فەلەکەکەی بوو کە حەوتیان هی ئەستێرە گەڕۆکەکان بوون بە خۆر و مانگیشەوە ئەوجا فەلەکی جێگیرەکان و فەلەکی فەلەکەکان کە سەرپەرشتی هەموو فەلەکەکان دەکا. پێم وایە فەلەکناسەکانی ئیسلام عەرش و کورسییان بە یەکێ حسێب کردوە تا لە ژمارەدا لەگەڵ فەلەکە کۆنەکاندا وەک یەک بن. لە ڕاستیدا وەرزێری نەخوێندەوار لە بەر ئەوەی سووتەمەنی هەڵچوونی لە فەلەکناسی و داچۆڕانی ئەستێردا نەبووە تا بە حەماسێکی شێتانەوە لەناخەوە بسسوتێ، لە کاردانەوەدا هێمنتر بووە. یەک ساڵ بەر لە ئێستا لە کاتی مانگگیراندا هەڵچوونی شارمان دیت چۆن دەفیان لێ دەدا و تەقەیان دەکرد و دوعایان دەکرد و لە پیاوچاکان و مەلایەکەتان دەپاڕانەوە تا مانگ لەبەندبوون بەر بدەن و خەیاڵی ئەوانە لە ماوەی هەزاران ساڵدا بەرەو ئەوە نەچوو لە  خۆیان بپرسن: بۆچی مانگگیران لە کاتێکدا دەبێ کە مانگ لە چواردەدایە بەڵام خۆر لە کاتێکدا دەگیرێ کە مانگ لە کەمبووندایە!!

میحنەتی عەقڵ چەند قورسە! هەزاران ساڵ بە سەر زانینی نهێنی خۆرگیران و مانگگیراندا تێدەپەڕێ، کەچی هێشتا ملیۆنەها ملیۆن بەشەر لە تاریکایی گومڕاییەوە دێو و عیفریت دادەهێنن گوایە پیلان لە دژی مانگ و خۆر دەگێڕن. لێرەدا ئەرکێک هەیە دەبێ ئەنجام بدرێ ئەوەش ئەوەیە ڕۆژنامەکان هەزاران ساڵ بەر لە خۆرگیران و مانگگیران کاتی گیرانیان دیاری دەکەن و پێم خۆشە بڵێم ئەو دێو و عیفریتانە بە گەڕانەوەیان بۆ سەر ئەو ڕۆژنامانە چالاکتر دەبن تا کاتی گیرانی خۆر و مانگ بزانن.. دەشبێتە جێی پێکەنین ئەگەر ڕۆژنامەکان بە هەڵە کاتی گیرانی خۆر و مانگ بڵاو بکەنەوە، ئەعوزو بیللا.

ڕەنگە خوێنەر، بگرە زۆر لەخوێنەران بەوە بەرپەرچم بدەنەوە کە عەقڵی مرۆڤ بە تەنها بەشی لێکدانەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی زانست و تەکنیک و گەشەکردنی هونەر و ئەدەب و جۆرەها شتی باش و خراپ و بەرپابوونی جەنگ ناکا. منیش بە قسەیەکی یەکلاکەرەوە دەڵێم: نەبوونی عەقڵ لای زندەوەران جگە لە مرۆ، حوکمی دووبارەکردنەوەی خۆیان و ڕەفتاریانی سەدە دوای سەدە بە سەردا داون بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی بەرەو چاکە بە سەر ڕەفتاریاندا بێ. هەموو جۆرێک لە جۆرەکانی ئاژەڵ بە پێی شتێک ڕەفتار دەکا کە پێی دەگوترێ غەریزە، ئەوەش لە ماوەیەکدا کە بە هەزاران ساڵ حسێب دەکرێ (بەو ژمارەیەوە وابەستە نین چونکە بۆی هەیە گۆڕانی کەم لە ماوەیەکی وادا ڕوو بدا بەڵام لەبەر کەمییەکەی کاریگەر نییە)، نە دەگۆڕێ نە هیچ دەگۆڕێ. ئەوەی هەندێ جۆرە گیاندار لە فێڵبازی و وەرزشکردن و ڕەفتارکردن فێری دەبن لە داهێنانی خۆیان نییە بەڵکو مرۆڤی لێهاتوو فێریان دەکەن. ئەوەی ئێستا پێتی دەڵێم بەڵگەیە و بەهێزترین بەڵگەیە ئەوەش ئەگەر مرۆڤ لەبەر هەر هۆیەک بێ هۆشی خۆی لە دەست بدا، بۆ خوار پلەی ئاژەڵە پێشکەوتووەکان دادەبەزێ چونکە کاتێ مرۆڤ ئەگەر بە پشتبەستن بە عەقڵ ڕاهێنان بە غەریزەکانی نەکا غەریزە مرۆییەکانی لە ڕەفتاری دروستدا لاواز دەبن و ئەگەر ڕەگەزی مرۆ عەقڵ لەدەست بدا، لە بەر دوو هۆی گردەبڕ دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەی نەمانەوە: یەکەمیان ئەوەیە جەستەی مرۆ ئەوەندە کوڵکی نییە لە دڕندانی بپارێزێ، دووەمیان ئەویە لایەنی ئەو غەریزەیەی کە پەیوەندی بە خۆپارێزییەوە هەیە چەندین پلە لە گیاندارانی تر لاوازترە. ئیتر بەشەرێک بهێنە بەر چاوی خۆت هۆشی نەبێ و غەریزەشی مەیلەو سڕاوە بێ چۆن وەرزی زستان لە ئەشکەوتدا بە سەر دەبا. زەرەری نییە ئاماژە بەوەش بکەین کە جەستەی مرۆڤ لە ماوەی ملیۆنەها ساڵی پەرەسەندنیدا، تۆ بڵێ هەزاران ساڵ، لە زۆر ڕووەوە گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە و هەندێ ئەندامی لەشی، وەک ڕیخۆڵکە کوێرە، کە کاتی خۆی ئەرکی خۆی بەجێ گەیاندووە، لاواز بووە. گومانیشم نییە هەستە ئاڵۆزەکانیشی گورجوگۆڵییە کۆنەکانیان لە دەست داوە. چاوەکانی مرۆڤ، لە تاریکیدا وەک چاوی پشیلە و دڕندە و کاوێژکەران شت فەرق ناکا. گوێی گرانە... بزاوتن و توانای ماسوولکەی و خۆڕاگری لە ماندووبووندا لەزۆربەی زندەوەرانی دی کەمترە، هۆکاریش عەقڵەکەیەتی کە ڕۆڵی زیادبوونی هەستکردن و گورجوگۆڵی و هێزی لێ کەم کردۆتەوە: وای لێ هاتووە مەودای سەفەری مانگێکی بە سواری ئەسپ و هێستر کەم کردۆتەوە و کردوویەتی بە چەند سەعاتێکی فڕۆکە و ئۆتۆمبیلی خێرای سەر ڕێگای ئامادەکراو. ئەو زەوییەی بە مەکینە لەماوەی یەک سەعاتدا دەیکێڵێ، چەندین گا و هێستر لەماوەی چەندین ڕۆژدا نایکێڵن لەگەڵ ئەوەشدا شوفێری مەکینەکە دەیەکی جوتیارەکە ماندوو نابێ.. لەم بارەیەوە نموونە ئەوەندە زۆرە شەو و ڕۆژ و چوار وەرزی دوانزە مانگەکەت پڕ دەکاتەوە و کۆتایی نایێ.

پەیدابوونی ژیان مەعجیزەیەکی گەورە بوو. ڕەنگە ڕاست بێ کە زندەوەرە مایکرۆسکۆپییەکانی سەرەتا بە بێ ویستی خۆیان ژیانیان بە سەر بردبێ و دەشێ گەشەکردنی ئەو سەردەمە شێوە ئالییەتێک بووبێ و ئیرادەی لە پشتەوە نەبووبێ ئەوە نەبێ کە لە سنووری وزەی ژیاندا بووە و ئەو خۆراکەی قەبووڵ بووە کە خۆبەخۆ چۆتە جەستەی زندووەوە. ئەوەی لە نێوان خۆم و خۆمدا دەیبینم پەرەسەندنی دواتری پەیدابوونی ژیان لە زندەوەرێکی یەک خانەییەوە بۆ ئاستی بەشەر (ئەو هێڵەی لە زندەوەری یەک خانەییەوە دەستی پێ کردووە تا دەگاتە ئاستی مرۆ بە دەزوویەک لە هەزاران هەزار دەزوو دادەنێین کە سەفەری پەرەسەندنیان پێدا کراوە و گەیشتوونەتە پلە و پایەی جیاواز و لە ژماردن نایەن) دەڵێم ئەو پەرەسەندنەی ملیۆنەها جۆری زندووی گرتۆتەوە لەوە ئاڵۆزترە تەنها وزەی ژیان گەڕابێتە ناو ماددەیەکی شلەوە کە بایی ئەوە پێگەیشتبێ زندوو بێ. ئەگەر ئەو موعجیزە گەورەیە بەو کۆرپەلەیە بەراورد بکرێ کە لە هەناوی دایکدا پێدەگا و ملیارەها ساڵی خایاندووە و سەدە بە دوای سەدەدا لە دایک دەبێ و هەرچی بۆ ژیانی پێویست بێ لە خۆیدا کۆی دەکاتەوە و جەستەی مێینەش ئامێرێکی سەرسوڕهێنەری وا پێکدەهێنێ کەعەقڵ لە ئاستیدا سەرسامە، کە لە خوێن خۆراکێکی سپی دروست دەکا کە شیرە و هەر لەگەڵ دەرچوونیدا لە هەناوی دایک کۆرپەکە دەگریێ و زاری بۆ مژینی گۆی مەمک دەکاتەوە. من دەڵێم موعجیزەی ژیان لە چاو لەدایکبوونەوە کەمتر بەرچاوە و لەدوای موعجیزەی شیر و مەعجیزەی بینین و موعجیزەی بیستن و موعجیزەی لەمف و جەرگ و سی و گەدە... و زمانێک کە دەگەڕێ و قورگێک گڕوگاڵ دەکا.. تەنگیی بۆڕییەکانی شەکر کە خۆراک دەداتە خوێ وەها تەسکە چەوریی پێدا ناڕوا بەڵام جێی گەردیلەی شەکری تێدا دەبێتەوە و ئاوها نەبوایە ژیان نەدەبوو چونکە چەوریی لە خوێندا وەک ژەهرە.. پرۆسەی لەدایکبوون بۆ زندەوەران دەگاتە ملیارات و لە ژماردن نایەن مەگەر بە دەگمەن دەنا ڕێژەی نێر و مێ تیایاندا وا نابێ مەترسی بۆ جۆری زندەوەر هەبێ و ئەوەش جۆرە موعجیزەیەکە و چ پێوەرێکی وەک تەرازووش لە ئارادا نییە ڕایگرێ، بەڵکو بە شێوەی هەڕەمەکی دێ. گونجانی ڕێژەی نێر و مێ شتێکە هۆش تێیدا پەکی دەکەوێ.. وردبوونەوە لە نەخشی پێست و پەڕ لە گیانداری شیردەر و هێلکەکەردا، من لە سەر نموونەی زێبرا و تاووس دەوەستم کە سستەمی یەکەمیان و نەخشونیگاری پەڕی دووەمیان سەرسامت دەکەن.. بەڵکو ئەنجامی کۆتایی میهرەجانی سستەم و جوانی لە جیهانی گیانداران و ڕووەکدا (هەروەها ورداکاری سروشتی ڕەگەزە تێکەڵەکانی سەر زەوی و دوورێکی دوورەدەست و دیاردەی کونەڕەشەکان... هتد) بایی ئەوە هەن زەینت بۆ دیاردەیەک بکەنەوە چاوان پڕ دەکەن بەڵام جگە لە ژمارەیەکی کەمی ڕۆشنبیرانی مرۆڤ کەس نابزوێنن. خۆت بە چاوی خۆت دیتت چۆن نازییەکانی ئەڵمانیا و سۆڤیەتی ڕووسی کە لە سەرجەمی مێژوودا بەهێزترین هێزی سەربازییان هەبوو و شیلەی دەماغ لەهەردوو دەوڵەتدا خۆراکیان پێ دەدان ڕووخان، بە تایبەتی

لایەنی ڕووسی کە لە جەنگیشدا بە سەرکەوتوویی دەرچوو، لە کاتێکدا لووتی فیل و پۆپنەی کەڵەشێر و دەنووکی لەقلەق و گیاندارە مایکرۆسکۆپییەکان لەوپەڕی تەندروستیدان و چ کێشە و لادانیان نییە و وەک لینین و سەرکردەیەکی وەک ڕۆمڵیش لایەنگریان نییە و چ قوتابخانەی فەلسەفیشیان نەبووە وەک ئەوەی نەمریی هەردوو سستەمەکەی ڕادەگەیاند. ئەگەر مرۆڤ بە هەڵە دەستیان تێ وەرنەدا، سەفەری زندەوەران بەرەو چاکتر و جوانتر و تەواوتر بەردەوام دەبێ. خۆت دەزانی لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی و زیادبوونی سووتاندنەوە چینی ئۆزۆن تووشی کونبوون بووە " بلاء من ربکم عظیم - بەڵایەکی گەورە لە خوایەکەتانەوە."

هەنگاوی هەزار میل لە سەفەری زندەوەراندا بەرەو پەرەسەندن لە ئەنجامی ئەو بازدانەی مرۆڤەوە بوو لە هەستکردنی غەریزەییەوە بۆ درککردنی هۆشەکی. ئەگەر ئاگاداری ناوەڕۆکی ئەو هەستە هۆشەکییە و پەرەسەندنی بەردەوامی بین کە خاوەن سەرنج بە زەحمەت درکی پێ دەکا، بە بیری کەسدا نەدەهات ئەو (مێوان)ە تەمبەڵە لە لایەن سروشتی ئەو شتانەوە ئاراستە دەکرێ کە خۆی دایهێناون و خستوونیەتیە سەر بزاوتنێکی خێرا کە بە ڕێژەی ئەندازەیی زیاد دەکا و ئەوە چارەنووسی بوو زەمانێک بێت لەماوەی دە ساڵدا مەودایەکی زەمانیی دە هەزار ساڵە ببڕێ و ئەو پێوەر و بابەتانە بگۆڕێ کە زانا و داناکان لەگەڵیاندا ڕاهاتبوون. سەرەوە و خوارەوە لە کەوندا نین و قورسایی نامێنێ (لەناوچوونی قورسایی) و یەک ئەتۆم لە یەک کاتدا بە دوو کوندا ڕەت دەبێ و بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین شتەکان بە بەرەواژیی دەبینین و دەماغ ڕاستیان دەکاتەوە و وا نەبوایە وینەی دنیا نەدەچووە ناو ئاگرەی چاوەوە و کامیرەش لە سەر ئەو ڕاستییە دروست کرا. بەڵام کێشەی گەورە لەوەدایە کە حەقیقەتی بوونی ماتریالی خەسڵەت و ڕەهەند و قووڵایی خۆی هەیە و ئەگەر نەچیتە ناو خەسڵەتەکانی ئەتۆمەوە، بەر مەزەندەت ناکەوێ و بۆ ئەوەش دەبێ خێرایی پێکهاتەکانی ئەتۆم بەوە زیاد بکەیت کە بە خێراییزیادکەردا ڕەتی بکەیت. ئەمەریکا خێراییزیادکەرێکی هەبوو درێژاییەکەی سێ کیلۆمەتر بوو قەبارەی ئەتۆمی 25 جار (وەک لە بیرم مابێ) زیاد کرد بەڵام چوونە ناو ئەتۆمەوە خێراییکەرێکی دەوێ بە درێژایی مەجەڕە بێ[7] (وا بزانم درێژییەکەی دووسەد هەزار ساڵی تیشکییە، ئەگەر هەڵەش بم داوای لێبوردن دەکەم)

بەو شێوەیە بەشەر وەک لوتکەی ئەفراندن دەبینین و چ لوتکەیەکی پێ ناگا و لە دروستبوونی ژیان سەرسوڕهێنەرترە: ڕاستە مرۆ خۆی بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی ژیان بەڵام ژیانیش بەرهەمی ماددەی مردووە و ماددەی مردوو لە کوێ و ژیان لە کوێ و گرنگی هەموو زندەوەرەکان وەک موعجیزە لە چاو مرۆڤەوە چییە؟ گڕوگاڵی منداڵ لە گرنگیدا، لە هەموو هەورەتریشقە و بارە و بۆڕە و جریوە و داچۆڕانی ئەستێرە ڕوونترە. خۆر بەو ئاشکراییەی خۆیەوە

ئەستێرەکان و ئاسمانە دوورەکان هەست بە بوونی ناکەن و بەخۆشی هەست بە بوونی خۆی و ئەوانی تر ناکات. دەبینی کەون لە دەلالەتی ئاماژە و نیشانەدا سێ پلەی هەیە: 1ـ کەونی ماتریالی. 2ـ جیهانی زندەوەران. 3ـ جیهانی مرۆڤ.

نازانین (یا من بە دڵنیاییەوە نازانم) ئاخۆ لە کەونی فراواندا ژیانی وەک ئەوەی سەر زەوی و گیانداری وەک ئەوانەی سەر زەوی و مرۆڤی وەک مرۆڤی سەر زەوی بووە یا شتی لە گیاندارانی سەر زەوی و مرۆڤی سەر زەوی تەواوتری تێدا بووە. ئەگەر چ بەڵگەیەکی بوونی جیهانی زندوو و هۆشمەند، جگە لە سەر زەوی نەبێ ئەوە ڕەت دەکرێتەوە کە بوونی جیهانێکی تری عاقڵ لە کەونی بەرین هەبێ. مرۆڤ پەیامی گەیاندە قووڵاییەکانی کەون و چ ئاماژەیەکی پێ نەگەیشت بەڵگەی بوونی هەست و تێگەیشتن بێ (بە گوێرەی ئەوەی لەو بارەیەوە بیستوومە) ئەگەرچی لە هەندێ هەواڵی جۆراوجۆرەوە کە نەیانگەیاندوومەتە یەقین بیستوومە بوونەوەری زندووی هۆشمەندی خاوەن شارستانەتی لە شارستانەتی مرۆڤ پێشکەوتووتر دابەزیون. لە ڕاستیدا، من بە بوونی شارستانەتی لە هی مرۆڤ قووڵتر لە قووڵایی کەوندا خۆشحاڵ دەبم بە مەرجێ دوژمنکارانە نەبێ، ئەگەرچی ناتوانم بە سەر ڕەفتاریاندا حوکم بدەم و مرۆڤ بەخۆیان کەم و زۆر لە ئەخلاق و پێوەری دادپەروەری و شەهامەتەوە لە یەکەوە دوورن.. تا ئەوەی شتێ لای دەستەیەک چاکەیە و لای دەستەیەکی تر خراپەیە و تەنانەت خەڵکیشی لە سەر دەکوژرێ.

لەگەڵ عەقڵدا زۆر ڕێگامان تەی کرد و بارودۆخی جیاوازمان بە سەر کردەوە و لە هەموو بارێکدا دامانا کە عەقڵی مرۆ مەزنترین جیاکەرەوەیەتی ئەگەرچی پێشتر لەم نووسینەدا گوتوومانە زۆرینەی هەرە زۆری ڕەشەخەڵکەکە لە ڕووی بیرکردنەوەوە پەکی کەوتووە و بەرچاوی لێڵە و بۆ ئەوە دەست نادا چاکە لە خراپە جیا بکاتەوە و زوو دەخەڵەتێ و توانایەکی سەیری لەوەدا هەیە باوەڕ بە پڕوپووچی پێکەنینهێنەر بکا. ئەوەی کە دەبێ لەم بوارەدا ئاگاداری بین ئەوەیە کە مرۆڤ تاکە کاریگەرە لە پەرەسەندنی مێژوو و لە بەرەوڕووبوونەوەی هەر زندەوەرێک یا هەر بێگیانێکدا لە هیچ بارودۆخێکدا ڕۆڵی خۆی لە دەست نادا تا ببێتە دووەم. ئیتر مەیموون و گورگ و مەڕ و دەلفین و هەر زندەوەرێک کە نەختێ هۆشی هەبێ لە هەڵسوکەوتدا لەگەڵ زندەوەر و شتی تردا تاقی بکەوە، دەبینی ئاژەڵێتی یا شتایەتییەکەی وەک خۆی دەمێنێ. با مەیموون نەوت ببینێ لە زەوییەوە هەڵدەقوڵێ یا زێڕ ببینێ لە ناو خۆڵ یا باخچەیەکدا دەدرەوشێتەوە، هەر بە مەیموونی دەمێنێتەوە و هیچ داهێنانێک ناکات. ئەگەر ڕێکەوتێک هەڵکەوت بە بەر یەککەوتنی دوو بەرد پروشکە پەیدا بوو و نەوتەکە گڕی گرت، ئەو مەیموونە جگە لەوەی هەڵبێ و خۆی نەجات بدا، هیچی دی ناکا. ئەگەر زێڕیش ببینێ چی ئارەزووی دەبزوێنێ. ڕاستە ڕاهێنانی تاکە تاکەی گیاندار

له لایەن مرۆڤەوە وا دەکا هەندێ لە کارەکانی مرۆڤ ئەنجام بدەن و بەشی ئەوە دەکا سەرمان سورِ بمێنێ بەڵام ئاستی هۆشیاری ئەو گیانداراه لەوە کەمترە گۆڕانکاری تێدا بکا. بیستوومە مێینەی جۆرە مەیموونێک هاوسەرگیری قەبووڵ دەکا یا نایکا، ئەوەش شتێکی پێشکەوتووە لە ژیانی گیاندارادا بەڵام هیچی لێ ناکەوێتەوە و هیچ لە (کۆمەڵایەتییەکەی) ـ ئەگەر دەربڕینەکە دروست بێ ـ ناگۆڕێ. ئەوانەی بە لێکدانەوەی ماتریالانەی مێژوو و کۆمەڵایەتییەوە وابەستەن زۆر زۆر لە ڕاستی مەسەلەکەوە دوورن چونکە ئەوپەڕی قسەی باوەڕپێکراویان ئەوەیە کە مرۆ بە بێ ئاسن و کەرەسەی تر ناتوانێ فڕۆکە دابهێنێ.. بەڵام بابەتەکە ئەوە نییە کە مرۆڤ داهێنەری کەرەسە پێویستەکانی فڕۆکە و شتی ئالۆزی تر بۆ زێڕچنین و پەرەسەندنی دارستان دابهێنێ، چونکە دنیا بە دوور و نێزیکیەوە لەو سنوورەدا نییە مرۆ خەلقی بکا، مرۆڤ هەیە و دنیا هەیە و ئاژەڵ هەیە، چۆنە وا مرۆڤ بە تەنها گۆڕانکارییان تێدا دەکا و شتیان لێ دروست دەکا و دەیانگۆڕێ ـ مێژوو و کۆمەڵایەتییەکەی خۆشی و کمپیوتەری وا دروست دەکا لە دۆزینەوەی نەزاندراوەکاندا لەمرۆڤ خۆی وردەکارترە، ئامێرێک لە سەر مانگ باسی بارودۆخی سەر مانگ و سەر زەوی دەکا. دەبێ ئامێر خۆی خۆی دروست کردبێ و بە سەر هێزی ڕاکێشانی زەویدا زاڵ بووبێ و بڕیبێتی؟ مادام داهێنان بە ماددەوە پەیوەستە و فەیلەسووفە ماتریالستەکان ڕۆڵی عەقڵیان لە پەرەسەندنی مێژوودا ڕەت کرۆتەوە، ئەدی بۆچی ڕێوی لە دروستکردنی ئامێردا جێی مرۆڤ ناگرێتەوە؟ جێی خۆیەتی لێرەدا بڵێین مرۆڤ توانیویەتی بچێتە ناو ماددەوە و ژمارەی ئیلیکترۆنەکانی زیاد بکا و ئەگەر بە ئەتۆم و وزەت ناوکی خۆی نەکوژێ لە داهاتوودا بە جۆرێ دەستکاری دەکا مەزنەدە بۆی ناچێ و ماتریالستەکانیش هۆکارەکە بۆ خودی مادده دەگێڕنەوە مادام لۆگاریتم و فەلەکناسی و لۆژیک و فەلسەفە و هونەر و ئەدەب و دەنگخۆشی و ڕەگی سێجا دەدەنە پاڵ "مادده" تا دەگاتە دروستکردنی دیوار و پلیکانە یا دوورینی کراس هەموویان هیچن چونکە ڕۆڵێکی مەزن بە مادده دراوە. لای ئەوان خەونی بە ڕاستگەڕاو و گۆڕینەوەی بیرکردنەوە و مێردەزمە و گرێکوێرەی ئۆدیب و دروستکردنی درۆ و ئاواتخواستن لە خەون و ئاگاییدا... هەموویان ماددین. خۆزگە بە سەر خۆیاندا قڵپ دەبوونەوە و ئەهرامەکانی میسر و دیوارەکەی چینیان بە خەیاڵ دادەنا یا بە خۆکردیان لە قەڵەمدەدان. بە درۆخستنەوەی ئەهرامەکان و دیواری چین لە بۆچوونی خۆیان دووریان ناخەنەوە کە تەڵاق و مارەبڕین و باوەڕهێنان بە هەق و ناهەق و "فسنستنبکتکنفتموها"[8] بە ماددی بزانن.

شاعیرێکی سۆفی دەڵێ:

هەرچی لە کەونە وەهم و خەیاڵە ...... یا ڕەنگدانەوەی ئاوێنە و سێبەرە

ئەوەش (تا ڕادەیەک بە پێی مەیلی گوێگر لە غەیب یا دژی غەیب، بەرفراوان و بەرتەنگ دەبێتەوە) و لەگەڵ نەفسی خۆیدا لۆژیکییە. بەڵام ماددی، بە تایبەتی ماددیێتی مارکس کە لە بنەڕەتدا لە سەر ئامانجێکی سیاسی هەڵچندراوە ئەوەش گەیاندنی چینی کرێکارە بە دەسەڵات، بە هاشاکردن لە ڕۆڵی مرۆڤ لە پلەی یەکەم و چوارەم و دەیەمدا، لە بنیاتنانی مێژوودا، خۆی دەخاتە کێشەیەکەوە لێی دەرناچێ: ئەگەر ماددە لە پەرەسەندندا پێش مرۆڤ بخاتەوە ئیدی بە هێچ جۆرێ ڕۆڵ بۆ کرێکار نامێنێتەوە، چونکە بە هۆی بێئاگاییەوە لە هەرچی پێی دەڵێن زانستی پێویستی پەرەسەندن، دەبێتە ئامێرێکی بەکارهێندراو. ئەگەر بەشەریش پێش ماددە بخات کرێکار وەکی خۆی بە بێ توانایی دەهێڵێتەوە لە کاریگەری پێشخستنی بەشەر بە سەر ماددەدا، چونکە لە سەردەمی مارکسدا بە دەگمەن کرێکاری ڕۆشنبیر هەبوو. وەرزێریش پێویست بە باسکردنی ناکا.. ئەوە ڕاستی قسەیە لە لێکدانەوەی ماددی لە مرۆڤ دابڕاو. دەبێ لێرەدا ڕستەیەکی بەرهەڵستکار هەبێ تا نەکەوینە هەڵەوە، ئەوەش ئەوەیە کە (مرۆڤ) ئەوانەی پێچکەی مێژوو (یا کۆمەڵگە) بەرەو پێش دەسووڕێنن هەموو مرۆڤەکان نیین و زۆرینەشیان نین و دەیەکیشیان نین و یەک لە هەزار و پێنج هەزاریشیان نین (پێشتر باسی ئەمە کرا بەڵام خوێنەر لە بیری نامێنێ) بەڵکو داهێنەرە هەستناسکەکانن کە خاوەنی مێشکی داهێنەرانە و دەروونی ئامادەی نوێکردنەوە و داهێنانن، ڕەنگە پێت خۆش بێت بڵێم شاعیرێک لە پلەی (نالی) یا شێخ ڕەزای تاڵەبانی یا مەحویدا چەند سەدەیەک لە ژیاندا بمابا و شیعر و دەقی جوانی داهێنابا، یەک ئاسنگەر یا بەرگدوور یا کاروانچی یا یەک ڕێوێ ڕاهێندراوی لە جێی خۆی بۆ گۆڕانکاری لەو پیشەیەدا نەدەبزواند کە هەزار ساڵە بۆی ماوەتەوە، مەگەر داهێنەرێکیان بۆ بێ تێیانبەگەیەنێ دەستاڕی ئاش و ناعوور چۆن دروست دەکرێن. ئێمە ڕێز لەو لێهاتووانە دەگرێن کە شیعریان داناوە و شانازیشیان پێوە دەکەین، بەڵکو ئەگەر تیری ڕەخنە نەبوایە، داهێنانیانم دەپرست و ئەوەندەش بەسە دکتۆر حەسەن جاف ڕێکەوتێکی بۆ گێڕامەوە کە لە زانکۆی تاران ڕوویدابوو و خۆی لەوێ خوێندکار بوو، بەیتێکی لە شیعری نالی بۆ فارسیزانێکی باڵا خوێندبۆوە، ئەمە دەقە فارسییەکەی یەکەم بەیتێتی:

ابروان تو طبيبان دل افگارانند
هردو پيوسته ازان بيمارانند

برۆكانت پزیشكی دڵی بەئازارن   هەردوک پەیوەستی زامدارانن

ئەو مامۆستایە وەها پێی سەرسام ببوو گوتبووی: ئەو شاعیرەی ئێوە لە هەمو فارسێک زیاتر شارەزای ڕێ و ڕێبازی فارسییە. دەقێکی بەیتووشیم بیر دێتەوە کە هەم شیعرە هەم پەخشانە هەم مەتەڵە هەم ئاڵۆزییە لە عارەبیدا، جا گوێ بگرە:

(بیری عیراق دەکەم و من   نە خەڵکی ڕەسافەیم نە کەرخی
بەڵام لە بەغدا کەسێ هەیە نێزیکبوون لێی   لە لوتکەی لاوێتی خۆشترە)

کورد لۆمەی ناکرێ کە پیشەسازی نەبووە و پەخشان و شیعری بووە. ئەگەر بۆ پێش دوانزە یا سێزدە سەدەی سەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسییەکان بگەڕێیتە دواوە دەبینی خەڵکی پایەدار پیشە و هونەری پراکتیکییان بە زانستی نزم ناوزەد دەکرد و تەنانەت تا جەنگ پەیدا بوو و پیشەوەران کەرەسەیان بۆ دروست کرد و سەرباز نێزەیان هەڵگرت و گیانیان بەخشی، لە کۆتاییدا دەبینی سوپاسگوزاری شاعیرێک میر یا خەلیفەی بۆ ئاستێکی نێزیکی عەرشی خوا بەرز کردۆتەوە. یەکێ لەوانە لە مەدحی - پێم وابێ - سەیف ئەلدەولەدا دەڵێ:

ئەهلی کوفرت وەها ترساندووە   ئەو شەهوەتەش لێت تۆقیوە کە هێشتاکە نەخولقاوە

لە ڕاستیدا، زۆرینەی چاوگەی ڕووناکایی لە سەردەمە بەسەرچووەکاندا لە وشەگەلێ پێکهاتبوون کە لە بوارە جیاوازەکاندا دەگوتران تا وای لێ هات کۆی باوەڕ و ڕوکنەکانی ئەرکی دینیی بوونە حەفتا و هەندێک دەستە و یەک قسەیان لە بارەی دەرهێنانی نەوت و مێوی هەنگ و چاککردنەوەی شکاو و باشترکردنی جۆرەوە (بەشەر و حەیوان) تێدا نەبوو. ئیبن خەلدوون دەڵێ کەمترین زانستی پێشینانمان پێ گەیشتووە چونکە عومەری گەورەمان فەرمانی دا زانستەکانی فارس لەناو ببرێن.

بیری لێ بکەوە ئوممەتێکی بەرفراوانی وەکو ئوممەتی ئیسلام بە حەفتا مەزهەبەوە سەرقاڵ بێ و ناکۆکی نێوان هەندێکیان بگاتە ئاستی تەکفیرکردن، خەریکی ئەوە بێ گوایە مەزهەبی خەڵکانی تر بێکەڵکن و بە هیچ جۆرێ ئەوەندەی دەنکە جۆیەک بەرژەوەندی ئەو ئوممەتە لەبەرچاو نەگرن.. کۆمەڵ کۆمەڵ قسەی بیانوو و شیرین لە بواری پێوانەکاری و جێبەجێکردندا، نەوە دوای نەوە وەربگرن و نەوەت لەسەدیان تێشیناگەن. پێشینان گوتوویانە و ئێستاش دەگوترێ (هەر حیزبە و بەوەی هەیەتی خۆشحاڵە) ئیدی لۆمەت ناکرێ ئەگەر بڵێی ئەو ڕێبوارە ئەزەلییەی کە وزە دەبا و فیتنە دەگێڕێ و توانا بۆ ڕەواجپێدانی بەرژەوەندی کەم دەکاتەوە لە دیارترین ڕواڵەتیدا ڕاگەیاندنی دەستبەردانە لە ئیرادەی پێشکەوتن و هەڵبژاردنی یەکەم. لە حاڵوباری وادا، ئەوپەڕی کار کە

دەکرێ ئەنجام بدرێ (لە باشترین حاڵدا) دوورینەوەی هەڵتەکاو و گیرسانەوەی شکاو و خڕکردنەوەی ڕژاوە لەگەڵ هاتوچۆکردندا لە جێیەکی نەگۆڕدا. بەڵکو پێوانەکردنی ئەو بارودۆخە لەگەڵ ڕەوتی شارستانەتیدا بە گشتی، وا دادەندرێ گەڕانەوەیە بەرەو دوا ئەگەرچی ئەو مەزەب و بۆچوونە ئاینیانە لە ڕابردوویەکی دووردا هەرگیز هۆکارێک نەبوونە بۆ پێشکەوتن و ناشێ بشبنە هۆکاری پێشکەوتن، قسەیەک هەیە بۆ پێغەمبەری دەگێڕنەوە گوایە گوتویەتی 'جیاوازی ئەممەتەکەم ڕەحمەتە' و وایان لێکدایەوە بوونی حەفتا مەزەب حەفتا دەرگا بۆ ناو بەهەشت دەکاتەوە، بەڵام بۆچی پێغەمبەر لەسەردەمی خۆیدا ڕێی نەدەدا بۆچوونی جیاواز لە بارەی فەرزەکان و حەڵاڵ و حەرام و ڕێپێدراو و پێنەدراو و کارەکانی ترەوە هەبێ و چی بەرگر بوو لە پەیڕەوکردنی ئایەتە هەڵوەشاوەکان؟ ئەوانە ژمارەی دەرگای بەهەشتیان زیاد نەدەکرد؟

لەڕاستیدا جیابوونەوەی باوەڕەکان بۆ دەیان مەزەب لە کاتی خۆیدا بەربەستی گەورە بوون لە بەردەم ئارامی بارودۆخی خەڵکی و زۆر فیتنە لە نێوان لایەنگرانی مەزەبە جیاوازەکاندا هەبوون و هەزاران کەسیان تێدا لەناوچوون و وێرانکاری وڵاتی گرتەوە و وای لێ هات بۆچوونی وا لە ئیسلام پەیدا بوو شەڕی خەڵکانی بێ زەرەریان دەکرد و حەجاجیان دەکوشت و.. و.. پێویستیش ناکا زیاتری لە سەر بڕۆم. ڕاستییەکەی ئەوەیە دابڕانی خەڵک لەسەردەمە کۆنەکاندا موسیبەتی گەورە بوو و لایەنێکی ئەو دواکەوتووییەی ئێستا بۆ ئەو کارەساتە خەمناکانە دەگەڕێتەوە و سەرجەمی دیمەنەکە ڕەنگدانەوەی لایەنێکی گەورەی شێتخانەکەیە کە پڕە لە خەڵک. جێگیربوونی باوەڕی پووچ (تامی لە سەر زاری نەفاماندا شیرینە) گەیشتە ئاستێک بە پێشکەوتنی زانستی نوێ و ئەنجامەکانی ئەو تورەهاتە لەڕۆحی ئەو خەڵکە ناسرێتەوە، تا ئەوەی کە بە هەندێ لەوانە دەڵێی بە پێی هەواڵی ڕۆژنامەکان خۆر لە کۆتایی مانگی قەمەریدا دەگیرێ، دوایی کە دەگیرێ دەیانبینی دوعا دەکەن و بیسمیللا دەکەن و تەپڵ دەکوتن و فیشەکیش لەگەڵیاندا دەتەقێندرێن. ئیهـ بەڵکو عیفریتەکان بۆ پشت کێوی قاف هەڵێن.

عەقڵی مرۆڤ ڕووناکایی پێشکەوتنێتی و جگە لەوە چ ڕووناکاییەکی تری نییە مەگەر بە کزیی لە هەستی شاراوە و پەراوێزەوە بێ و هەندێ لە شتی غەیبی بۆ ڕوون بکاتەوە و ئەو هەستەش لەوەیە بەهێز بێ و وای لێ بێ ببێتە مەتەڵێک کە پێویستە یەکلایی بکرێتەوە و شەرح بکرێ (هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ و ئەگەرچی دان بە بوونیدا نراوە بەڵام بە بەڵگەی باوەڕهێنەری بێ کەلێن لێکنەدراوەتەوە) و لەو بوارەدا شتی باوەڕ پێ نەکراو ڕوو دەدەن و گومان نامێنێ کە ئەوانە زۆر پلە لە دواوەن. تاقیکرنەوەیەک کە پەیوەندی بە غەیب و شاردراوەکانەوە هەیە و سەد لە سەد ڕاستە لە ژیانی خۆمدا ڕوویدا. هەتا دە ساڵ بەر لە ئێستا نەمدەتوانی ئاوی فێنک بخۆمەوە چجای ئاوی سارد،

چونکه تەنانەت لە هاوینیشدا بوایە، هێرشێکی کۆخەی وام بۆ دەهات هەموو جەستەی دەهەژاندم. هۆکارەکە عیللەتێک بوو لەو جێیەی دەنگی هەمزە (ء)ی لێوە دێ و ئەگەر بە ئاوێک تەڕ بوایە گەرم نەبوایە وەها کۆخە دەیگرتم مەجلیسی مێوانم بەجێ دەهێشت تا بێزاریان نەکەم.. تا ڕۆژێکیان گەنجێکی تازەهەڵچوو لەگەڵ باوکی و دایکیدا هاتە ماڵمان، ناوی بەوە دەرکردبوو کە لە ڕێی دەستلێدانەوە، بە دەستی ڕاستی، توانای چاککردنەوەی نەخۆشیی هەیە. کورتەی باس ئەوەیە، بۆ ماوەی کەمتر لە دوو دەقیقە دەستی ڕاستی خستە شوینی کۆخەکە.. ئەوە هەموو شتێ بوو کە ئەنجامی دا و دڵنیای کردم کە ئاوی سارد و شتی تری ورووژێنەری کۆخە کاریگەری نابێ. ڕاستیشی کرد. دوای ئەوە لە هەندێ نووسراوی ڕووسی دوای هەرەسی سۆڤیەت باسی ئافرەتێکی ئەرمەنیم خوێندەوە کە خێزانی خۆی لە ئەرمینیای ناو سنووری تورکیا جێهێشتبوو و چووبووە ڕووسیا تا لەو قەسابخانانە دەرباز بێ کە ئەرمەنەکان دووچاری ببوون. ئەو بە دڵنیاییەوە دەڵێ توانای چاککردنەوەی نەخۆشی هەیە. پێم وایە قسەکانی لە سەرچاوەی پزیشکیشەوە پشڕاست کراونەتەوە. ماتریالستەکان زانستی دەروونیان ڕەت دەکردەوە تا ئەو لقەی زانستیش کەوتە بەر مەودای یاسا و تاقیکارییەوە و مەودای هاشالێکردنی لە لایەن ماتریالستەکانەوە نەما، ئەوجا بە فێڵێک کە دەلیلی ترسنۆکییە گوتیان: زانستە دەروونییە مارکسییەکە ڕاستە. لێرەدا: لە مەسەلەی غەیبییەکاندا خەڵک دابەش دەبن بە سەر هەڵوێستی جیاوازدا (هەندێ جار دژ بە یەکدا). هەڵوێستی یەکەم لە هەمویان پووچتر و سەرەتاییترە و باوەڕی بە پێچەوانەترین داستانی دژە هەق هەیە ئەوەش وەک ئەوەی کە دەڵێ پێغەمبەر لە کاتی سەرکەوتنیدا بە پلیکانەی عەرشدا بەرەو لای خوا، پێی هەڵەنگووت و دەستێک گرتیەوە، ئەویش کە ئاوڕی دایەوە عەبدولقادر گەیلانی لە پشت خۆیەوە بینی.. داستانێک دەڵێ دووپشکێک لە لایەن خواوە بۆ کارێک تەکلیف کرابوو کە گەیشتە جۆگەئاوێک و دوپشکیش مەلە نازانێ، کیسەڵێک هات و خستیە سەر پشتی خۆی و لە جۆگە ئاوەکەی پەڕاندەوە. دوایی کارەکەی ئەنجام دا و گەڕایەوە سەر جۆگەکە و بە سەر پشتی کیسەڵەکەوە پەڕییەوە. زێدەڕۆیی سەیر و پێکەنینهاوەر لەوەدایە کە یەکێ لە گوێگرەکان، منیش لە مەجلیسەکەدابووم، ناڕەزایی دەربڕی و گوتی: نەخێر کیسەڵ نەبوو چووە لای دووپشکەکە بەڵکو چیلکە بوو. لە ڕاستیدا چیلکە دەلالەتی بۆ هێزی غەیب زۆرترە. خەنی لەوانەی شەیدای سەرجەمی غەیبییەکانن و بە هیچ جۆرێ ئینکارکردن داد نادا. قسەی باوەڕهێنەر لەگەڵ ئەو دوو جۆرە مرۆڤەدا داد نادا. لێرەدا ئەوەم بە بیر دێتەوە کە پێشتر گوتوومە ئەوەش ڕیسوابوونی ستالین سوودی بۆ مارکسیزم هەیە و ئەوەش قسەیەک لە بارەی داستانەوە بیر دێنێتەوە گوایە شێخێک لە وەلییەکانی خوا بووە مێوانی یەکێ لە دەروێشەکانی خۆی. بەرەبەیان دەروێش چوو بۆ بە دوای هەندێ کاری خۆیدا و وەلییەکە لە لەوحی مەحفووز خوێندیەوە کە خوای گەورە نووسیویەتی زینایەک دەکات، ژنی دەروێشەکەش جوان بوو و لەگەڵیدا جووت بوو. دەروێش گەڕایەوە و

وەلییەکەی نەدی، پرسیاری لە ژنەکەی کرد و ئەویش گوتی کارێکی وای لەگەڵدا کردم و بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشت. دەرویش بە دوایدا ڕۆیشت تا گەیشتە ڕووبارێک کە لە نێزیکی گوندەکەدا بوو، دیتی وەلییەکە بەرماڵەکەی لەسەر ئاوەکە ڕاخست و بە سەریەوە پەڕییەوە ئەوبەر. ئیدی نازانم دەروێشەکە بەو موعجیزەی پەڕینەوەیە دڵی داکەوتووە یا دڵی بە لای فاحیشەکەدا واسویس بووە. دەبێ یەک دەرویش، بەڵکو بلیمەتی ناو بلیمەتان لەگەڵ نەزانێکدا چی بکا کە ڕەش و سپی لێکناکاتەوە یا لەگەڵ مارکسییەکدا کە دڵی داخراوە! شاعیرێکی عارەب (ناوەکەیم لەبیر نەماوە) گوتوویەتی:

گەر بانگی زندوو بکەی دەتبیستێ بەڵام ئەوەی بانگی دەکەی بێژیانە

هەڵوێستی سێیەم گوێنەدانە بەوەی کە لە هەردوو لاوە دەگوترێ و ئەوانەش (با بڵێین زۆرینەی ئەوانە) کە گوێنەدان دەیانگرێتەوە دەبنە دوو بەشەوە، یەکەمیان خۆ لە سەرهێشەی بۆماوەکان و سنووری بۆ ماوەکان لادەدا. دووەمیان ترسی ئەوە دەیگرێ ڕێێ تێ بچێ پاڵنەری دینی لە سەر جۆرە بنەمایەک هەڵچندرابێ، بەڵام هەردووکیان لەو ڕووەوە مەیلەو هاوسەنگن کە ئەو تەکلیفە پشتگوێ بخەن کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پێی دەوێ و بە دەگمەن ڕووداوگەلێک دەیانبزوێنێ کە پەیوەندی چاک یا خراپی بە خۆیانەوە نییە و ڕێشاندەریشیان ئەو قسە نەستەقە کوردییەیە کە دەڵێ (ئاگرە سوورە لە خۆم دورە) و میسرییەکانیش بە جۆرێکی تری دەڵێن: (شەڕ لە دەرەوەیە و لێمانەوە دوورە). بەشی چوارەم تێکەڵەیەکە لە جۆرەها مجێز بەڵام لە مەسەلە غەیبییەکاندا یەک دەگرنەوە و زۆربەشیان دارەکە لە ناوەڕاستەوە دەگرن و هەر فەرزێکیان پێ بکرێ ئەنجامی دەدەن چونکە ئەگەر قەیامەت هەبێ سوودی دەبێ و ئەگەر نەشبێ لە ژیاندا پلەوپایەیان دەبێ. شتێکم بیر دێتەوە کە شایەد شایەدی لە سەر داوە، دوای ڕاپەڕینی 1948 خۆپیشاندان و نارەزایی زۆر بوو و حەماسەت لە دژی ئاین برەوی سەندبوو و یەکێ لە پێشڕەوانی خۆپیشاندان لە سلێمانی لە دروشمەکانیدا زیادەڕۆیی لە کفرکردندا دەکرد و دوایی دەچووە پەنایەکەوە و دەستی لە خوا پان دەکردەوە و داوای لێخۆشبوونی لە خوا دەکرد و نەفرەتی لە خۆی دەکرد. بەشی پێنجەمیان ماتریالستەکانن کە ڕای خۆیان لە سنووری یاسادا دەردەبڕی و بە لای شتە بچووکەکانەوە نەدەچوون و بە دەگمەن سنووری ئەدەبی بەزاندووە و لە دەربڕیندا توند بووە. لە بیرمە سەلامە مووسا بە ئەدەبەوە ڕای خۆی دەربڕیبوو و بەرگری لە سۆسیالیزم دەکرد[9]. بینیم لە بارەی ئاینەوە قسەی کردبوو و شتێکی بەم واتایەی گوتبوو: تەماحی غەیبی دوای مردنم نییە، ئازایانەش بەرگری لە ئازادی و دیموکراتی کردبوو و پێم وابێ بە پۆشاکی خاوێنەوە ماڵاوایی لە ژیان کرد و ئەوەش بۆ هەموو مرۆڤێکی بەرز بەسە. دەستەیەک هەن خۆیان بە خوانەناس پیشان دەدەن و لە

پشـت ئـەو خوانەناسینەشـەوە لـەغوەی ڕووکـەش نـەبێ هیچـی تـر نییـە و لـە یەکـەم هـەنگاوی سەلماندنی بۆچوونی خۆی، کە نە سەلماندنی هەیە نە گرکان، دەشێ لـە قسـە بێ سرەوبەرەکانیدا کەون بکاتە خوا (Pantheism) بێ ئـەوەی بزانێ ئـەوە دژی خوانەنساییە. ژمارەیـەکی کـەمم لـە لاوانی سییەکان نەدی،کە هێشـتا مـن لـە سـەرەتاییدا بـووم، بـۆ دەربـازبوون لـە بەنـد خوانەناسییان ڕادەگەیان. دەستەی شەشەم خەڵکی سەر بە ئاینن و ئەوانیش ڕێزداری وایان هەیە کە هـەموان ڕێـزی دەگـرن و مامناوەندیشـیان هەیـە و دەسـتەیەکێش چاکـەیان تێکـەڵی خراپـەیان دەبـێ و زەحمەتە دەمەتەقێیەکی وایان لەگەڵدا ئەنجام بدەی کە سوودی هـەموو لایـەکی تێدابێ. چـی تـر شاراوە نییە کە سیاسەتی نێودەوڵەتی دەستی کاریگـەر و هەمـەجۆری لـە ڕەوتـی پیـاوە ئاینییـەکانی ئیسـلامدا هەیـە و کاریگـەری مـاڵی دنیـا بـە سـەر نیمچـە زاناکـان و دنیاویسـتەکانەوە ڕوون و ئاشکرایە.

قسە لە سەر کاروبارە هەموجۆرەکانی ناوچەکەمان بوو و لە ڕاستیدا زۆرینەی جیهان بە ململانێ و پێشبرکێ و شەڕەوە سەرقاڵە و کارەسات لە ڕووبـەرێکی فراوانـی دانیشـتوانی ئـەفریقیا لـە بـەر ئـەو سـێ کۆیـەی بـاس کـران چـڕ دەبێتـەوە ئـەوجا نەخۆشـی و قـاتوقڕی و ئـاوارەیی و ڕەشـەکوژیش سـەربارن. ئـەو دیمەنانـە سـیمایەکی ڕاسـتی ئـەو شـێتخانەیە دەخەنـە بـەر چـاو کەبۆتـە ناونیشـانی کتێبەکە. قسەیەکی نەستەقم بیر دێتەوە کە لە زاری سەرەکعەشرەتێکی ئـەفریقیایی هاتـە دەرێ و بۆنەکە هێنایـە پـێش، کـاتێ سـێر وینسـتن چـەرچل لـە سـەردەمی دووەم جەنگدا سـەردانی چەنـد دەوڵەتێکی ئەفریقیای کرد، ئەو سەرەکعەشرەتە ئەفریقییە مێوانداری لێ کرد و لە بۆنـەدا بـە سـێر چەرچلی گوت: ئەم جەنگە میقدارە گۆشتێکی باشـی سـەربازەکوژراوەکانی بـۆ ئـەوروپا دابـین کـرد. چەرچلیش گوتی: ئێمە گۆشـتی مـرۆڤ نـاخۆین. ئـەویش بـە سەرسـوڕمانەوە گـوتی: ئـەدی ئەگـەر گۆشـتی مـرۆڤ نـاخۆن بـۆچی شـەڕتان هەڵگیرسـاند؟؟ ڕەنگـە ئـەم قسـەیە لـە داهێنـانی مرۆڤێکـی زیرەک و قسەخۆشەوە بووبێ بەڵام پڕاوپڕی لۆژیکی سەرکردەیەکی ئەفریقی و کەسێکە لەزەت لە کوشتن دەبینێ و گۆشتی قوربانییەکەش ناخوا.

بابەتێکی سەر بەم باسە هەیە و لە کرۆکیدایە، کە چڵوپۆی وای لێ دبنەوە لە ناوەڕۆکدا زۆر شت ڕوون دەکەنەوە کە بیری مرۆ لێکینەداونەتەوە و بە سەریاندا بازی داوە و لـەناو بابـەتی سـەرەکیدا بزر دەبن: بۆچی لە ماوەی هەزارانساڵدا ژنان ڕازی بوونە و ڕازی دەبن درێژەپێدەری کەسایەتی پیاو بن؟ لایەنگرانی جەدەلییەتی ماتریالی بابەتەکە بەرتەسک دەکەنەوە تا فەلسـەفەیەکی وای لێ نەکەوێتەوە بەرانبەر دەسەڵاتی پیاو بەرگری لە ژن بکا و کەلێنێ بکەوێتە بینای ئەو تیۆرییەوە کە لە سەر بنەمای چینایەتی هەڵچندراوە. لـە عـورف و لـۆژیکی ئەوانـدا ژن (وەک کرێکـار و وەرزێـر)

نابێ له لایەن چینی (کرێکار و وەرزێر)ەوە بچەوسێتەوە. شتێکی سەیرم لە نووسینەکانی لینین خوێندەوە تیایدا دەڵێ بۆرژوازییەکان و ئەوانەی لە ئاستی ئەوان و سەرەوەتردان، بە هۆی دەسەڵاتی سامانەکانیانەوە سواری ژنی یەکتر دەبن بەڵام کرێکار و وەرزێر بۆ ژنەکانیان دڵسۆزن و بە یەک ژن دادەکەون.. ئەوەش قسەیەکی سۆزداری ئەوپەڕی نەفامانە و ئەوپەڕی لادانە لە ڕاستی. ئەگەر بڵێین بۆرژوا و ملکدار لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە ژنباز بوونە، واتە زۆرینەی هەرە زۆری کۆمەڵگە (حەرامزادە و زۆڵ)ن و لینین خۆشی دەبێتە یەکێ لەوانە چونکە لە سەرچاوەی کرێکار و وەرزێرەوە پەیدا نەبووە. بەڵام پاکژی ژنە پرۆلیتار و خۆلادانیان لە فاحیشە بە لۆژیکی (سەروەت و هەژاری) ڕەت دەکرێتەوە. ئایە هەموو ئەوانە ڕابعەی عەدەویە بوون؟ لە هەژاری مێردەکەیەوە کە زۆربەی کاتی خۆی بۆ پەیداکردنی بژێو لە دەرەوە بە سەردەبا، کوانێ بەربەست؟ ئەگەر بەرەنگاربوونەوەی برسێتی و ئیحتیاجی و نەبوونی درێژە بکێشن دەماری عیززەت و گەورەیی نەرم دەکەن. بە ناخۆشییەکی ئازاربەخشەوە دەڵێم 100% ی ئەو ژنانەی لە شوێنی نەشیاودا جەستەی خۆیان دەفرۆشن لە چینە هەرە ماندووەکانن ئەوەش لۆژیکی شتەکانە. ژنی خواپێداو یا مەیلەو خواپێداو ئەگەر بیەوێ دەتوانێ ئەویندارى لەگەڵ پیاوێکدا بکا کە خۆشی بوێ و ئەگەر کەڵۆشیی ئیرادەی لە دەست نەدا ناچێ لە شوێنی نەشیاودا ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە، چونکە هەرچۆنێ بێ کەسوکاری دەیکوژن. نەمانبیستووە لەشفرۆشێک سەر بە خێزانێکی خواپێداو بووبێ. لە کۆمەڵگەی کورددا کە باشی دەناسین، بە دەگمەنی زۆر دەگمەن نەبووبێ کیژی ناودارێک یا سەرۆکعەشرەتێک یا بازرگانێک یا شێخێکی تەریقەت یا زانایەکی ئاینی ماڵەوەی جێهێشتبێ و ڕەدووی لاوێک کەوتبێ کە خۆشیویستبێ، لە کاتێکدا دەیان لە کیژانی ڕەشەخەڵکەکە ڕەدووی کوڕگەلێ کەوتوون کە خۆشیانویستوون و دوایی لە ڕێی ناودارانەوە سوڵحیان کردووە. وەها بڵاو ببۆوە کە باوکێک لە عەشرەتێکدا کیژە گەورەکەی خۆی سەرزەنشت کردووە و گوتوویەتی: ئەگەر خێرت هەبوایە ڕەدوو دەکەوتی، هەروەها بڵاو ببۆوە لە شوێنێکی کوردستانی عیراق هاوسەری سەرەکعەشرەتێک کە ئەویش کیژی سەرۆکی عەشرەتێکی هاوسێ بووە، عاشقی ئامۆزای مێردی خۆی بووە. لە ڕاوەبەرازێکدا گوللەیەک لە جێیەکی نادیارەوە هاتووە و کابرای ئەویندارى ژنەکەی پێکاوە و ژنەکەش هەر بە ڕێزداری ماوەتەوە. بە پێویستی نازانم بۆ سەرەتای کۆمەڵگەی مرۆڤ بگەڕێمەوە تا بارودۆخی ژن لەسەردەمە جیاوازەکان و کۆمەڵگە جیاوازەکان و ئاینە جیاوازەکان لە گۆڕانکارییە جۆراوجۆرەکانی نەخشەی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بە سەر بکەمەوە ئەگەرچی زەحمەتە لە سای دەسەڵاتی کراوە و کۆمەڵگەی داخراو و ئاینی لێبوردە و ئاینی توندوتیژ حوکم بە سەر ژندا بدرێ بە تایبەتی لە ڕووی دەسەڵاتی پیاوەوە لە خێزان و فرەژنی و مەرجەکانی تەڵاق و مەسەلەی چارەسەر و حەرامکردنی هاوسەرگیری نێوان ئەم و ئەودا[10] و بەشی ژن لە مارەیی و میرات چەندە؟ چارمان نییە دەبێ بە سەر ئەم باسانەدا باز

بدەین و بگەڕێینەوە شێتخانەکەمان کە پڕە لە جۆرەها شێوەی شێتی و بە ناچاری ئەوپەڕی کورتکردنەوە قسان کورت دەکەمەوە و باسی دیارترین پلەوپایەی پیاو و پلەوپایەی ژن لە کۆمەڵگەدا دەکەم و دەڵێم: ژن لەبەر دوو هۆی سەرەکی لایەنی لاوازی کۆمەڵگەیە. یەکەمیان، کە گرنگترینیانە، ئاوسبوونە کە بە غەریزە بۆ منداڵبوون دیاری کراوە و هەموو جارێ کە منداڵی دەبێ لە مردن نێزیک دەبێتەوە جگە لەو نۆ مانگە ئاوسییە پشتشکێنە و بەرەژانە تۆقێنەرە و ئەگەر منداڵبوون چەقی ئەرکەکانی نەبوایە ژیانی خۆی لە هەڕەتدا بۆ منداڵبوون نەدەخستە مەترسییەوە. بەڵام پیاو لەو ڕووەوە بێخەمە و ئارەزووی بەردەوامبوونی لە منداڵدا دەیەکی ژن بەهێز نییە. ڕەنگە پیاو لێرە و لەوێ وەچەی خۆی پەرت بکا و ڕەنگە نەشزانێ لە کوێ تۆوی چاندووە چونکە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆردا جووت دەبێ. ڕەنگە تەنانەت ئارەزووە سێکسییەکانی بە نێربازی و ئاژەڵیش دامرکێنێ. هۆی دووەم، ژن لە ڕووی جەستەییەوە لاوازە و توانای نییە بەرگری لە خۆی بکا بە تایبەتی کە منداڵی دەبێ بۆیە پێویستە پشتێکی هەبێ بەخێوی بکا و وەچەی بپارێزێ و پێویستی بە سەرپەرشتی پیاو زیاد دەکا. بەچکەی بەشەر، جیا لە سەرجەمی زندەوەران چەندینساڵی دەوێ تا دەتوانێ ڕێ بکا و لە دە ساڵاندا ئەوجا خۆی پێ بەڕێوە دەچێ جگە لەوەی سەردەمی منداڵییەکەی پێویستی بە چاودێری و پاککردنەوە و جلگۆڕینی بەردەوام هەیە. شیردان نێزیکەی دوو ساڵ دەخایەنێ. ئەدی ئەگەر لە ماوەی ساڵێک یا دوو ساڵدا منداڵێکی تری بێ!.. ئەوجا سێیەم و چوارەم، هیچیشیان خۆیان پێ بەڕێوە ناچێ و بە بێ ئەم خاڵانە ناتوانن بەردەوامی بە ژیان بدەن: 1ـ شیرپێدان. 2ـ خاوێنکردنەوە. 3ـ جلوبەرگ... و بە پێوستی نازانم درێژەی پێ بدەم، چونکە بابەتەکە ئەوپەڕی ڕوونە. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە بەچکەی هەموو گیانداران (جگە لە پەلەوەر) دوای لە دایکبوون ئەوەندە نابا دەکەوێتە سەر پێی خۆی و شیری دایکی دەمژێ و دوای دەکەوێ (پەلەوەریماڵی و ئاوی و هێلانە.. بەچکەی ئەمەی دواییان بۆ فڕین دوا دەکەوێ). ژن لە ڕووی غەریزەوە بە پیاوەوە وابەستەیە و بۆ بەخێوکردنی بەچکەکەیپێویستی بە هاوکاریکردنی هەیە، لەکاتێکدا پەیوەستبوونی پیاو بە خێزانەوە (بە باوەڕی من) پێویستی کۆمەڵگەیە چونکە خێزان بناغەیەتی و ژیانیش بە بێ خێزان ئاسان نییە و پێشناکەوێ ئەوجا ڕۆڵی منداڵ دێ کە سۆزی باوکایەتی دابین دەکا و لە بەردەوامبوونی خۆی، بە تایبەتی منداڵی نێرینە، دڵنیای دەکا چونکە کچ ماڵی بێگانە ئاوەدان دەکاتەوە. ئەوەی ئەم سەرنجانە پشتڕاست دەکاتەوە ئەوەیە کە پیاو دەتوانێ هاوسەرگیری نەکا و چەندی گەرەک بێ هاونوێنی ژنان بکا و پێویستی بە ماڵ نەبێ و لە خان یا لە ئوتێلدا بژێ. ئەوەی دەیڵێم بۆ وەی دەڵێم خوێنەر دوور لە نەریتی باو و سنووری یاسا و شەریعەت و بۆچوونی قوتابخانە سیاسییەکان، بە تایبەتی شەیدایی شۆڕشی پرۆلیتاریا و پاکژی پرۆلیتاریا و پیرۆزی چەکوش و داس، باوەڕی زیاتری بە ڕاستی ئەوە هەبێ کە خوێندیەوە.

دەمەوێ دواسەرنج بخەمە سەر باسی ژن و پیاو ئەوەش ئەوەیە کە پیاو هێز و قورسایی و بەرزی بەژنی بە پێوانە لەگەڵ ژندا زیاترە وەکو چۆن ژن لە نەخش و چنیندا پێش پیاو دەکەوێتەوە. ماوەتەوە بڵێم مۆخەسەری پیاو لە هی ژن گەورەترە و بە شێوەیەکی گشتی زووتر ئەنجامگیری دەکا. لای سەرکردە سۆڤیەتییەکان وەها بڵاو بۆتەوە کە جیاوازی زیرەکی لە نێوان کەسێک و کەسێکی تردا بۆ جیاوازی چینایەتی دەگەڕێتەوە و ئەم بۆچوونەش هی ئەوەیە بەر لە گوتن و بڵاوکردنەوەی خۆڵی بە سەردا بکرێ، چونکە لە درۆ هەرە گەورەکانی سیاسەتی داخراوە و زیادەڕۆییان کرد تا گوتیان کەمیی زەکاوەت بە هۆی کەمخۆراکییەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە. خۆزگە لەم بوارەدا پەرەیان پێ دەدا تا دەگەیشتنە ئەوەی توانا لە شیعر و نیگارکێشان و پەیکەرتاشی و هونەر بە گشتی، جگە لە زانست و تەکنەلۆجیا، دەبنە بۆ ماوەیی و لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر لە ڕێی تێکەڵاوییەوە دەگوازرێنەوە. بەڵام کێشە لەوەدایە کە خەسڵەتە خراپەکانیش بە هەمان شێوە دەگوازرێنەوە و ئەوەیان ئاسانتریشە، چونکە درۆ و دەلەسە و فێڵ و دروستکردنی تۆمەت و شتی لەو بابەتانە لە بەر دەستی هەموو خەڵکیدان بەڵام ئەمەش بە ڕاستکردنەوەیەکی ساکار چارەسەر دەکرێ ئەوەش ئەوەیە بۆرژوا و دەرەبەگ و فرسەتتەڵەب و ویژدانفرۆش و ئیستیعماری و ئەوانەی هاشا لە چاکەی هاوسانی دەکەن، تەنها خۆیان لەڕێی تووشکردنەوە خەسڵەتی خراپ دەگوازنەوە بۆ خەڵکی تر، بەڵام چینی کرێکاران پارێزراوە، چونکە خولقێنەری پێشکەوتن و پەرەسەندنە.. بەڕاستی جیهانەکەمان شێتخانەیە.

دەمەوێ دەلاقەیەکی ڕوانین بەرەو لایەنی ڕووناک و هۆشمەندی مێژووی مرۆڤ بکەمەوە کە نموونەی جوان لە تاکوتەرای هەندێ وڵاتدا دەبینین کە لە ڕێی ڕاپەڕینی جەماوەرییەوە هەوڵی بەختەوەری مرۆڤیان لە وڵاتانی تر دا بۆ هێنانەکایەی دادپەروەری کۆمەڵایەتی داوە. بێگومان عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی ئەمەوی لە پێش هەموو حکوومەتەکانەوە دێ بە کۆن و نوێیانەوە (پاشەڕۆژیشی بخەرە سەر). هەندێ لە شیکەرەوەکان دادپەروەری و چاکەخوازی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە ڕێی دایکیەوە بۆ عومەری کوڕی خەتتاب دەگێڕنەوە، ئەوەش لێکدانەوەیەکە بە ئاشکرا ناڕاستییەکەی دیارە، چونکە عەبدولعەزیزی باوکی لە کوڕی خەتتابەوە نێزیکتر بوو و کەسیش لەو چاکەکاریانەی دەدرێنە پاڵ عومەری کوڕی باسی ناکا. ویژدان لێی دەوێین ئەوە بڵێین کە مێژوونووسانی ئیسلام لە ڕۆژی پەیدابوونی ئیسلامەوە تا مردنی مێژوونووسان هیچیان نەهێشتۆتەوە باسی نەکەن و چ عەیب و کەموکوڕی و دژەبەری لەوەدا نییە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕوویداوە بە وردیی و دوور و درێژی باس کراوە و هەندێکیشیان بۆ ڕازاندنەوە بۆی زیاد کردووە. ئەو حیزبانەی خۆیان بە شۆڕشگێڕ و چەپ دەزانن دان بە پاکی ڕەهای خۆیاندا نەبێ نانێن و شەرمەزاری ڕەهاش بۆ بەرهەڵستەکانیان، لە ڕووی ناچاریشەوە هەندێجار دان بە

هەڵـەی خۆیانـدا دەنـێن. نهێنـی ڕاسـتگۆیی لـە مێـژووی ئیسلامیشـدا بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە مێژوونووسان سەر بـە حکوومەتـەکان نـەبوون و چییـان زانیـوە نووسیویانە و وەک ئـەو زانایانـەیان کـردووە کـە بــە دوای ســەرچاوەی حەدیســەکاندا گــەڕاون و ئــەوانیش هــەوڵی زۆریــان داوە سـەرچاوەکان بدەنـەوە پاڵ جێی خۆیـان و بـواری دەمەتـەقێش ماوەتـەوە. لـە سـەردەمی عوسـمانی کوڕی عەففاندا لەوەش زیاتر بۆ کۆکردنەوەی قورئان کراوە. لە ڕووی باوڕکردنـەوە بـو گێڕانـەوەی مێژووناسـان و پەیداکـەرانی فـەرمودە و کۆکـەرەوەکانی قورئـان دەڵـێم دوان لـە دنگـە هـەرە بەهێزەکانی قەرار و بۆچوون لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب و دواتر هەتا دەگاتە دەسەڵاتی معاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان ئەمانە بوون: عەمری کوڕی عاس و زیادی کوڕی بـابی (زیـاد إبـن أبیه). عەمری کوڕی عاس کە دەستەڕاستی معاویە و تێکشکێنی سوپای عـەلی بـوو، بـە بەڵگـە لـە مەجلیسی معاویە و بە شایەدی ژنێکی خزمی پێغەمبـەر دەرکـەوت زۆڵـە و کەسەرزەنشتی کـرد، پێی گوت: ئەی کوڕی ناودارترین قەحپەی هەموو مەککە، دایکت کە تـۆی بـوو گـوتی پێـنج پیـاو لەگەڵمدا جووت بوونە و تەماشای منداڵەکە بکەن بزانن بە کێ دەچێ، کوڕی ئـەوە و دیتیـان بـە ئیبن لعاس دەچیت. (زیاد ابن ابیە ـ زیادی کوڕی بابی خۆی) شایەدی لە سەر درا: ئەبو سـوفیان لە تائیف مێوانم بوو حەزی لە جووتبوون بوو و قەحپەیـەکی نـاوداریش لـە تـائیف هـەبوو و بردیـە پەناوە و دیتم ئاوها و ئاوهـای لـێ کـرد و زیـادیش لـەو پەنایـەوە دروسـت بـوو. عـارەب عـادەتێکی باویان هەبوو پێی دەگوترا بەدواخستن (الاستلحاق) ئەوەش وای دەگەیاند کە منداڵی زۆڵ لە پلەی منداڵی شەرعیدا دابندرێ، ئەبو سوفیانیش زیادی بە دوای خۆ خست و ناوی لێ نا (زیاد ابن ابیە ـ زیادی کوڕی بابی خۆی).. لایەنی پێداهەڵدان و مەدحی زیادەڕۆییانە لە مێـژوودا زەرەری نییـە و دەتـوانی بـە لازمانێـک زەمـی هـەموو شـیعر و پەخشـان و هـەواڵ و لاواندنـەوە و پێداهەڵـدان و پیرۆزکرنێک بکەیت چونکە گاڵتەپێکردن دەیەکی داڕشـتن و ڕێکخسـتن و باسـکردن ئـەرکی نییـە. پێ دەچێ 14 سەدە پێش ئێستا عادەتی عارەب وابووبێ ماندووبوون لـە پێداهەڵـدان و باسـکردن و ڕێکخستنی شتی ئاسایی لـەو بابەتانـە، لـە هەجوکـەدنی شـیعرێکی مـەدح ئاسـانتر بـووبێتن مەگـەر شاعیر، بۆ نموونـە، خـاوەنی پـەیام بـووبێ لـە بەڵگـە و بەڵگـەکاری و شەڕەقسـەی نێـوان دوو لایـەن وەک شاعیری ئەمەوی، پێم وا بێ فەرەزدەق بوو، لە لایەنگری زەین ئەلعابدیندا دەربڕی کاتێ لە حەج خەڵکەکە دەوریان لێ دابوو و خەلیفەی ئەمەویش لەوێ بوو و کەسی بە لاوە نەدەچوو بۆیـە ویسـتی بـە پرسـیارێک زەینلعابـدین بشـکێنێتەوە: ئـەوە کێیـە؟ دەشـیزانی کێیـە و شـاعیرەکەش جوانترین قەسیدەی مەدحی عارەبی هۆنییەوە:

ئەوە ئەو کەسەیە تێکشاو توانای دەناسێ

'بەیت'یش دەیناسێ هەروەها حەڵاڵ و حەرام

پێم وا نییە کەس لەوانەی ناحەزی ئالی بەیت بوون هەتا ئەمڕۆکەش زمانی بۆ تێکشکاندنی بزواندبێ بەڵام لە بەیتێک زیاتری ئەو شیعرەدا خەلیفە بەوە داغمە دەکرێ کە قسە دەردەپەڕێنێ و لە مەدحی زەینلعابدیندا بۆ نموونە، دەڵێ:

لە مەعشەری خۆشەویستییاندا دینە و رقبوونەوەش
کوفرە و نزیکییان نەجات و پارێزگارییە

ئەوەشی لە هەمووی زیاتر بەدڵمە عیجزێکی بەیتێکیانە کە دەڵێ:

ئەو خواناسە بێگەردە زانست پاکە

بۆنەکە بۆ ئەوەم دەبا کە کورد شیعری کۆنی نەبووە و تۆمارکراوە کۆنەکانی وەکو ئاڤێستا و کارنامە (کارنامک).. شوێنەواری شیعریان تێدا بەرچاو ناکەوێ مەگەر بە زۆرداری. کاتێکیش بحور و قافییەی شیعری عارەبی دوای ئەوەی ئیسلام وڵاتی فارسی فەتح کرد برەویان سەند شاعیری بەرز لە فارسدا هەڵکەوتن و لە بواری هەمەجۆردا دیوانیان تۆمار کرد تا ئەوەی شانامەی فیردەوسی و مەسنەوی جەلالەددینی ڕۆمی ـ پێشتر باسی هات ـ شانازی ئەدەبی مرۆڤایەتین و پێم وا نییە لە هیچ زمانێکی جیهاندا لە وێنەیان هەبێ. بەڵام کورد نەزمێکی تایبەت بە ژنانی شاخیان هەیە پێی دەگوترێ (بالۆرە) لەژنی کورد نەبێ نەمبیستووە و لەو ڕۆژانەشدا دەگوترێن کە ژن و پیاو بە قەدپاڵی شاخەکاندا پەرت دەبن و مازوو و چیلکە دەچنن ئەوجا دوو کیژی دەنگخۆش جیا دەبنەوە و بە شێوەیەک ئەو دەیلێ و ئەوی دی دەیسەنێتەوە، لەگەڵ کارەکەیاندا ڕێک دێتەوە.. تەنها ئەم بەیتەم بە کوردی لە بیر ماوە:

ماینێ سەر بێ ڕیشم
لە برای خۆمت کێشم

ماینی سەر بێ ڕەشمەش واتە ماینێکی ناو ڕەو کە ڕەسەنایەتی نییە. بەڵام ماینی ڕەسەن لە تەویلە دەبەسترێتەوە لە ئاوی کانی یا بە پەقرەج ئاو دەدرێ و لەکاتی خۆیدا ئالیک دەدرێ.. هتد[11]. باسەکە هەڵدەگرێ باسی عەلی بەردەشانی بکەم کە شاعیرێکی داهێنەری گەلیی بووە و خاوەنی داستانی دوور و درێژی وەها بووە کە باسی مەترسییان تێدا بووە بە تایبەتی بەیتە بەناوبانگەکەی لە سەر عەبدلرەحمان پاشای بابان و هاندانی ئەو میرە بۆ ڕاگەیاندنی جیابوونەوە لە بەغدا و غەیری بەغدا. نەزمەکەی هەر بە ئاگر و ئاسنی تواوە دەچێ و بەم شێوەیە کۆتایی پێ هێناوە:

ئەی لاوی بابان یاڵڵا و وشەی (یەڵڵا) ناوی خوای بۆ زیادبوونی کاریگەری تێدایە بۆ هاندان و بەرزبوونەوەی شەهامەت.

ڕێکەوتێکی چاکە کە کۆمەڵگەی کوردەواری بە گوند و شاریەوە مەیلی بە لای گۆرانیدا هەبووە و مەودای بە هەڵپەڕکێی ڕەشبەڵەک داوە ئەوەش لە ڕۆژانی خۆشی و چوارشەممۆانی بەهاردا (گوند پێویستی بە بەهار نییە چونکە بەردەوام لە کێڵگە و لەوەڕگەدایە) بۆیە جۆرەها هەڵپەڕکێ و ئاوازی بۆنەکان مانەوە لەگەڵ نیمچە قامووسێکی وشەی تایبەتیدا وا نەبوایە دەمردن وەک زۆر وشەی سەر بە گەمەی گەڕەکەکان لە هەموو وەرزەکاندا مردن، لەسەردەمی خۆیدا واتای دەیان وشەم لە هەرزەکارەکان پرسی کەچی واتای یەک وشەیان نەدەزانی. پێ دەچێ لە ئاستی (ختیلە و خازەڵە) بەرزتر بووبینەوە و کۆنەکەمان لە دەست دابێ بەڵام نەشگەیشتبینە ئاستی تۆپێن و باسکێتی سەردەم. بە دەگمەن هەیە لە ئاڵوویردا ئاوها زەرەرمەند بی وەک ئەوەی خۆت لەوانە بەرزتر بگری کە فەوتاون و نەشگەیتە کەرەسەی خواپێداوان.. کە نیعمەتەکانیان نوێیە.

پاراستنی کەلەپووری کۆنی کۆمەڵگە لە پەیوەندی نەتەوایەتی هەستی گشتی و قووڵکردنی ڕەگی بوونی ماددی و مەعنەویماندا سوودی گەلێ زۆرە بەڵام ئەوە زەحمەتییەکی زۆری دەوێ چونکە دەبینی و هەست دەکەیت و دەزانی زۆربەی لەدەستچووەکانی نەریت لە نیشانە بەسوود و بەرزەکانە و وەک (عەوسەج)[0]ە لە بەرانبەر مردندا لە کاتێکدا پرتەقاڵ زوو دەمرێ. هیچ کورد و تورکێکی عوسمانی ئاوڕی لە لێهاتوویی (مەستی ئەفەندی - پێشتر باس کرا) نەدایەوە بەڵام تەپڵکوتان بۆ ئازادکردنی مانگ لەوپەڕی کاریگەری و بەهیچکردنی زانستی فەلەک و سەفەری ئاسمانەکان و بیری ئەوانەدا بوو کە پێی ڕاست بوون. دابەزینیش لە سەر ڕووی مانگ، کە بیست ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە لە هۆشی خەڵکدا سڕاوەتەوە و مانگ عەرشە کۆنەکەی خۆی بە دەست هێنایەوە و ڕۆحی چاکان و مەلایەکەتی بە دەورەدا دەخولێنەوە..

خۆشبەحاڵی بێهۆش و جەدبەلێدراو و نەخۆشە دەروونییەکان و وەی لەو جەژنی جەژنانەی شێتخانەکە کە پڕە لە شێتی بەشەر و چ دیمەنێکی جوانە بە هەڵەداچووترین کەس تف لە ناوەڕۆکی زانست و مەشخەڵبەدەستەکانی و ئەوانە بکا کە دروشمی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤی بەرز کردۆتەوە و نەفامی ڕیسوا دەکا و زانست بووە کوفر و پیرۆزکردنی کوفریش باوەڕە.

---

[0] جۆرە درەختێکی بیابانە لە داربادەم دەچێ و بەرێکی سووری هەیە. ناوە زانستییەکەی (Lycium)ە - وەرگێڕ

هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ، لە بەر دوو هۆ فرەوانبوونی ڕووبەری شێتایەتی و لـە خشتەچوون لـە ڕووبـەری ڕۆشنایی و تێگەیشتن زیاتر فراوانتر دەبێ: یەکەمیان ئەوەیە بە ئاسانی باوەڕ بە پڕوپووچی شیرین دەکـرێ و ئەوەشـی ئاسـانتری دەکـا ئەوەیـە ئـەو بۆماوانـە لـە کۆنـەوە ماونەتـەوە و جێـی ڕێـز و بـاوەڕپێکردنی ڕەهـا بوونـە. وەک نمـوون دەڵـێم دوای دۆزینـەوە زانسـتییەکان و چوونـە بۆشـایی ئاسمانەکان و دابـەزین لـە سـەر مانـگ هیـوای ئـەوە زۆر بـەهێز بـوو بۆچـوونی خـەڵک لـە بارەی کەونەوە بگۆڕێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مانگ دەگیرێ و خەڵکیش تەپڵ لێدەدەن و زوڕنا دەژەنن و لە تەنەکە دەدەن و عیفریتەکان بە دوعا و سەڵاوات و تەپڵ لـەکۆڵی مانـگ دەبنـەوە و ئەوەشی بـاوەڕ ناکـا مـانگگیران هەڕەشـەیە لـە ئاسـمانەوە بـا شـەقبەرێ. هـۆی دووەم ئەوەیـە دۆزینـەوە زانستییەکان و داهێنانەکان، هەموویان کاری مرۆڤن کە چارەنووسی دیارە و خەسڵەتی ماتریالانەی ناڕوونیان هەیە و دوور نییە پژمینێک ببێتە هـۆی تێکچـوونی ئۆتۆمبیلێـک یـا ئاگرکەتنەوەیـەک یـا ئازارێک بەو کەسە بگا کە دەپژمێ بە تایبەتی ئەگەر خۆی یا ئەوەی لەگەڵیدایە نەگبەتی پژمینی لە بیر بچێ و دوعا نەکا. ناکرێ بە زانستی ڕەها لە ماوەیەکی مامناوەندیـدا گومڕایی فکریـی لـەناو ببرێ چونکە ئەو پژمینەی لە سەرەوە باس کرا چەندین سەردەم دەمێنێ و ڕۆشنبیری ڕووناکیش کەرەسـەیەکی دەگمەنـە بـۆ خـەڵکی ئاسـایی. دیتمـان سـارتەر ڕۆژنامـەی پـارتی کۆمۆنسـتی چینـی دەفرۆشت و یەکێکیش بوو لە ڕۆشـنبیر و هونەرمەنـد و ئەدیبـە گـەورەکان. خورافـات و تورەهـات سەد هەزار ڕەنگ و شێوەی هەیە و هەر دەستەیەکی خەڵک عەشقێکی تایبەتی بۆ وەهم هەیە کە خۆی بە دەوری قووقەی کەڵەشێردا دەچنێ و دەبێ سەرببڕدرێ. لوورەی دوور و درێـژی سـەگی شەقامەکان لە شەودا پاڕانەوەیە بۆ سەلامەتی لەو بەڵایەی لە ئاسمانەوە دێ.. ئەگـەر لـە جیهانـدا سەد هەزار دەستە هـەبن و هـەر دەسـتەیەکیان چەنـد قامووسـێکی خۆشـبەختی و بەدبـەختییان بـۆ واتای حاڵەتە جیاوازەکان هەبێ، کە ژمارەیان کۆتـایی نـایێ، چەنـدین سـەدە بـە سـەر گەشـەکردنی شارستانەتیدا تێدەپەڕێ بەر لـەوەی خـەڵک دەسـت لـە وەهمـی خۆیـان بـەردەن کـە وەک گوتمـان ڕەنگ و دەنگی جیاوازیان هەیە و ڕێی تێدەچێ تێکەڵ بە یەکتر بن و جـۆری دووڕەگـی تریـان لـێ ببێتەوە (لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە). لە ڕاستیدا وەهم تەمەنی درێژە بەڵام ڕێگا بە گۆڕانکاری و زیـادبوون دەدا و پێویسـتی بـە مامۆسـتاش نییـە داسـتان دابهێنـێ و وەک دەزانـین داسـتانی وەک پاڵەوانێک فیل بە سوار و چەکەوە بە یەک دەستێ هەڵدەگرێ و عفریـت دەفـڕێ و سیحرباز فـوو لە پووشکە دەکا و دەیکاتە شێر، ئەو جۆرە حەکایەتانە لە زمانی لووسەوە پەیدا بوونە و هونەری وا بە دەگمەن بەرپەرچ دراوەتەوە و لێم دیـون ڕاسـتەوخۆ داستانەکان دادەهێـنن.. جـۆرە کـەرامات و عادەتی لە ڕادەبەدەر کە دراونەتە پاڵ وەلـی و سـۆفی و عەبـدە سـاڵحانەکانی خـوا، ڕێـی تـێ دەچـێ یەکێ لەوانە لەگەڵ خەڵکی نەفامدا داهێنانی وا بکا ئیرادەی خوا بداتە پاڵ کەسایەتی لاوازی خۆی و تا نەخۆش چـاک بکاتـەوە و نهێنـی بدۆزێتـەوە و نـان بـە هـەژار بـدا و تـا ئـەوەی ژمارەیـەک لـە

قوتابیـانی ئامـادەیی لـە ناوچەیـەکی ژێـر دەسـەڵاتی شـێخێک کـە ڕایدەگەیانـد کـەراماتی هەیـە حەکایەتی وایان لە سەر دەسەڵاتی غـەیبی شـێخی نـاوبراو دادەهێنا کە باوەڕیان پـێ نـەدەکرا تا خەڵکی لێ بتەکێنەوە بەڵام مەسەلەکە بە پێچەوانەوە، لە بەرژەوەندی شێخ کەوتەوە و هـەموو ئـەو کەراماتە داهێندراوانە بوونە هی شێخ و گومانیان لێ نەبوو.

ئەو دەماغەی بـە پڕوپووچ و تورەهاتـەوە سـەرقاڵ بێ ئامادەیـە هـەموو دیاردەیـەک وەک داسـتان لێکبداتـەوە و زۆری حـەز لێیـە لـە پشـت هـەموو شـتێکی ئاشکراوە حیکمـەتێکی شاراوەی جیهـانی غەیب هەبێ، بۆیە گرمەی هەوریان وا لیکدایەوە کە دەنگی مەلایەکەتی بەرپرسی هەور و بارانە و بوومەلەرزەش لە ئەنجامی جووڵاندنەوەی سەری ئەو گایەیە کە زەوی لـە نێـوان هـەردوو شـاخیدا هەڵدەگرێ. کـە نەشـکرا عفریتـی ئـازاد و بەنـدکراوی نـاو قومقـومی سـەرمۆر بـە چـاوان ببینـدرێ گوتیـان بـەرەو پشـت کێـوی قـافی دەوری زەوییـە تەختەکـەمان ڕەویـان کـردووە و هـیچ مرۆڤێـک نـاتوانێ بـەو شـاخەدا هەڵگـەڕێ بـۆ پشـت... ئـەوەیان وەپـاڵ پیاوچاکێکـدا دا کـە سـەرزەمینی (سمسمە)ی کەشف کردووە کە حەوت کەرەت بە قەدەر زەوییەکەی ئێمەیە، خۆزگە ئەمـەریکا و ئوسترالیا و هەردوو جەمسەری زەمینی کەشف بکردبا کە ڕۆژ تیایاندا شەش مـانگی بەردەوامـە و شەویش شەش مانگی بەردەوامـە، ئەگـەر بۆت هەڵکـەوت (هـەزار و یـەک شـەو) بخوێنیتـەوە کە بەرهـەمێکی سـەردەمی زێڕینـی مێـژووی ئیسـلامە، حەکایـەتی (بلوقیـا) هـەڵبژێرە کـە ڕەنگـە لـە سەردەمی هزر و دەرهێنانی ئەنجام لە پێشەکیدا ئاسوودەت بکا چونکـە گوتـەی (واقـواق سـوبحان الملک الخلاق) لەو گەرمای خۆرە دەتپارێزێ کە لە لۆژیک و زانستەوە هاتووە..

دەربازبوونی ئەو ملیاردەها کەسەی جیهانی سێیەم و ڕێژەیەکی زۆری گـەلانی جیهـانی شارەسـتانی لەو زنجیرەی وەهم و تەونی گومڕاییـەی دەوری هۆشـی نیوەمرۆڤـەکانی داوان نییـە و کەوتوونەتـە چنگی دێوێکـەوە کە هـەزار دەسـتی هەیـە و هـەر دەسـتێکی هـەزار پەنجـەی هەیـە و دەتـوانی بـە هەوەسی خۆی ژمارەی دەستەکانی و پەنجە و لاق و باڵەکانی خۆی زیاد بکا. لەم جۆرە حیسابانەدا دەبێ لە بیرمان بێ کەسانی سـەردەمی باپیری پێنجـەم و دەیـەممان نەخوێنـدەوار بوونـە و ئەوانـە نەبێ کە خوێندکار و مامۆستای دینی بوونـە، سـەریان لەخـەت دەرنـەکردووەو لـەو خوێندنانەشـدا مەگـەر لۆژیـک و فەلـەک دەنـا زانسـتی دنیـایی بـە دەگمـەن خوێنـدراوە. فەلـەکیش ئـەوەی بەتلیمۆسیان دەخوێنـد بـە زەمینـی وەسـتاو و ئەسـتێرەی وەسـتاو و بزوێنـەوە. کێشـەی گـەورە لـەو بیرکردنەوەیەدا بوو کە زەوی تەختە و ئاسمان میچێکە بە سـەریەوە.. ئـەمرۆش کە دوای دەست بەسـەرداگرتنی ئاسـمان و دابـەزینی سـەر مانـگ نەخشـەی کـەون گـۆڕاوە گونجانـدنی و ئـەو بۆچوونانـەی کـەم و زۆر بـە یـەک ناگـەن زەحمەتـە. پێم باشـە لـەم کێشـەیەدا تونـد نـەبم چونکـە

مولحیدەکان خۆیان لە سەر بۆچوونەکانی مارکس و لینین سوورن و دەریشکەوت ئەوانە بەش ناکەن و تەنانەت لە لۆژیکی مێژووەوە دووریشن و مەحاڵە بە کۆمۆنیزمی هەرەمەکی کە پشت بە بنخان و زانستێکی سروشتی پیشەسازی ببەستێ کە هەموان تێر بکا، یەکسانی ڕزق هەبێ. ئەمە جگە لەو بێواتاییەی گوایە حکوومەت بدرێتە دەستی وەرزێری نەخوێندەوار و کرێکارێک کە لە ژماردنێک یا لەجەبریک یا ئەندازەکارییەکدا ون دەبێ کە قوتابی ناوەندی شییان دەکاتەوە، جا چۆن دەبێتە وەزیر و مامۆستای زانکۆ و فڕۆکەوان و مامۆستای تیۆری ڕێژەیی؟ کۆمۆنستەکانی ئەوروپا و جیهانی پێشکەوتوو بیرۆکەی شۆڕشی پرۆلیتاریایان ڕەت کردەوە و دیموکراتی هەڵبژاردنیان بەرەو دادپەروەری و تێروپڕی و ئاسوودەیی کردە بەرنامە، ئەگەرچی ماوەیەک دواکەوتن و بە حوکمی ڕوونیی ڕوانینم بۆ سیاسەت و ناپاشکۆیی عەقڵی خەڵکانی تر، دەرکم پێ کرد مەحاڵە وەرزێر و کرێکار باز بدەنە سەر کورسی سەرۆکایەتی دەوڵەت.. درکم بەوەش کرد کە ستالین موجریمە و بە شێوەیەکی بەرفراوانیش دەپەرسترا و ڕای خۆم لەو بارەیەوە لە مەحزەری ئەندامانی لیژنەی ناوچەی کۆمۆنستەکانی کۆیە و پارتییەکاندا تۆمار کرد. خوێنەری هێژا، ئەگەر بۆ ئەم بوونەوەرە عاقڵەی کە پێی دەڵێن مرۆڤ کەشوهەوایەکی ڕوونی وا هەڵکەوێ کە تیادا ئازادی گوێگرتن لە لۆژیک و جیاکاری نێوان ئاوات و جێبەجێکردن و توانا هەبێ و بێ ترسی تاوانبارکردن بە خیانەت و کرێگرتەیی بۆچوونی ناخی خۆی دەربڕێ، ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەنجامی تەندروست و پاکژ و جێباوەڕی بە میقدارێکی سەرنجڕاکێش دەبێ و لەگەڵ کاتیشدا زیاد دەکا تا وای لێ دێ کەس ناتوانێ بەرانبەری بوەستێتەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەو دەستخەڕۆییە تاڵەی شۆڕشگێڕی خەیاڵی خۆیان خەڵکی شارەکەیان و خزمەکانیان لە ئەنجامی دارمانی عەنتەریاتی بۆشی نارەحەتی بێ واتادا بەرهەمی دێنێ، نرخی بێعەقڵی و بێبەهایی و قارەمانێتی بێهۆشانە دەداتە ئەو خەڵکە.. هەموو ئەو قوربانیانەی لە کاتی هەڵچووندا دران دژی خۆیان هەڵگەڕانەوە و ئەوانەی دوای بەندکردن و سووکایەتی پێکردن و لەدەستدانی سەرچاوەی ڕزق و ناچاربوونی بارکردن و مەیلەوە ئاوارەبوون کۆڵیان دا و هەرەسیان هێنا و بوونە ژمارە لە بنکەکانی لێکۆڵینەوە و نازانم چی؟ بە داخێکی گرانەوە دەڵێم ئیعدامکردنی فەهد یەکێ بوو لە هەوڵەکانی پێشگرتن لە توندڕەوی کە دەسەڵاتی سەردەمی پاشایەتی پێی هەستا و لە ڕووی سیاسەتی زیرەکانەوە هیچ بیانوویەکی مەعقوول بۆ ئەوە نەبوو. ئیعدامکردنی چوار ئەفسەری عارەب و چوار ئەفسەری کوریش هەڵە بوو و بە هەموو پێوانەیەک دژی بەرژەوەندی دەوڵەت بوو، چونکە ئەو ئیعدامکردنانە وەک دانانی پشکۆ بوو لە سەر برینی کۆن و گومانیش نییە ئەو هەشت ئیعدامکردنە کاریگەری هەستیارانەی خەڵکیان لەپشتەوە بوو نەک بۆ تەواوی بەرژەوەندی دەوڵەتەوە بووبێ، یا جۆرە هەرەشەیەک بوو لەوانەی بە خەیاڵیاندا دەهات بەرانبەر حکوومەت زماندرێژی بکەن... ناشزانم و لە کەسم نەبیستووە هەڵوێستی ئینگلیز لەو بارەیەوە چۆن بووە ئەمە

دەڵـێم و ژمـارەی کـەمی ئیعـدامکردنی سـەردەمی ئینگلیـزم لەبـەر چـاوە.. دوای شۆڕشـی 1958 بیستمان و زانیمان چۆن ژمارەی لستەی ئیعدامکراوان بەرز دەبووەوە و بەرز دەبووەوە تا وای لێ هـات جەسـتەکان لـە سـەر شـەقام دەمانـەوە و کەسـوکاریان نـەدەوێران بیانبـەن تـا لـە گـۆڕدا بحەسێنەوە!!

دەزانـین مـرۆڤ پێشـدەکەوێ و ئـەو زانسـتانەی لـە بـارەی دۆزینـەوە زانسـتیەکان و ئاشـکراکردنی ڕاستییەکان و سەرکێشان بەرەو غەیب، زەمین و ئاسـمان و ئـاو دەگرنـەوە، وەک میـوە و سـەوزە و دوکـانی بەقاڵـەکانیش دەگرنـەوە، بـەڵام گرژبوونـەوەی دەمـاری شۆڕشـگێڕان و گوێنـەدانیان بـە لەدەستدانی ماڵ و مردنی خەڵک و فەوتانی کێڵگە و ئاژەڵ لەگەڵ ئاوازی فیشەک و هاواری بژێ و بڕووخێ و پرسە و شین و گریاندا، لە پێشەوەی خۆیشاندان و ڕێپێوان و بزووتنەوەی بەرتەسک، بەرەو کارەسـات و ئـەنجامی خراپتـر دەچـن چونکـە ڕێپێـوان بـەرەو یاخیگـەری پـەرەی سـەندووە و خۆپیشـاندان بۆتـە شـۆڕش و سـاڵانێکی بـە سـەردا تێپـەڕیوە تـا ژمـارەی قوربانیـانی جـەنگی نێـوان دەوڵەتە شۆڕشگێڕەکان و شۆڕشگێڕەکان و ئەو دەوڵەتانەت پشـتگیرییان دەکـەن لـە یـەک ملیـۆنی تێپەڕاندووە و خەسارتی مـاڵیش ملیارەها و ملیارەها مسقالە زێڕی بووە، ئـەوجا لـە یـەک بـەرەدا چەندین باڵی نەگونجاو جیا بوونەتەوە و بەرانبەریان لە یەک گرتووە و هەوڵی قڕکردنی هاوڕێیـانی دوێنێی خۆیان داوە. ئەرێ ئەی ئیستیعمارە تێرەخۆرە خێرمەندەکان بەزەییتان بەو براگەلەدا بێتەوە کە یەکتر دەکوژن و ئەو دۆستانەی یەکتری ئەتک دەکەن و ئەو دراوسـێیانەی خەبـەر لـە یـەکتر دەدەن و خەڵکی تریش لەو ڕووەوە کە حەشر لەگـەڵ خەڵکیـدا جەژنـە تێکـەڵیان دەبـن ئەگـەرچی ئەو حەشرە بەرەو دۆزەخ و خراپترین ئـەنجامیش بێ... ئـەی ئەوانـەی سـاڵانێکی دوور و درێـژ بـە شەیتان ناومان دەبردن وەرن ببنە ناوبژیوانی برایان و دۆستان و دراوسـێیان و خـەڵکی تـر کـە لـە (ان)ی قافییەی کۆتایی لایانداوە دەنا بە شێتی و فیتنەیی و مەرگ کۆتاییان دێ..

پێشکەوتنی مرۆڤ لـەبواری زانسـت و هونـەر و ئـەدەب و بیناسازیدا، بەڵگەی هەرەسـهێنانێتی بـە ئەتککردن و وێرانکردن و پێشکەوتنی فێڵبازی و سەرجەلەکردنی کوێر بەرەو (ئەسفەلەسسـافلین): ئەو سەرکردە بـەڕێزە زۆڵانـە لـە پـاکژی و ڕاسـتگۆیی بێـزارن و بـە کزەبـای بەرەبـەیان دەخنکێن.. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە ئەگەر گەلێک دواکەوتوو و پەرتەوازە و بێهێز بێ و کۆمکاری یـەک دەوڵـەتی نـەبێ، واتـە شـەرعیەتی نێودەوڵـەتی نـەبێ و لـە نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا دان بـە بوونیـدا نەندرابێ، گەلی وا ڕێڕەوێکی سیاسی وا دەگرێتە بەر پێچەوانەی هەموو لۆژیـک و بەرژەوەندییەکە چونکـە ئیـرادەی خـۆی لـە دەسـتی خۆیـدا نییـە تـا لـە چاکەکاریـدا بیخاتـە کـار، چونکـە چاکـە و شـەهامەت و کەرامـەت و شـتی وەک ئەوانـە بەمەسـرەفن و هەوڵـدان لـەبن دێـنن و مـەودای

هەڵبژاردن بەرتەسک دەکەنەوە. ئەوەش ڕوونە کە زەحمەتترین ڕێگا بۆ دەستەبەرکردنی خێر و خۆشی و ئاسوودەیی بە بێگومان ڕێگای سیاسەتە، ئەوەش لە بەر دوو هۆکار یا زیاتر: هۆکاری یەکەم ئەوەیە بنەمای کاری سیاسی بەشداریکردنە لە ڕا و بۆچوون و بڕیاردان، هەروەها باشداریکردنە لە کار. ڕەنگە هەبێ بە دوای دەنگی زۆرینەدا بڕوا، بێ ئەوەی کەمینە باوەڕی پێ بێ. هۆکاری دووەم نەهاتوویی و ڕووکەشی و کەمتوانایی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو کادیرانەیە کە دەسەڵاتیان بەسەر حیزبەکاندا هەیە (کە خۆیان لە بناغەدا لە ناو خەیاڵ مەلە دەکەن). حیزبی سیاسی لە دەوڵەتە دواکەوتووەکاندا، کار لە سەر (مەعیشەت) ناکەن، بەڵکو کار لە سەر خەیاڵاتێک دەکەن سەرچاوەیان لە ناو دواکەوتواندا نییە. بۆ خۆشبەختی ئەو سەرکردانەی بە باڵی (عەباسی کوڕی فرناس) دەفڕن، زۆربەیان نوسخەیەکی بەیانی کۆمۆنستی مارکس و بەرنامەی لینین (ترۆتسکیشی لەگەڵدا) دەگوازنەوە بۆ شۆڕش، شۆڕش و هیچی تر. لە بەر ئەوە سەیر نییە دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی لە کوردستان و ولاتە دواکەوتووەکانی وەک خۆیدا نەگونجاو بێ و سیاسییە شۆڕشگێڕەکان یەک خشتیان نییە بخرێتە سەر دیواری چەوتوچێڵەوە و بۆیان هەڵناکەوێ حزبێکی وەها دامەزرێنن بەرنامەکەی بۆ بەرهەمنهێنان و دابەشکردنی بەرهەم بێ. هەموو ئەوانەی بە دووی فەیلەسووفی (بژێ و بڕووخێ)دا دەڕۆیشتن خەیاڵێک ختووکەی هۆشی دەدان ئەوەش ئەوە بوو دەست بە سەر سەروەت و سامانی دەوڵەمەندەکاندا بگرن ئەوەش لە واقعی کوردستانی ئێمەدا کەمە و بەشی بژێوی دوو مانگ یا سی مانگ، تۆ بڵێ ساڵێکی هەموان ناکا. ئەوا بەشی ساڵێکیشی کرد، ئەدی دوای ئەوە! دەستخەڕۆیی ئامانج و پاشەڕۆژ نەبێ، بە هیچ شێوەیەک هیچی تر نییە. حیزبە باوەکانی کوردستانی ئێمە لەو قوڕە نین کە حیزبی کۆمەڵگا پێشکەوتووە بە بۆرژوابووەکانی لێ دروست بوونە. خەڵک لە فەرەنسا یا ئەڵمانیا لێکدانەوەیان بۆ ئەنجامی حیزبە جیاوازەکان هەیە و داهاتیان بەو ئەنجامانە دەپێون ئەوجا دەنگ بەو حیزبە دەدەن کە زیاتر لەگەڵ بەرژەوەندییاندا بگونجێ. حیزبیەکانیش (وەک هەر خەڵکێکی تر لەگەڵ بەرنامەی حیزبی خۆیاندان). شێوازی پڕوپاگەندە لە ولاتە پێگەیشتووەکاندا زمان و قەڵەمە و لەدەوڵەتە بە شۆڕشگێڕ بووەکانیش (ئەعوزوبیللا) فیشەکێکە لە پەناوە و دەمەتیغێکە بە دزییەوە. پێویستە شایەدی ئەوە بۆ سەرکردە شۆڕشگێڕەکان بدەین کە زیرەکن چونکە بە هۆی زۆری تاقیکردنەوەوە فێر بوون هەرچی سەروەت و پلەوپایە و خۆشگوزەرانی لایەقی حیزب بێ بۆ حیزبەکەی دابین بکەن. بەڵام زۆربەی تاقیکردنەوەی ڕووداوەکان دەیسەلمێنن کە هەر بینایەک لە سەر بناغەی ناهەموار دروست کرابێ هەرەس دێنێ و هەندێ دەمرن و هەندێ دەرباز دەبن و بەرزێک نزم دەبێ و نزمێک بەرز دەبێ یا شتی وا ڕوو دەدا کە چاوەڕوان ناکرێ. هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ دەنگی ژن لە حیزبایەتی و شۆڕشگێڕیتی و لیبرالێتی و دابەشکردنی زەوی و سستەمی باج و شێوازی دامەزراندنی حکوومەتدا نییە.. ڕەنگە مایەی دڵخۆشی ژنی کورد بێ ئەگەر باسی ناڕەوایی

هەڵبژاردنی چەند ساڵێک پێش ئێستا بکەین چونکە جگە لەوەی وەرەقەکە دەخرایە کیسەوە و دەرکەوتنی ژمارەی نوێنەرانی ئەم لست و ئەو لست و دانانی مانگانە بۆ ئەم و ئەو و شتی لەو بابەتانە، پرۆسەی هەڵبژاردنەکە هیچ نرخێکی نەبوو. وەزارەتی بەرگری چەقۆیەکی نەبوو پیازی پێ پاک بکا لە کاتێکدا پێشمەرگەی دوو حیزبە ڕکەبەرەکە لە تەوقی سەرەوە تا بنی پێی چەکدار بوو و ئەو چەکەش ئەو سوودەی هەبوو ژمارەی کوژراو و برایندار وماڵوێرانان و تێکشکاندنی پەیوەندی خزمایەتی و لاوازبوونی زانست و کزبوونی ئینتمای نەتەوایەتی زیاد بکا و ئەو لایەنە ئەرێنیانە تێکبشکێنێ کەمرۆڤ لە کەمتیار و گورگ و زێبرا جیا دەکەنەوە. ئەگەر بڵێم ڕووداوەکانی هەڵسوکەوتی نێوان یەکێتی نیشتمانی و دیموکراتی کوردستان ناوەڕۆکی ناونیشانی ئەم کتێبەی بەرجەستە دەکرد کە شێتخانەیە پێت سەیر نەبێ. بۆ ژنان و بێتواناکان خێر و شانازی بوو کە دەسەڵاتدار و دابەشکەری کارەسات ئاوڕی لە نەدانەوە و هەزار شوکر و سوپاس کە ئەوانە لاواز و هەژار بوون و کاریگەرییان لە سەر تەرازووی هێز نەبوون.

بێ ئەوەی بەدواداچوونم بۆ نووسینی ماتریالستە گەورەکان و مامناوەندییەکان لە بارەی وردەکارییەکانی کۆمەڵگاوە هەبێ، سەرنجم داوە لە زۆربەی هەرە زۆری ڕا و بۆچوونەکانیاندا هۆکار بۆ زێدەبایی دەگێڕنەوە کە لە بازاڕی کڕین و فرۆشتن و بەکارهێنان و شتی لەو بابەتانەوە دێ، ئەو تیۆرییە بە ڕای من، نا بە حوکمی واقیع، سەرلەبەری هەر لەبناغەوە ڕەت کراوەتەوە: لە ڕۆژی پێکهاتنی کۆمەڵگەوە خواستی قازانج بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانی خێزان و تەنانەت تاکیش، ناوەڕۆکی شارستانەتی و پارێزەری بووە و ئاوهاش دەمێنێتەوە تا ڕۆژێکی خواستی قازانج پێویست نامێنێ و تەنانەت لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا دەبێتە قورساییەک سەدەیەکی تر.. دوو سەدەی تر... هەزار ساڵی تر مرۆڤ ڕەتی دەکاتەوە. خاوەن بابەت یا خزمەتکردن یا خاوەن هونەر یا تەنانەت دەنگخۆشیش هەوڵ دەدا کەرەسەکەی خۆی بە نرخێک بفرۆشێ لەوە زیاتر بکا کە لێی سەرف کردووە دەنا کارەکەی دەبێتە جۆرە بێعەقڵییەک و تەنانەت ئەگەر فرۆشیار دەستبەرداری قازانج ببێ کۆمەڵگەش تێکدەچێ چونکە بەردەوامبوون لە سەر فرۆشتنی بێقازانج و گۆرانیگوتنی بێ بەرانبەر دەبێتە هۆی ئیفلاسکردن و ماڵوێرانییان و ئیتر شێلم و ڕادیۆ و تەماتە و مەچیر لە بازاڕدا نامێنن و بازاڕ دەبێتە ئەشکەوتی چۆڵوهۆڵ.. گۆرانیبێژیش یا لە برساندا دەمرێ یا ناچار دەبێ ڕاوی ڕێوی و کەروێشک بکا یا بەری ڕووەکی کێوی بڕنێ. بە کورتییەکەی، شارستانەتی هەر لە سەرەتاوە و بە تاڵ و کرمێیەوە قەرداری کرۆکی قازانجە جا با ناوی (زێدەبایی) یا (نەفرەتی فیرعەونەکان) یا (ژەهری غەدر و خیانەت) یا (خەڵەتاندنی ئیستعمار) بێ ـ قازانج پێش ئیستیعمار هەبووە بەڵام زەرەری نییە تاوانی ئیستیعمار لە هەزار و دووسەد ساڵەوە بدرێتە پاڵ بازاڕی شۆرجەوە. من باوەڕم بە توانای زانست و تەکنیک هەیە لە پاشەڕۆژدا

کۆمەڵگەیەک بەرهەم بێنن دەستبەرداری زێدەبایی ببێ وهاونیشتمان خانووی حکوومەتی پێ چاکتر بێ لە خانووی تایبەتی خۆی ئەگەر هەردوویان لە دابینکردنی پێداویستییەکانی خێزاندا لە یەکترەوە نێزیک بن.. خەڵکی ئۆتۆمبیلی تایبەتی ڕەت دەکەنەوە چونکە ئۆتۆمبیلی حکوومەت هەمان ئەو خزمەتە دەکا کە لە ئۆتۆمبیلی تایبەتی چاوەڕوان دەکرێ و بە مەسرەفی کەمتر و بێ گەراج و ڕۆن و بەنزین..

لە بابەتی زێدەباییدا بیانوویەک یا مەتەڵێک یا ئاڵۆزییەک هەیە شیکردنەوە و پەی پێبردنی لە لایەن هیچ دانا و زانایەکەوە نییە کە ئەتۆم شەق دەکا و ئەمەش نموونە:

- ئەحمەد گوڵی هەمەڕەنگ و هەمەجۆری چنین و کردنییە چەپکێکی ئەوپەڕی جوان ئەوجا بە دە دینار فرۆشتی.
- مەحموود گوڵی چنی و کۆی کردنەوە و بەستنی و هەوڵی دا، چەپکەکەی قێزەون بوو و کەس بە یەک درهەم نەیکڕی.
- کیژێکی جوانکیلەی ڕۆحسووکی ئەکتەر بۆ ڕۆڵێکی لە شانۆگەرییەکی کورتدا دە هەزار پاوەنی وەرگرت.
- کیژۆڵەیرکی جوانکیلەی ڕۆحسووک لە تەمسیل نازانێ بە 500 دینار بووە کۆمپارس.
- کیژێکی تر کە نە جوانە و نە تەمسیل دەزانێ دەرکرا.
- یەک کیلۆ ئاسن لە لایەن (س)ەوە کرایە ئوتوو و نرخی ئاسن یەک دینارە و ئوتووەکەی بە 500 دینار فرۆشت.
- کیلۆیەک ئاسن هەڵە لە ئامادەکردنیدا ڕووی دا و وەک ئوتوو ڕۆڵی نەما و خاوەنەکەی فڕەیدایە زبڵدانەوە.
- ئەندازیارێک خانوویەکی بە پێی ویستی خاوەنی و تایبەتکاری دروست کرد وبە پەنجا هەزار دینار فرۆشرا.
- ئەندازیارێک خانوویەکی دروست کرد دیوارەکانی خوار بوون و کەس نەیکڕی.
- یوسف خەتێکی جوانی سەرنجڕاکێشی نووسی و هەزار دینار خەڵات کرا.
- یۆحەننا خەتێکی نووسی و سەرنجی کەسی ڕانەکێشا و لە ڕقاندا دڕاندی.
- کریکارێک لە کاتی دیاریکراودا ئامادە دەبوو و بە ئەمانەتەوە کاری خۆی ئەنجام دەدا.
- کرێکارێک لە کاتی کارکردن دوا دەکەوت و لە کاردا زەغەلی دەکرد.
- کەشتییەکی ئەتۆمی هەموو شتێکی سەرسوڕهێنەری تێدایە و ئەگەر یەک دوو ساڵ لەگەڵ پیشەکارانیدا سەرف بکەیت تا بزانی بە چ نرخێک دەفرۆشرێت تا لە ئەنجامدا بزانیت

زێدەبایییەکەی چەندە و بە هیچ ناگەیت و ئەگەر پرسیار لە کرێکارانی کارگەکە بکەیت کەس ناتوانێ وەڵامت بداتەوە. لە کەشتییەکەدا یەک ملیۆن لایەنی جیاواز هەیە لە شتی هونەرییەوە بگرە کە دەگاتە ئاستی جادوو تا دەگاتە پلیکانە کە پایانترین کرێکار دروستی دەکا... ئەدی چۆن خەڵاتی ئەندازیاران دەکەیت؟ بە چی و تا چ ئاستێک؟

ئەدی چۆن نرخی ترێیەک دەستنیشان دەکەیت کە پێش وەرزی پەیدابوونی ترێ، بە هۆی گرنگیپێدانی ڕەزەوانەوە دەگاتە بازاڕ؟ ئەدی نرخی ترێی ئاسایی کە لە وەرزی خۆیدا پەیدا دەبێ، ئایە ڕەزەوانەکە ڕەنجەدەرە یا ئەویش خوێنمژە؟ بە چ پێوانەیەک کرێی بەرگدوورێکی لێهاتوو دیاری دەکەی بە بەراورد لەگەڵ بەرگدوورێکی مام ناوەندی و یەکێکی ئاستنزمتردا و یەکێکی تر کە لە قوماشەکە دەدزێ؟

دەتوانین لە پیشاندانی نموونەی وادا کە لە شارێکی نیو ملیۆن کەسدا کۆتایی نییە بەردەوام بین. تۆبڵێی کرێی ئەوەی کە زێدەبایی تێدا نییە و ئەوەی زێدەبایی تێدا هەیە چەند بێ ئەگەر کارەکە حەرەسی شەو بێ و پاکژی ئەمیان و پاکژی ئەوانی تر چۆن دەپێورێ و ڕێی تێ دەچێ ئەوانە لەگەڵ ئەوەشدا کرێکارن چەوسێنەر بن!

سەیر و سەمەرەیە! بیرمەندێکی چەپڕەو لەلێکدانەوەی مێژوودا لایەنگری کرێکارە و پێی وایە خاڵی زووڵمی سەر کرێکاری دۆزیوەتەوە و ناوی ناوە زێدەبایی لە کاتێکدا سەد و پەنجا ساڵە دۆزراوەتەوە و بۆتە ئاینێکی ماتریالی و لای چەپەکان پیرۆزی دەوری تەنیوە و تەرازووی هێزی بە دامەزراندنی دەوڵەتی کرێکار و وەرزێر، کە پێی دەگوترا سۆڤیەت، گۆڕی و نێزیکەی حەفتا ساڵ ژیا کە زۆرترین قینی لە ئازادی بوو، ئازادی سەری دەسەڵات نەبێ. لەگەڵ کرێکاراندا توندوتیژ بوو و لەگەڵ وەرزێرانیشدا توندوتیژتر بوو و لە هەموو دەسەڵاتێک کەمتر گرنگی بە ئاسوودەیی بێتاوانان دەدا، ئەوجا هەرەسی هێنا بەڵام دەروێشەکانی لە ڕووبەرێکی زۆر فراوانی زەویدا هەتا ئێستاش بە یادی ستالین حاڵیان لێ دێ و ئامانجە خەیاڵیەکان لای دەستەیەکی فراوانی خاوەنی کەمترین توانا و سامان و پلەوپایەی  کورد وەها جێگیر بوون سوورن لە سەر وابەستەبوون بە زێدەباییەوە وەک بزوێنەری شۆڕشی هەژاران و دەربازبوونی غەدرلێکراوان لە کاتێکدا چەپی ئەورووپا دەیان ساڵە، لە بنەڕەتەوە دەستبەرداری شۆڕشی چینایەتی بوونە و ڕێبازی دیموکراتی (بۆرژوا)یان بۆ پاشەڕۆژ هەڵبژاردووە! ئەگەر چەپڕەوێکی کورد بۆی ڕەخسا نموونەیەکی ڕاگەیاندنی مێژوو لە بارەی مەرجەکانی سستەمی کۆمۆنستییەوە بخوێنێتەوە، دەبینێ ئەوەی لە هەموو شتێک بۆ ئەو سستەمە پێویستترە ژێرخانێکی بەهێز و ڕابردوویەکی یەک دوو سەدەیی

شارستانەتی و پیربوونی بۆرژوایە، دوای ئەوە سۆسیالیزم لەبەر ئەوەی توانای بەدەنگەوەچوونی ئەو واقعە پێشکەوتووەی نییە کە بە بێ کەمترین هەڵچوون و وڕێنەیە، بە پێی یاسای پەرلەمان، داوای چەسپاندنی یەکسانی بۆ هەموان دەکا. ئەگەر چەپڕەوی کورد ئەو ڕاستییە تۆقێنەرە ببینێ حاڵی لێ دێ و گڕکانی تووڕەبوون لە بۆڕییەکانی خوێنیدا دەتەقێتەوە و تەرازووی ڕاست و چەپ ژێروژوور دەکا و تێکەڵیان دەکا تا هەموویان ببنە حەیزەران و قامچی، ئاگر لە سەر پشتی مرۆڤ و مانگا دەکاتەوە تا ڕۆژێکی تەزووە ئاگرینەکەی خۆی بەتاڵ دەکاتەوە و سارد دەبێتەوە و دەبێتە کۆمەڵێ گۆشت و ئێسقان و پێستی بە سەر یەکدا کەوتووی بێ ڕۆح. چەپڕەو دەبینین لە هەر وڵاتێکدا دروشم و هیتافەکانی لێ قەدەغە بکرێن مێش لە لووتی خۆی پاس ناکات و ئەگەر کەشوهەوایەکی گونجاوی وەک ئەوەی سلێمانی و هەولێری بۆ هەڵکەوێ، خەڵکی خۆی کۆدەکاتەوە کە ژمارەیان بیست سیی کەسێک یا سەد کەسی سەردەمی برەوسەندنی ئەو ڕۆژانەن کە لە کەرکووک و موسڵ خەڵکیان بە پەت ڕادەکێشا و دروشمی (عاش زعيمي عبدالكريمي، حزب الشيوعي بالحكم مطلب عظيمي) شەو و ڕۆژ دەنگی دەدایەوە.. بە چاوی خۆم دیومە گەنجی ڕاپەڕیو لەدۆزەخی نەفامی و هەڵچوون هاتۆتە دەرێ و لە موناسەبەیەکدا خەنجەری هەڵکێشاوە بە هاوڕێکانی گوتووە: من بۆ قەسابخانەیەک ئامادەم تیایدا نەتەوەییە خائینەکان لەناو بەرین، ئەوەش لە تۆڵەی لافیتەیەکی نەتەوەییەکان کە لێی نووسرابوو (بەرگدوورەکانی کوردستان خێرهاتنی فڵانە کەس دەکەن) ئەوجا دایانگرت و لە خۆڵیان وەردا و ئەگەر کەسێکیش فزەی کردبا مەسەلەکە گەورە دەبووەوە.. کوردستان ئەو کڵۆڵانەی تا ئاستی شێتبوون دەورووژاند و دەتگوت نیشتمانی کورد لەناو هەموو نیشتمانانی دنیادا یەکپارچەیی چینی کرێکاران لە عیراق و ئێران و تورکیا.. کەرکەرت دەکرد.. خوایە لە قەومەکەم ببورە چونکە نازانن!!

مەسەلەی زێدەبایی یەکێکە لەو بابەتانەی ئەو نووسەرانە داگیر دەکا کە بیر لە کارەساتی بە هەڵەبردنی تیۆری زێدەبایی دەکەنەوە، چونکە قووڵاییەکی هەیە بە قووڵایی ملیاردەها لەو بەشەرانەی کە باوەڕیان پێی هەیە و بەرینییەکی هەیە کات و شوێن و مرۆڤ و تەنانەت (ئاژەڵیش)ی بە بێ ئامانج و کۆتایی تێدەچێ و تەنانەت سەرەتای کۆمەڵگەی مرۆڤیش دەگرێتەوە. ئەگەر بە قودرەتی قادر بزوێنی زێدەبایی ڕەت بکەیتەوە کۆمەڵگەی مرۆڤ و شاری مرۆڤ و شارستانەتی مرۆڤ و دابەزینی مرۆڤ لە سەر مانگ ڕێی پەیدابوونیان نەدەبوو و تەنانەت گەمەی تاوڵە و سێباز و حەکایەتەکانی مەلا نەسرەدین و لێنانی شلەی شێلم پەیدا نەدەبوون و مرۆڤ ڕێزمانی نەدەزانی و نەیدەزانی تا سەد بژمێرێ و تەنانەت باوەڕ ناکەم ئەو ژمارانەی دەیانناسین ڕێی لەدایکبوونیان ببوایە ئەوەش لەبەر ساکارترین هۆ کە خوا خەلقی کردووە ئەوەش ئەوەیە وزەی قازانج خەڵکی بۆ مشەخۆری بە دەوری یەکتردا کۆ کردۆتەوە و تەنانەت لە گرنگی

زێدەبایی پاراو نابم: ڕەنگە بە جۆرە لەخۆبردنێکەوە و بۆ نێزیککردنەوەی بابەت لە بۆچوونە مەعقوولەکانی خوێنەر بڵێم ئەگەر بوونی ئاو لە بووندا نەهێڵی پێویست نامێنێ بڵێی گۆشتی ماسی و قیرەی بۆق و حەوت دەریاکان و بارانی ئاسمان و بەفری هەردوو جەمسەرەکە و بیری ئیرتیوازی و فرمێسکی چاو و تەڕیی لیک و... و... تا کۆتایی ملیۆنان (و) هیچیان بوونیان نابێ. وێنەکە نێزیکتر دەکەمەوە و زێدەبایی بە ڕاکێشانی زەوی دەچوێنم کە ئەویش بوونێکی هەستپێکراوی نییە و ئەگەر نەشبوایە زەوی بە دەوری خۆردا نەدەسووڕایەوە و لاریی تەوەری زەویی نەدەبووە جێگای باس چونکە ڕاکێشانی زەوی بنەمای لاریی و نالاریی تەوەر و دووریی ئەستێرە جێگیر و گەڕۆکەکانی لە یەکترەوە دروست کردووە. لەگەڵ خۆتدا هەوڵ بدە جێگایەکی تر لەو جیهانەدا بۆ مانگ دەستنیشان بکەی دەبینی ناتوانیت. ماوەتەوە بڵێم وابەستەبوونی مارکسی بە زێدەبایی نەفرەتییەوە لە شیکردنەوەی مێژوودا بە تەمێکی سۆفیگەرانەی غەیبی داپۆشراوە و لە بزوێن و بەربەست و دژەبەری تری دادەبڕێ و ئەوەش لە مرۆڤدا جێی سەرسوڕمان نییە چونکەیەکێ خانووەکەی دەفرۆشێ و بە باوەڕەوە دەچێتە گەمەی ڕەیسزەوە. تەنانەت ئەو گیاندارانەش کە هۆگری بەشرن لەگەڵ ڕەفتار و خووگەلێکدا ڕادێن و پێیان ئاسوودە دەبن. لە یەکێ لە ساڵەکانی هەڵچوونی مارکسیزمدا بە چاوی خۆم لە کۆیە دیتم پیاوێک جگەرەی لەفی دەپێچایەوە (دەیانگوت تووتنەکەی لە چاکردنی تووتن دزرابوو) و دەیگوت: داکی ئەوە وا وا لێ بکەم بڵێ کورد ئەممەیە.. بەو قسەیەی جەختی لە سەر تیۆرییەکەی ستالین دەکردەوە کە چەند مەرجێکی نەتەوەبوونی بۆ گەلان دانابوو و یەکێ لەو مەرجانە ئەوە بوو نیشتمانی تایبەت بە خۆی هەبێ. کۆمۆنستەکان دابەشبوونی کوردستانیان بە سەر سێ بەشدا کردبووە بەربەست لە بەردەم نەتەوەبوونی کورددا. وەڵامی من بۆ ئەو کوفرە زەقە ئەوە بوو کە کورد بەو دابەشبوونە مافی هەیە سێ دەوڵەتی هەبێ و هەر بەشێک لەو سێیە خاکێکی وابەستەیە بەوانی ترەوە و گەلێکیان تێدا دەژێ کە لە نیشتمانی خۆیدا کەمایەتی نییە.. نەفرەتی مێژوو و نەفرەتی نەفرەتکەران لەوانە بێ کە درۆ هەڵدەبەستن و بوختان دەکەن و داتاشین دەکەن و ڕەواج بە هەڵەکاری وا دەدەن کە مرۆڤێک ڕێزی کەرامەتی مرۆڤ بگرێ لووتی خۆی لە بەریان دەگرێ. بەڵام سەیر لەوەدا بوو مارکسییەکان خەسڵەتی نەتەوایەتییان لەو ئەڵمانییانە نەدەسەندەوە کە لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەژیان چونکە ئەوانیان وا دانابوو دانیشتوانی بەهەشت بن و لە ئاوی کەوسەری دەخۆنەوە.

ئەو چەواشەکارییەی دەوری دەماغی نیمچەبەشەری باوەڕدار و بێباوەڕ و مارکسی و دەروێش و شەیدای لەنجەی جوان و دەلاڵی هاواری دڵگیر دەگرێ، بە هەموو ڕێیەکیاندا دەبا ڕێی ڕاست نەبێ و بەرەو هەموو ئامانجێکیان دەبا ڕووناکایی نەبێ: ئەوەش زۆرزانی ناوێ چانکە ئەرکی چەواشەکاری ئەوەیە ئاماژە بۆ جێیەک بکا مەبەست نییە، بەڵام ئەو داخەی کە دەبێتە سەرباری

داخـەکانی چەواشـەبوونی ئەوانـە ئەوەیـە زۆرزانـانی بەشـەر جلـی ئـەوان لەبـەر دەکـەن و بـە زیادەڕۆییەوە باوەڕیان بە لای خۆیاندا دەبەن تا دایاندەدۆشن و تەڕاییان دەمژن و بۆ مەبەستی خۆیان ڕایاندەپەڕێنن و کە گەیشتیشنە مەبەستی خۆیان، وەک توێکڵە گوێز تووڕیان دەدەن.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئەوە بڵێم زۆر حاڵەت هەیە بە حاڵـەتی زێدەبایی دەچێ، وەک ئـەوەی بـەقاڵ میـوە لـە کێڵگـە بکـڕێ و بـە نرخێکی بفرۆشێ کـە لـەنرخی کڕینەکـەی زیـاتر بێ چونکـە ناچـارە مەسرەفی گواستنەوە و قازانجێـک کـە پێـی بـژێ بخاتـە سـەری. ڕەنگـە میوەیـەکی نایـابی دەسـت بکـەوێ دووقـات قـازانجی لـێ بکـا. ئایـە ئـەو بەقاڵـە خـوێنمژە؟ ئـەدی ئەگـەر تـەنها بـە کرێکـار و وەرزێـری بفرۆشـێ خـوێنمژە؟ ئـەدی ئـەو کرێکـارە دەبێتـە چـی ئەگـەر ڕۆن و بـرنج و نیسـکی بـۆ بەقاڵەکە هەڵگرت و پارەی زیاتری لە کرێی ئاسایی وەرگرت؟ یـا کرێکـار لـە ڕەگـەزی بۆرژواکـان نییە؟ ئەدی ئەگەر بۆرژوا ئیفلاسی کرد دەبێتە چی؟ ئەگەر کابرایەک ئەمانەتێکی بۆ شارێکی تـر بـە کابرایـەکی چەکـداردا نـارد چارەسـەر چـۆن دەبـێ؟ ئەگـەر چـەک هەڵنـەگرێ؟.. لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا کرێی یەکە یا دوو شێوەیە و ڕێژەی جیاوازییان چەندە؟ کەسێ لە ماڵەکەی خۆیدا، بە کـرێ هـەرزەکاران فێـری خـەت و قورئـان دەکـا: شـێرکۆ لـە سـەرەتاوە و ئامۆزاکـەی لـە کۆتـایی لستەکەدا دێ.. ئـەو دوو کرێیـە چـۆن دەبـن؟ دوو سـوار پێشبڕکێ دەکـەن و لـە سـەر خەڵاتەکـە پێکدێن: ڕێی پێکهاتن و ڕازیبـوون بـە میقداری خەڵاتەکـە هەیـە یـا بـراوە خـوێنمژە و دۆڕاو وەک کرێکار خوێنی مژراوە؟ خۆ دەزانین کرێکار بە پێکهاتن لەگەڵ خاوەنکاردا کار دەکا بەڵام زێدەبایی هەر وەک خۆی ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی حەججی ماتریالی و لە ئەستۆی بۆرژوادا دەمێنێتەوە.

گرنگی و مەترسی (زێـدە...) لـە خـودی مارکسـیزمدا بـە گردەبڕیـی دیـارە چونکـە دەزانیـت هـەموو سەردەمی پێش موڵکداریتی کۆمۆنیزمی سەرەتایی بووە و مەرجیش نییە ئـەو کۆمۆنستییە نـاوبراوە دادپەروەرانە بووبێ. بەهێز توانیویەتی بـەشی لاواز زەوت بکـا یـا ئـەو قەڵەڕەشـەی لـێ بفڕێنـێ کـە ڕاوی کردووە، واتە ئەو حاڵەتەی کە زێدەبایی تێدا نییـە. بـەو پێیـە پاڵنـەری بەدەستهێنانی قـازانج یەکەم ڕووناکایی بوو لە سەرەڕێی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا چونکە ڕاو، بۆ نموونە، کارێکـە مـرۆڤ و گورگ و ڕێوی... ئەنجامی دەدەن و زیرەکییەکی لە ڕادەبـەدەری نـاوێ بـەڵام ئەگـەر مـرۆڤ لـە پێش سەردەمی زێدەباییدا ڕاوی بکردایە نێچیرەکەی بە شتێکی تر دەگۆڕییـەوە کـە پێویسـتی پێـی بـوو. بـەوەش ژیرییـەکی دەرخسـتووە نیـوەی مـەودای نێـوان ڕاو و زێدەباییـە و مـەرجیش لـەو گۆڕینەوەیـەدا کـە نیشـانەی زیرەکـی بـێ ئەوەیـە لـە ئـەنجامی ڕازیبـوونێکی ئازادانـەوە بـووبێ و مەبەست قازانج بووبێ نەک بە ڕێکەوتنێکی کوێرانە.

ئاژەڵ بۆ خۆپارێزی و بەردەوامی وەچە و پەیداکردنی خۆراک ڕەفتاری خۆیان هەیە: فیڵی ساکار بۆ پەیداکردنی خۆراک، پەنای بۆ دەبەن، وەک ئەوەی پشیلە بۆ ڕاوی مشک خۆی بە مردوو پیشان بدا، یا ڕێوییەک چاڵێک هەڵبکەنێ تا ئەگەر گیانداری لاوازی تێبکەوێ نەتوانێ لێی دەرچێ یا قەتییەک بۆ پارستنی بەچکەکانی،کە پشیلە یا ساگێکی لێ پەیدا دەبێ خۆی بە نەخۆش پیشان دەدا تا تەماح لە خۆی بکەن، ئەوجا بە دەم پیشاندانی لاوازییەوە دوور دەکەوێتەوە و ئەویش دووی دەکەوێ و نە دەیگاتێ نە لێی هیوابڕاو دەبێ.. فیڵی ساکار کە دەلالەت لە زیرەکی بکا و گیانداران بەکاریان بێنن گەلێ زۆرن بەڵام نابنە بنەما بۆ فیڵی گەرەتر. باری خۆمم بۆ دۆزینەوەی ڕێی دەربازبوون لەکۆمۆنیزمی سەرەتایی قورس کردووە و جگە لەڕێی (قازانج) و (زێدەبایی) کە دووەمیش شێوەیەکە لە شێوەکانی قازانج، هیچی ترم چەنگ ناکەوێ. ئەمە بۆ دەرخستنی هێزی قازانج دەڵێم لە پێشکەوتنی شارستانەتیدا، چونکە هەیە خانوو بۆ خۆی دروست دەکا و نایفرۆشێ و زێدەبایی، ئەگەر ڕاست بێ لەوەدا هەبێ، ڕێی تێدەچێ نرخی کەرەسە بەرز بێتەوە و خاوەن خانووەکە لەوە زیاتر سەرف بکا کە چاوەڕوان دەکرێ ئەوجا هەرزانی دەبێ و نرخی کەرەسە دادەبەزێ بە خانووەکەشەوە، لەوەدا زێدەبایی شاراوەیە و تا ڕۆژێکی خانووەکە تێکدەچێ کەس نابزوێنێ. ئەو بازرگانی وابەستەیی و جۆرە کشتوکاڵ یا قوماش یا ئاژەڵ یا مەکینە.. یا.. یا.. کەم نین کە زەرەریان لێ کراوە و کەسیش گلەیی لە خەڵکی تر لەو زەرەرانە نەکردووە. لە ڕاستیدا کرێکاران، تا مارکس بە بیرۆکەی زێدەبایی وەک بزوێنەرێک لە دژی بۆرژوا مێشکی پڕ نەکردن، بیریان لە زێدەبایی نەکردۆتەوە. ئەگەر سەرانی حیزبی بەلشەڤی شۆڕشیان بە شێوەی جڵەوسازی ئاڕاستە نەکردایە، کرێکاری شۆڕشگێڕ لەوە زیاتری نەدەزانی دەست بە سر ماڵی دەوڵەمەنددا بگرێ و لە واقعی دواکەوتەیی وڵاتەکەماندا دەستپێشخەرییەکی شارستانیمان لە کرێکار و ناکرێکار نەدیوە و ئەوەندە بەسە کە (ڕۆشنبیر!!)ان، کاتێ فرسەتی سیاسی ئەوەیان بۆ هەڵکەوت ئارەزوو تێر بکەن و ویستی خۆیان بسەپێنن، بەرەو مەیلەو نەخوێنداری گەڕانەوە.. وەی لەو شۆڕشگێڕەی کە دەسەڵاتی بەدەست هێنا، هەموو عەموود و دیوار و پرۆژە و ئامێرێکی کە هەڵبکەندرێ، هەڵکەند و بە نرخی خۆڵ فرۆشتی.. بینای پێشکەوتوویان ڕووخاند و وێرانەکەیان فرۆشت و جەماوەری نەفامیش لەو کۆمیدیای ناخواییەدا بەشدارییان کرد و لە کاتی چوونەژوورەوەیاندا بۆ ناو بینایەکی ئامادەی تاڵانکردن کە لەگەڵ تۆپدا وێران ببوو، لە تاو نێچیرێکی قەڵەو ڕۆحی خۆیان دەخستە مەترسییەوە، ئەگەر نرخەکەی لەدەستدانی باسکێک یا لایەکی شەویلەش بووبێ.. پرۆژەیەکی سەر ڕووبارێک کە پتر لە یەک ملیارد دیناری تێچووبوو بە دە ملیۆن کەمتر فرۆشرا.

گوتوویانە شۆڕش وەک داغکردن دواچارەسەرە، ئەوەش قسەیەکی بەجێیە و پیاوی عاقڵ دایانڕشتووە و باوەڕ دەکەم ئەوانە نیازیان چاکەی خەڵک بووە و ئەگەر سەرکردایەتی شۆڕشیان

بکردبا کەمترین توندوتیژی تێدا دەبوو، بەڵام: جەماوەری ڕاپەڕیو بۆ گۆڕینی دەسەڵات دارێژەری ئەو قسەیە نین و لە ئاستی عەقڵی ئەوان و نەرمونیانی ڕەفتاری ئەواندا نین و دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم ئەوانەی هەڵڕژاونەتە سەر شەقامەکان ئەو پارەویان پێ خۆشە لە خوێن وەردرابێ و دوکانی سووتاویان پێ چاکە.. جەماوەری بەغدا لە 14ی تەمموزی 1958 ماڵی بنەماڵەی پاشایەتی و نووری سەعیدیان ڕووخاند و چاکتر بوو ئەو ماندووبوونە نەدەنە خۆیان کەچی ماندووبوونی خۆیان بەوەش زیاد کرد لاشەکان ڕابکێشن! تاوانی ئەوانە چی بوو؟ ئایە ئەوانەی دوای ئەوان هاتن باشتر بوون؟ ئایە عیراق لە ماوەی ئەو چل ساڵەی دوای شۆڕش حەسایەوە؟

هەندێ لە بیرمەندان! هەروەها نووسەران! دڵداری لەگەڵ شۆڕشدا دەکەن و یەکێکیان لە شیعرێکدا لە بارەی دەستەی دەسەڵاتداران و دەوڵەمەدان گوتوویەتی:

کەللەی سەریان دەکەینە تەپڵەکی جگەرە

منیش بە گونجاوم زانی بێ ئەوەی گوێ بە وەزن و قافیە بدەم، ئەمەی بۆ زیاد بکەم:

ڕیخەڵۆکەکانیشیان دەکەینە سۆندەی نێرگەلە!!

ئەوە بە زەوقی شۆڕشگێڕە.

وەک دەڵێن قسە قسان ڕادەکێشێ، مانگرتنی کرێکارانی کانە خەڵووزەکانی وێلز لە بەریتانیا بە بیر دێنمەوە کە پێش چەند ساڵێک ڕوویدا. مانگرتنەکە یاسایی بوو و ڕێیان لە حکوومەت گرت کانەکان بخاتە کار و ئەو بەزمە ماوەیەکی زۆری خایاند و وەک لە بیرم بێ، حکوومەت 700 ملیۆن پاوەند زەرەری لێ کەوت و کرێکارەکانیش هەموو مافەکانیان بەدەست هێنا. من دڵنیام شۆڕشگێڕ کرێکارانی وێلز تۆمەتبار دەکا بەوەی کە ناشۆڕشگێڕن چونکە شۆڕشگێڕ پێش هەموو شتێک دەیەوێ حکوومەت بڕووخێ و خەڵک بکاتە شۆڕشگێڕ و نموونەی ئازایەتی و عەنتەریات بێنێتەوە!

ئەو پەراوێز و نووسین و لاقرتێیانەی لە بارەی شۆڕشی فەرنساوە نووسراون زۆرن و هەندێکیان پێداهەڵدانن و هەندێکیان ڕەخنەن و هەندێکیان بێلایەنن و لاپەڕەی داخراو لە سەر ڕووداوەکان هەڵدراونەتەوە. بە بۆچوونی من، شۆڕش بە شێوەیەکی گشتی بزووتنەوەیەکی توندوتیژە و خەڵکانێک پێی هەڵدەستن مجێزی جیاوازیان هەیە بەڵام بە پلەی جیاواز لە توندوتیژی تەبیعەتدا کۆ دەبنەوە و بزوێنەریش پەیوەندی بە کاروباری زۆرینەی خەڵکەوە هەیە. بە پێی سوود و زەرەر

لـه سـەرکەوتنی شۆڕشـدا لایـەنگری و دژایـەتی تێدەکـەون. لـە سـەرەتاوە دەڵـێم کـە مـن دژی شۆڕشێکم خەڵکی نەفام و خەڵکی سۆزدار (لاوان و خوێندکاران..) و ئەوانەی نازانن دەبێ لـە جێی ئـەو بارودۆخـەی کـە هەیـە چـی هـەبێ و خـەڵکانێک کـە ئامـانج و مەبەسـتی خۆیـان هەیـە یـا بەکرێگیراون یا قین لەدەڵن، پێی هەڵسن. جگە لەو ڕایە هیچی ترم نییە چونکە من ئەگەرچی زانیـاری غـەیبم بـۆ سبەینێی چارەنووسی شـۆڕش و جـەنگ و بزووتنـەوەی تونـدوتیژ نییـە بـەڵام سوورم لە سەر ئەوەی کەشۆڕشەکانی ڕابردوو هەموویان لە گەیشتن بە ئامانجیی ڕاگەیەندراویان شکسـتیان هێنـا و ئەوپـەڕی سـەرکەوتنی هەنـدێکیان ئـەوە بـووە چەنـد کەسـێکیان بـاوەڕی ورووژێنـەریان هـەڵگرتووە تـا ئەگـەر بۆیـان لـوا بـە سـەر دەسـەڵاتدا زاڵ بـن ئەوانـە دەبنـە پاشا و سـەرۆک یـا دکتـاتۆری تونـدتر لـە ڕووخاوەکـە یـا کوژراوەکـە یـا هەڵکەندراوەکـە. نموونـە لـە بەلشـەڤیکەکان و شۆڕشـی 14ی تـەمموز (تـەمموز و بزووتنـەوەی جـەمال عەبدولناسر ئینقلابی سـەربازی بـوون و بەرهـەمیان نـەبوو بـە تایبـەتی 14ی تـەمموز، چ کارەسـاتێکە) بەلشـەڤیک بزووتنەوەی خەساندنی هەموو کەسی ڕووسیای قەیسەری بوو و ئێستا ئەوەندە برسییە بە ئاسانی مانگانەی خەڵکی پێ نادرێ. قەیسەری ڕووسیا نـە وەک لینین تونـدوتیژ بـوو نـە دەکرا وەک ئـەو توندوتیژ بێ. ستالینیش هەر باس ناکرێ..

لە بارەی سەرکردایەتی لینین و دارودەستەکەیەوە بۆچوونێکم هەبوو لە کۆتاییەکانی بەشی دووەمی کتێبی (مرۆڤ و دەوروبەر)دا تۆمارم کردووە لە ڕێی هەڵسـەنگاندنی ڕایـەکی پلیخانۆفـەوە لـە سـەر شۆڕشی فەرنسا کە لایەنگری لێ کردووە و پێی وایـە هەسـتی بـە خـۆی و ئامـانجی خـۆی کـردووە لەکاتێکدا خۆی نەیتوانی لەگەڵ شۆڕشی بەلشەڤیدا دەربەرێ، ئەو نرخاندنەم بە لاوە لەو نرخاندنە زیاترە کە من بۆ شۆڕشی فەرەنسا هەمەبووە. ئێستا دەبـێ قسـەکەم دووپـات بکەمـەوە کـە مـن بـە قەوارەی ئەو قوربانیانەم نەزانیبوو کە لینین لە کاتی پێکهاتنیدا لەگەڵ ئەڵمانیا دابـووی لـە کاتێکدا ئەو ناچارە نەبوو چ چارەیەکی تری نەبێ و لە ناو کرێکارانیشدا، وەک لێرە و لەوێم زانیوە نارەزایی هەبووە.

لە سەر شۆڕشی فەرەنساش دەڵێم ڕاستییە زەقەکان ئەمانەن: 1ـ هەڵچوونی گشتی. 2ـ سەرکردەی زۆر. 3ـ ململانێ لە ئامانجدا. 4ـ ململانێی دوژمنکارانەی نێوان حیزبەکان. ئەوانە ئیعدامکردنی پاشا و وەلانـانی ئاینییـەکانیان بـە دەسـت هێنـا و ناپلیۆنیـان هێنایـە سـەر دەسـەڵات کـە لـەو پاشـایە توندوتیژتر و خۆویستتر و بەنازتر بوو کە ئیعدامیان کرد. شەڕەکانی ناپلیۆنیش هەرچۆنێ بووبن لە پاراسـتنی کەرامـەت و پـەیڕەوکردنی دادپـەروەری و لاوازکردنـی دەرەبەگـدا ناگەنـە وێرانکردنـی شـارەکان و لـەناوبردنی خـەڵک و دەربـەدەرکردنی ملیۆنـەها کـەس... پرسیارێکی هێنـدەی مێـژوو

گەورە ڕاست دەبێتەوە: ئەگەر گەلی فەرەنسی لە ستەمی شا بێزار بوو بۆچی لە خۆی هەڵگەڕایەوە و کڕنۆشی بۆ ناپلیۆنی ئیمپراتۆری داگیرکەری وێرانکەری ئیپراتۆر برد کە بۆ خوشک براکانی خۆی بوو و کاتێ لە مەنفاش گەڕایەوە، دیسان هەموو فەرەنسا کڕنۆشی بۆ برد... سەیرە مەدحی ئەو شۆڕشە ناوبراوە بکرێت و بە سەکۆی گەلان دابندرێت و ببێتە بزوێنەر بۆ ڕەتکردنەوەی ژێردەستی وفەرنسا خۆی بووبێتە دەوڵەتێکی ئیستعماری، کە لە فراوانی دەسەڵاتی لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا، لە لەدوای بەریتانیاوە دێ تا ئەوەی میری شاعیرانی عارەب، ئەحمەد شەوقی لەسەر ڕەزیلکردنی سووریا لە لایەن فەرەنساوە دەڵێ:

لە بەر ڕۆشناییەکەی گەلان ئازاد بوون
چۆن کۆیلەداری لە سایەیدا دەکرێ

ئەوجا قەسابخانە بەناوبانگەکەی حکوومەتی عەلەوی لە حەما هات کە بەشێک بوو لە کیانی خۆی.

شۆڕشی کۆمۆنستەکان لە چین لە سەرەتادا لە لایەنی پاکژی و مرۆدۆستی و گوێنەدان بە خۆ لە پێناوی نەتەوەی چیندا بە ئاهەنگی پاڕانەوە و پیرۆزی و دابڕان لە سەرنجڕاکێشەکانی ژیان دەچوو و یەک دوو ساڵێک دوای بەدەستهێنانی دەسەڵات ئاوها مایەوە ئەوجا گاڵتەجاڕی و دابڕان و جیابوونەوەی باڵ و بۆچوونی جیا پەیدا بوون و هەر یەکە و ئەوی تری تۆمەتبار دەکرد تا ئەوەی ماو سەرەککۆمار، هاوڕێی سیی ساڵەی خۆی بە گەورەترین خائین و پیاوی ئیستعمار لە قەڵەم دا.. ئەوجا تاج لەسەرنان بە کوشتاری مەیدانی سووری پەکین کۆتایی هات.. لەکتێبی State of the world دا لە سەر ڕێگاوبان و گەیاندنی جیهان بخوێنەوە تاکی ئەمەریکی ئاوها دەبینی: ساڵی 1970 هەر مرۆڤە و ئۆتۆمبیلێکی بەرکەوتووە. ساڵی 1980 بۆ 1/9 کەس و ساڵی 1986 بۆ 1/8 کەس لە کاتێکدا بەشی سینییەکان ساڵی 1986 بۆ 1374 کەس یەک ئۆتۆمبیل بووە[12]. کتێبەکەش کۆمەڵێ پسپۆری هەر یەکە ولە بوارێ خۆیدا نووسیویانە و پێش هەموویان، دوو ناو هەن: Lester R. Brown و Alan Durning و لەو چەند دێڕەدا نەبێ هیچیان ناناسم.

لە دوای دووەم شەڕی جیهانییەوە، حیزبی کۆمۆنست دەسەڵاتی چینی لە دەستدایە و واتە ساڵی 1970 بیست ساڵ بوو دەسەڵاتی لە دەستدا بوو و ئەگەر توندگرتنی باوەڕ نەبوایە کە پێش بە وزە

و داهێنانی داهێنەران دەگرێ ئەنجام شتێکی تر دەبوو. خۆزگە لەسەرەتاوە هەڵسوکەوتی بەو جۆرە بوایە کە ئێستا لە هۆنگ کۆنگ هەیەتی، بێ فەلسفەگەرایی و هێنانەوەی بیانوو.

بە کورتییەکەی، بزووتنەوەی توندوتیژ وەک چوارشەمەسووره و تەماشاکردنی (شاهد ماشافش حاجه)[*] نییە تا بزە بخاتە سەر لێو. لە ئاستی نێودەوڵەتیدا تەماشای دەوروبەری خۆت بکە دەبینی توندوتیژی شۆڕشگێڕی و ڕەگەزی گەردەلوولی خستۆتە شوێنی توندوتیژی و دەوروبەریەوە و دنیا بە ڕۆڵەکانیەوە خەریک دەکا یەکێکیان یا هەموویان هیچ خێرێکیان تێدا نییە ئەوە نەبێ قازانجی چەند قات دەچێتە گیرفانی چەکسازانەوە چونکە جەنگاوەران زۆر پێویستیان بە کەرەسەی کوشتن و خۆپارێزی هەیە. وا دیارە بەردەوامبوونی ئارامیی بارودۆخ وەک ئەوەیە وێنەی بازنەیەک بە بێ پورگال بکێشیت یا هێڵێکی ڕاست بە بێ ڕاستە بکێشیت.. سەرچاوەیەکی بەهێزیش دێتە ناو مەسەلەکانەوە ئەوەش هی تێکۆشەرێکی ئاینییە (هەر ئوممەتێک هات نەفرەتی لە دەستەخوشکەکەی خۆی کرد) کە پێی وایە لە لایەن خواوە تەکلیف کراوە کە ڕێگە لە سەرچاوەی کوفر بگرێ و دینێکیش نییە خۆی بە هەق نەزانێ و لەخواوە نەبێ یا هەڵبژاردەی داد نەبێ: خوایە زاڵم بە گژ زاڵمدا بکەی!

شۆڕشێک نابینم بە یەک شێوە نەبێ، لە ڕووی ژمارەوە بوونی خۆی دابین بکا، ئەو شێوەیەش: تێکۆشانی نەتەوایەتی بۆ دەربازبوون لە دەسەلاتی دوژمنی زۆردار. دەسەلات بە سەردا گرتن لە ڕاستیدا داگیرکردنی بوونی لایەنی چەوساوەیە، چونکە لایەنێک دەسەلاتی بە سەر خاکی خەڵکدا بڕوا، هەر بەوە ڕازی دەبێ بە یەکجارەکی یا لەبەرەوە پارچەپارچەی بکا و ڕەنگە بەوەش ڕازی بێ لە پێستی خۆی دەرچێ و بچێتە پێستی لایەنی بەهێزەوە. ئەوە باوەڕی گردەبڕی بە بەڵگە و واقع سەلمێندراوی منە و زۆربەی ئەوانەی بڵاو دەکرێنەوە و بە قسەی شیرین و ختووکەدانی هەست پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرێ لە ئاسیاوی واقیعدا دەبنە بەردێکی نەقارێکراو بۆ هاڕین ئەوەش لەبەر هۆگەلێک لە بنەڕەتدا لە بنەمای خەسڵەت و پێویستی ئارەزوو و ئەو گلەییەوە دێ کە لە لایەن گەلی زوڵملێکراوەوە دەکرێ و دەسەلاتدار بە کوفری نیعمەتی دەزانێ.. ئەوە دەڵێم و لە بیریشم ناچێ یاخیبوونێکی بێ هیوا لە داگیرکەرێکی بەهێز جۆرە خۆکوشتنێکە بە دەستی کەسێکی تر بەڵکو تەنانەت فرسەتێکە داگیرکەر چاوەڕوانێتی تا پشتی داگیرکراو بشکێنێ وەک ئەوەی بەندیوان لە داخستنی کەلێنی هەلاتن چاوپۆشی بکا تا بەندکراوێک هەوڵی هەلاتن بدا و ئەویش بیکوژێ و لێی بحەسێتەوە. ئەگەر لە من بپرسی دەڵێم پێشوازی لە عارەب یا فارس یا تورک یا

[*] (ئەو شایەدەی هیچی نەدیوە) ناوی شانۆگەرییەکی کۆمیدیایی میسرییە کە عادل ئیمام ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینێ. وەرگێڕ.

هندی یا ئەفغانی یا هەر نەتەوەیەکی تر دەکەم بە تێکەڵاوبوون ببێتە کورد بە هۆی بێتواناییانەوە لە گۆڕینی واقیعدا مردنم بۆیان ناوێ، ئەرکی سەر شانیشمە، نەک لە ڕووی پێخۆشبوونەوە، ئینقلابی کوردم بە سەر غەیری خۆیدا پێ خۆش بێ تا بە بێ نرخێکی گونجاو نەمرێ. خەڵکانێکی سەر بە نەتەوە جیاوازەکانی تر کە لە ژماردن نایەن پێناسەی تریان هەڵگرت و چ خەتێکیش بە ڕوخساری مانگدا نەهات، جا ئەگەر ئەحمەد شەوقی یا شێخ محەمەد ڕیفعەت یا ئال تەیموور بە تێکەڵاوبوون بوون بە میسری، کورد ئیفلاس دەکا یا عەرشی نادیاری بنی دەلەرزێ؟ ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین نەوەکانی سەلاحەددین و نەوەی وەزیر و سەرکردە و سەربازەکانی لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا زۆربەیان بوونە عارەب و لەوەیە بووبێتنە تورک و ئەوە هەزار جار باشتر و بەسوودترە لەوەی بە دەم داخ و حەسرەتی لەدەستدانی نەتەوەوە بفەوتێن. تۆ ئەی خوێنەر ڕەنگە لە سەردەمی لاوێتیدا دەمارگرژ و توندڕەو بووبی ئەوجا هەڵچوونت دامرکابێتەوە و مەیلت بە لای ئاشتەواییدا چووبێ لەگەڵ واقیعدا و ئەوجا بەوەی هەیە ڕازی بووبی و ماڵێکت پێکەوە نابێ و منداڵت خستبێتەوە و گەورە بووبن و وەچەکانت بووبنە گلێنەی چاو، ئایە نەفرەت لەو شێوە ژیانەت دەکەیت؟ بە دەگمەن مرۆڤ هەمان ئەو حوکمە بە سەر خۆیدا دەدا کە بە سەر خەڵکیدا دەدا و زۆر جار بە بیانووی پووچ باوەڕ بە خۆی دێنێ.

بەر لە بیستوپێنج ساڵ بە هەندێ برادەرم، کە خوالێخۆشبوو هێمنی شاعیر یەکێکیان بوو گوت: من کوردم بە کورد قەبووڵە تا ڕۆخی خیانەت.. ئەگەر بشچێتە ناو خیانەتکارییەوە و بە دڵێکی پاکەوە لێی بکشێتەوە، قەبووڵمە چونکە من خۆم بۆ ئەوە تەرخان ناکەم خائین پێشکەشی دوژمنی کورد بکەم چونکە بەوە، ئەوان ژمارەیەک زیاد دەکەن و منیش ئەگەر تۆبەی لێ قەبووڵ نەکەم، ژمارەیەک کەم دەکەم. جیاوازی لە نێوان ئەوەدا کە دوژمن خزمەکارێک بکڕێ و تێکۆشەرێک لە من بدزێ ڕوون و ئاشکرایە و ئەگە ژمارەکە گەیشتە دە جیاوازیمان دەبێتە بیست. ئەوەی لە جیهانی سێیەمدا کە خەریکە بە هۆی نەزانی و نەخۆشی و هەژاری و دواکەوتنەوە لەناوبچێ، جێی سەرنجە کە سەرقاڵی حەکایەتی پیرەژن و پاڵەوانبازی نیوەزەلامە و بە بێ زیادەڕۆیی، سەرجەمی دیمەنەکە لە شێتخانەیەک پێکهاتووە و تەنانەت بلیمەتێکیش لە پێکهێنانی دیمەنێکی شانۆیی سەیری ئاوهادا، لە زۆربەی نیشتمانەکاندا، لە دەشت و دەریایاندا، بە تەواوەتی دەستەوەستان دەبێ و ئەگەر بینەرێک لەگەڵ دیمەنی وادا ڕانەهاتبێ بە خەیاڵیدا نایێ لەواقیعدا شتی ئاوها هەبێ. ئەگەر لە سەمەرەی سۆفیایەتی بیستەکان و سییەکان ناڕازی بین کە هەمووی بێ ئەنجام و دواکەوتویی و لادان بوو، ئەوەی تێکۆشەری شۆڕشگێڕیش لە نێوان چەپڕەو و دینی و قەومی لە هەموو جیهانی سێیەمدا دەیکا، بۆ ئەو سۆفیە نەخوێندەوارانە تەزکیەیە چونکە سۆفی جەزبە دەیگرێ و دەلەرزێ و باوەڕ بە خورافات دەکا بەڵام بە بێ هۆکار کەس ناکوژێ و یەک گرام بۆ

قارەمانێتی ناتەقێنێتـەوە و ماڵی کـەس بـە هـەوای نـەفس وێران ناکا و لـە دەستیشی دێ بـە بێ فەلسـەفەکردن خـەباتی سیاسی بکـا و نـاتوانێ وەک سـەرکردەی سیاسی سـەخیفیش بێ چونکـە دەزانـێ درۆ و دەجـەل و بیانووهێنانـەوە بـۆ سـاختەکاری کەرامـەتی کەرامەتـدار دێننـە خـوار و ماوەیەکی دەوێ تا عەزیمەتی خاو دەبێتەوە و هۆگری بەها ئاساییەکان دەبێتـەوە تا دەگاتـە واقعی پەردەپۆشکراوی بە سەر پشتدا هەڵگەڕاو. لـە واقعـدا ئـەوە ڕوونـە بزووتنـەوە سیاسییەکانی جیهانی سێیەم وەک پێویست و حەتمی لە وڵاتێک یا لایـەنێک یا حیزبێکەوە هێنـدراون و لەبـەر ڕوونیی ئـەو دواکەوتنـەی کـە دەستی بـە سـەر ئـەو جیهانـە ناوبراوەدا گرتـووە، گەیشتۆتە ئاستی چالاکی سیاسی و خـەڵکی سـەرگەرمی شتی وا کـردووە کـە پەیوەنـدییان بـە پەیـداکردنی ماڵ و خۆراکو جلوبەرگەوە نەبووە. لە بیرمە لە تەمەنی دە ساڵاندا بووم و هێشتا سیاسەت لە وڵاتەکەمدا بە واتا قامووسییەکەی پەیدا نەببوو، چەند ساڵێکی نەبرد قوتابییەکان سرووودی کوردییان دەگوت، دوای چەند ساڵێکی تر قوتابیان چوونە بەغدا و وەک مامۆستا گەڕانەوە و بە گیانێکی تازەوە وانـەیان بـە قوتابیان دەگوت (نامـەوێ لـەو بـوارەدا باسی بـاوکم و شیعرەکانی و خوتبـەکانی بکـەم.. بـۆ ئـەوەی کـەس تووشـی حاساسـی نـەبێ) و پێویسـتیش ناکـا ڕۆڵـی قوتابیـانی کۆیـە و هـەولێر لـە بـواری ئاگادارکردنەوەی سەرجەمی گەلدا گەورە بکەم، سلێمانی، ئەوەی ڕاستی بێ، لە بـەر هەنـدێ هـۆی زاندراو ئـاوێتکۆی بیـری نەتەوایـەتی بـوو، چونکـە دەسـەڵاتی بابانـەکان لـە مـاوەی سـەدان ساڵدا و ئـەوجا دەسـەڵاتی شێخ مـەحموود لـە دوای جـەنگی یەکەمـدا جگـە لـەوەی چـەقی پارێزگـا بـوو و پەیوەنـدی بـە دەوروبـەرەوە هـەبوو و بەرپرسـان سـەردانیان دەکـرد و تەنانـەت کوشـتاری شەشی ئەیلوولیش لە ئەنجامی یەکێ لەو هەڵکەوتانە بوو.. مێژوو حوکمی خۆی دا و زۆرینەی لاوانی دوای جەنگ باوەڕیان بە مارکسیزم هێنا و ڕابردووی نێزیکی خۆیان بیر چووەوە..

با خوێنـەر پێی سـەیر نـەبێ کە لـەم کتێبـەدا باسگەلێ دێنـە پێش کـە پەیوەنـدییان بـە کـورد و ناوچەکانیەوە هەیە چونکە پێم وایە کەمتر لە سـەر کـورد و عـارەبی عیـراق و تەنانـەت سووریاش تا ڕادەیەک، بڵاو دەبێتەوە هۆیەکـەش نـەبوونی بازاڕیانـە لـە سـەر ئاستی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی عـارەب. بابەتەکـەش هـەوێنی هانـدانی تێدا نییـە و تەنانـەت بـە هـۆی گرانی ناوەڕۆکی و زۆریـی بابەتـەکانی و بـەرینیی ڕووبەرەکەیـەوە، لەسـەر ئاسـتی مرۆڤـاتیش بـە هـەر لایەکـدا هەڵیگێڕیتەوە و لە هەر گۆشەیەکەوە پیشانی بدەی سەرجەمی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، قورساییە لـە سەر شانی نووسەر. ئەگەر بشێ لایەنەکانی هەموو بابەتێکی (شێتخانە..!) بزانین مەحاڵـە لـە یـەک تەمەندا لێی دەرچین بە مەرجێ باسی تێروتەسەل و شیکردنەوەی تـەواوی ناوەڕۆکیـان بـە جـۆرێ بکەین خوێنەری بەئاگا و بەویژدان باوەڕی پێ بێنێ. تۆ بڵێی چۆن ئاگاداری بارودۆخی ئەسکیمۆ و دانیشتوانی ڕەسەنی ئوستراليا و هندییە سوورەکانی هەردوو ئەمـەریکا و دانیشـتوانە زەبەلاحـەکانی

ئەشکەوتی بنهایەی باشووری ئەمەریکا و هوتنتوت و بەگمیەکانی ناوەڕاستی ئەفریقیا پێش دۆزینەوەیان و بڵاوبوونەوەی شارستانەتی تیایدا دەبین. ئەو ساکارانە لە پێوانەکاری پلەکانی دواکەوتن لەم کتێبەدا لە کوێن؟ ئەوانە، کە وڵاتیان دۆزرانەوە و ئاستی پەرەسەندنیان زاندرا، هێشتا سەردەمی کۆمۆنیزمی سەرەتاییان تێپەڕ نەکردبوو (ئەزتیک و مایان و ئانکا سەردەمی کۆمۆنیزمی سەرەتاییان تێپەڕاندبوو). ئەوەی لەگەڵ لۆژیکی تێخوێندنەوەی مێژوودا لەم گۆشە سنووردارەی کات و شوێنەوە لە ئەمریکای ناویندا یەکدێتەوە ئەوەیە داگیرکەرە ئیسپانییەکان پاشای هندییە سوورەکانیان بەدیل گرت کە (لە مایان بوو یا ئەزتیک) بۆ ئازادکردنی ئەو مەرجەیان دانا ژووری بەندکردنەکەی هەتا بەرزاییەکی دیاریکراو پڕ بکا لە خشڵ، ئەویش کە ئەوەی کرد، دەسەڵاتدارە ئیسپانییەکان ئیعدامیان کرد.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، هندییە سوورەکان لەو جێیەی ئەمڕۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە، نە شاریان دامەزراندبوو نە حکوومەتیان دانابوو ئەگەرچی کەشوهەوای ئەو ناوچەیە لەبارە و خاکەکەی بەپیتە و ئاوی لە پێویستیش زیاترە، ئەوجا نەیانتوانی لەگەڵ ئەوروپییەکاندا بژێن و تێکەڵی لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەدا دروست نەبوو لە کاتێکدا ئەوروپایی و هندییە سوورەکان لە هەموو ڕووپێوی باشووری وڵاتە یەکگرتووەکان، لە ئەمریکای ناوەڕاست و خوارووادا، لەنێوان خۆیاندا هاوسەرگیرییان کرد و لە ئەنجامدا ڕەگەزێک پێکهات پێی دەگوترێ (مەستیزۆ Mestizo). پێ دەچێ جۆری شارستانەتی هندییە سوورەکانی ئەوێ وای کردبێ پێکەوەژیانیان مومکین بێ چونکە ئەمانە حکوومەت و شاری وەک کۆزکۆی پایتەختی ئاڵانکایان هەبوو کە ژمارەی دانیشتوانی بە سەد هەزار تا نیو ملیۆن دەخەملێندرا. تەنانەت ئەوەش گوتراوە ژمارەی ماڵەکانی سەد هەزار بووە. دوو شاریان ناویان کۆجابامبایە گەورەکەیان لە حەفتاکاندا جێی دوو سەد هەزار دانیشتوو بوو (Britanica Atlas) لە وردەکاری ئەو خەڵکە ئەوە لە زەینم جێگیر دەبێ ئەزتیک نووسینیان بە دە پیتەوە هەبووە. بە سەرنجی ورد لە هۆکار و ئەنجامی وردەکارییەکانی مرۆڤ بۆت دەردەکەوێ مرۆڤی سەرەتایی (بەر لە گوند ـ شار) لە ڕەفتاریاندا لەگەڵ سروشتدا لە یەکتر چوونە چونکە پاڵنەری ڕەفتاریان تێربوون و ئاسایش و بەردەوامی بووە، لە شێوە و نتقدا نەبێ (هەروەها توانای شاراوەی پەرەسەندن بەرەو خەلقەندەی کۆمەڵایەتی) جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ مەیموونی باڵادا نەبووە و فێڵەکانیشیان لە ڕاوکردندا لە فێڵی گۆریللاوە نێزیک بووە، ئەو شێوە و هەیکەلەی لە ئەشکەوتەکانی فەرەنسا دۆزراونەتەوە و ئاگرکردنەوە بە لیکخشاندن. ژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکان لەژیانی ئەو ئاژەڵانەوە کە بە ڕێژەیەکی دیار پێشکەوتوو بووە، نێزیک بووە، بەڵام کە بازنەی تێگەیشتن و هەستکردنی، کە جیاوازییان لەگەڵ توانای غەریزەدا هەیە، فراوان بوو، لە نهێنی شتەکان ورد دەبووەوە و زەینیان بۆ فێڵەکانی

ڕاو و کشتوکاڵ و بەرهەمهێنانی کەرەسەی بەرگریکردن و هێرشبردن چوو و تەنانەت لە ئاسمانیش، بە خۆر و مانگ و ئەستێرە و باران و بروسکەیەوە ورد بووەوە و بیرۆکەی پیرۆزیی بۆ هات کە پەیوەندی بە جیهانی باڵاوە هەیە کە ئەوەش جیایە لە جیهانی دامێنی تەخت و سووک و گوێڕایەڵی بەر دەستی. ئەو بیرۆکەی پیرۆزییە دەرگایەک بوو بۆ ڕێوڕەسمی دینی و پەیدابوونی هەیکەل و پەیکەر.. هتد، وەک ڕەمزی بەڕێز بۆ ڕازیکردنی هێزی شاراوە، ئەوجا دین پەیدا بوو..

ئێستا لە بارەی دینەوە سەرنجێکی زۆر گرنگ هەیە، ئەوەش ئەو ململانێیەی نێوان دینێک و دینێکی ترە کە لەو ململانێیە توندترە لە سەر کەوڵی ڕێوی یا هەندێ میوە دەکرێ، چونکە جیاوازی بۆچوون لە پیرۆزیی شتێکی لای عەشرەتی (أ) و نارەزایی لەو پیرۆزیدانە لە لایەن عەشرەتێکی دراوسێوە لەوە بەئازارترە هەندێ خوو ڕەوشتیان بە سووک بگیرێ، چونکە پیرۆزیی جیا لە هەموو حیسابێک خۆی یەکەمە و خۆی جێی شانازییە و خۆی سەرچاوەی کەرامەتی پەیڕەوانێتی. بیر لەوە بکەوە هەڵکێشانی بیرۆکەیەکی دنیایی لە هەستی خەڵکیدا چی دەکا و حیزبایەتی بە نموونە بێنەوە. مادام دیموکراتی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا سەردەمی ساوایی چەپایەتی و ڕاسترەوایەتی تێپەڕاندووە، حیزبایەتی بە گوێرەی باوەڕی لایەنگرانی بە ڕەوایەتی ئەم یاسا و خراپی ئەوی دی دەکرێ هەر کەسە و بە پێی بەرژەوەندی خۆی ئەم یا ئەو یاسایەی پێ چاکە یا خراپە. کەچی ئەوەی لە جیهانی سێیەمی دواکەوتوودا سەر بە حیزبی نەتەوەیی یا چینایەتی یا دیموکراتی (دیموکراتی لە ڕووی ژماردنەوە هات و چ دیموکراتییەت لەو بوارەدا نییە) یا دینی، خۆی بە سەر بەرژەوەندی خەڵکەوە دەبێتە قازی و دێوی تۆقێنەری منداڵ و پیر و خنکێنەری فزەی نارەزایی و کاریگەر بۆ هەرچییەکی گەرەکی بێ و هەر دەڵێی وەکیلی ڕوببولعالەمینە. ئەوجا جۆرەها حیزب، قەومی و شیوعی و دینی دادەمەزرێن و فیتنە و شەڕ و موسیبەت بە ناوی جەماوەری حەوت جار تەسلیمبووەوە و لەژێر دروشمی پەڕی تاووسی و لە ئاوی سەلسەبیل هەڵکێشراو هەڵدەگیرسێن.

بە شێوەیەکی وای دەبینم کە پێویست بە بەڵگەهێنانەوە نەکات، حیزبی دینی لەبەر ئەوەی بە پیرۆزیی پیرۆزەکانەوە وابەستەیە و بۆ بەرز ڕاگەیاندنی وشەی ڕەبولعالەمین جیهاد دەکا و لە بیدعەو بۆچووندا لە سەر هەقە وبە بەردەوامی بەرەو پاکژی ڕەها و دادپەروەریی ڕەها و هەقی ڕەها دەچێ ئەوەش بۆ جێبەجێکردنی فەرمانێک کە گومان هەڵناگرێ. وابەستەیی ئەمەیان بە بەرنامەی خوا و ڕامالێنی پۆخڵەواتی دنیا و ڕووبەڕووبوونەوەی کوفر و گومان و خواناسییەوە توندترە لە وابەستیی نەتەوەیی و خەباتگێڕی چینایەتی لە لابردنی خڵتوخاش و دوودڵی لە گەیشتن بە ئامانجی هەڵبژێردراو.. ئەگەر باوەڕداری موسوڵمان یا مەسیحی لە سەردەمی

دامەزراندنی دینەکەوە هەوڵی بێ وچانی بۆ بەرزڕاگرتنی دابێ و هەوڵیان دابێ لە ڕۆحدا جێگیری بکەن و ئەگەر مەسیحی دووسەد ساڵ بۆ ڕزگارکردنی قودس شەڕ بکا و مەسەڵمان دووسەد ساڵ بەرگری لە قودس بکا تا بیپارێزێ و هەدوو لایان زەحمەتی حەجکردنی لە شوێنە دوورەکانەوە و بە ناو مەترسی و نارەحەتیدا بدەنە خۆیان و چەندین قافڵەی حاجی بە بێ هیوای دنیایی یا قازانجی بازرگانی لەناوچووبن، بەڵگەنەویستە کە ئەوانە لەحیزبییەکی دنیایی کە دەتوانێ بچێتە حیزبێکی ترەوە یا ئیستیقالە بدا، سوورترن لە سەر دینی خۆیان. دین دنیای فانی دەگرێتە خۆ و ژیانی نەمریش، فەرمانی ڕەببولعالەمین دەگرێتە خۆ و لە دیدی باوەڕدارانەوە، ئەرک و باوەڕ و چارەنووسە. بەڵگەنەویستە کە ڕێی تێ دەچێ ڕای جیاواز لە سەر یەک شتی دیاریکراو هەمووی هەڵە بێ و ڕێی تێ دەچێ یەکێکیان ڕاست بێ، بەڵام هەموو ئاینەکان خۆیان بە ڕاست دەزانن و خەڵکیان بە لاوە هەڵەیە. ڕای زانستی دەستکاری و ڕاستکردنەوە هەڵدەگرێ چونکە کاری تاقیکاری و سەپاندنە و هەستیاریی باوەڕی ئاینیی تێدا نییە و بۆچوونێک بە هەڵە دەرچێ باویش بێ باوی بە ڕاستگەڕانی نامێنێ..

بێ سوود نییە ئەگەر ئەمە ڕابگەیەنم: مرۆڤ لە هەموو گیاندارێک زیاتر ئولفەت بە عادەت و نەریت و باوەڕی خۆیەوە دەگرێ چونکە عەقڵێکی هەیە ئەوانە و شتی تری تێدا عەمبار دەکا و تا ڕادەیەک شتە ناحەز وبەدەکانی لە بیر دەمێنن و بەوانە و بە شتی وەک ئەوانە وەڕس دبێ و بە هاودەمێتی و گونجانی دەستەمۆ و ناسک و بەسوودەکان ئاسوودە دەبێ با گونجانیش لە نێوانیاندا نەبێ، وەک ئەوەی نوێژەکانی لە کاتی خۆیاندا بکا و دوایی لەڕایسز قومار بکا یا دڵداری بکا یا قسەیەکی وا بهاوێ ئەنجامی باش نەبێ.. بە نموونە دەڵێم حاجییەک کە دەمناسی و سەرم دەنایە سەری و زوو زوو دەچووە حەج و لە هەموو حەجێکدا کەرێکی بە پارەیەکی کەم دەکڕی و لە ڕێگا بە پارەیەکی زیاتر دەیفرۆشت و لە چوون و گەڕانەوەدا ئەو کارەی دەکرد.. ئاوها هەم خوای ڕازی دەکرد هەم گیرفانیشی پڕ دەکرد.. هی وا هەن بە گوێرەی دەقەکان دەکەن و ڕیبا ناخۆن بەڵام خانوویەک لە موحتاجێک بە ڕەهنی سەد دینار وەردەگرن ئەوجا کرێی خانووەکەی بە نرخی (فایز) کە بانک دایناوە، زیاتر لێ وەردەگرێ، چونکە ڕەهن و بە ڕەهندان لە شەرع و یاسادا ڕێی پێ دراوە و ئەویش ئاوها ویژدانی خۆی ئاسوودە دەکا. بەڵام با دڵنیا بین ئەو کەسەی خۆی لە ڕیبا لادەدا و دوای تەماح ناکەوێ بەڵام موسوڵمانی تر ڕیبای دواخستنیان پێ چاکترە کە قازانجی میقدارەکە و پارەی ئەو ماوەیەیە کە قەرزارەکە قەرزەکەی لە کاتی خۆیدا نەداوەتەوە. لە شەرعێشدا وا هاتووە: إنما الربا في النسيئة ـ ڕیبا لە دواخستندایە، بەڵام زۆریی فەتوای مەزەبە جیاوازەکان دەرگای ئاسانکاری بۆ ئەوانە دەکەنەوە کە حەزیان لە هەبوون و دارایییە.

که ئەو بابەتانە دەخەینە ڕوو، دەبێ هەمیشە لەبیرمان بێ کە لە بارودۆخی مرۆڤ دەکۆڵینەوە نەک مەلایەکەت، مرۆڤیش لە سەر هەزار دین و مەزەبن و هەزار سروشت و سەرچاوەیان هەیە و هەزار هەزار لێکدانەوە و بیانووی کەموکوڕی و نەفامی و ترس و تەماح و ئیشتیای خۆراک و دیتن و بیستن و بۆنکردن و لەبەرکردنیان هەیە و بە هەزاران زمان قسان دەکەن و هەر زمانەی تایبەتمەندی و ڕێزمان و شێوازی دەربڕینی خۆی هەیە و شێوازی خواردن و خواردنەوە حەرام و حەلاڵی خۆی هەیە هەروەها پێوانەی جیای بۆ پیاوەتی و ناپیاوی هەیە.. هەتا دواجۆرەکانی جیاوازی و بەربەستی نێوان میللەتێک و میللەتێک یا عەشرەتێک و عەشرەتێک و نێوان تاکەکانی یەک نەتەوە و یەک عەشرەت.. ئەوجا سیاسەت پەیدا بوو تا وای لێ هات حیزب دروست بوون و لە ناو خەڵکانێکدا بڵاو بوونەوە هەر ئەوەیان لێدەزانین بچنە ڕیزی یەکێکیانەوە لە دژی یەکێکی تر و لە هونەری بیناسازی و داهێنان و توێژینەوە هەر ئەوەیان دەزانی وەک تووتی قسەی سەرکردە بڵێنەوە. زۆربەی ئەو قسانەش کە لە لالغاویان دەردەچوو هێرش بوون بۆ سەر لایەنێکی تر و ئەگەر بەرهەڵستکاریان نەدیبا بەرانبەریان لێ بگرن، حیزبەکە دووبەرەکی تێدەکەوت ئەوجا بەرانبەر یەکتریان دەگرت و بە پاشەڕۆژدا شۆڕ دەبوونەوە.. لە دەوروبەری خۆت و دوورتر، بە حوکمی تەوژمی واقیع دەبینی:

1. خەڵکانێک لە پەراوێزی جیهانی شارستانی، وەک ئەسکیمۆ و خەڵکی تر، هێشتا بە فیترەت دەژین و دیاری جیهانی پێشکەوتوویان بۆ دێ هەر بە خەتی تەلەفۆن دەچێ کە هەردوو سەری بە یەکەوە گرێ دراون. لە ڕاستیدا سەرنجی ئەسکیمۆ و خەڵکی وەک ئەوانم نەداوە کە لە شارستانەتی دابڕاون.

2. خەڵکانێکی زۆرینەی گەلێ شوێنی دنیا سەرگەرمی باوەڕی غەیبی بۆماوەی وان کە جۆرەها باوەڕی کۆنیان تێدایە و هەندێکیان تا ئاستی بەکافرکردن دژی یەکترن.

3ـ فرەژنی و فرەمێردی و حەرامکردنی مەحرەم لە هەندێک و حەڵاڵکردنی لە هەندێکی تر، لەدینی دووەم یا سێیەمدا. ژنە میسری هەتا ڕۆژی ئەمرۆ بانگی مێردیان دەکەن: ئەی برام! ئاوها و ئاوها.. ئەوەش لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە ماوەتەوە.

4. بەکۆیلەکردن لە ڕووی ڕێپێدان و نەدانیەوە لە بەر دوو هۆ هی ئەوەیە فیتنەی لێ بکەوێتەوە: یەکەمیان پیرۆزیی حەرام و حەلاڵە لە باوەڕی کۆیلەداریدا. دووەمیشیان وابەستەییە بە بازرگانییەکەوە کە لە کۆنەوە حەلاڵ بووە و ڕەواجی هەبووە.

5. ڕێژەی پیرۆزیی دیاردە فەلەکییەکان خەڵکی لێ دترسن یا پێی شاد دەبن و زۆر جار بۆتە هۆی کارەساتی خەفەتئامێز.

6ـ بە هۆی ڕاهاتنەوە نەفامی وای لە خەڵک کردووە دەفتەرێک نەگرێتە دەستیەوە ئەگەر بە زمانێکی دیاریکراو نەبووبێ. یەکەم بروسکە لە سەرەتای بیستەکاندا، لە بەغداوە بە زمانی کوردی گەیشتە کۆیە، ئەهلی بازاڕ و خوێندەوارانی سەرسام کردبوو تا ئەوەی قوتابییەکی سەرەتایی، بێ ئەوەی بزانێ کێشەیەکی ئاڵۆزی یەکلایی کردۆتەوە، خوێندیەوە.. لە بیرمە کە دینار پەیدا بوو و جێی ڕوپێ و نیوە و چارەکە روپێی هندی گرتەوە. ئەو دەمە من منداڵکار بووم و کە ویستم درهەمێک لە بری بایی خۆی ڕوپێ وەربگرم، بازرگانێکی گەڕەکەکە سەرسام بوو و دڵنیای دەکردم کە درهەم لە ئاڵوویردا، یەک حەفتە دەوام ناکا، ئەگەرچی ڕوپێ دراوێکی نائیسلامی بوو و درهەم ئیسلامی بوو بەڵام. ئەوە ڕاهاتن و ئولفەتگرتن بوو لەگەڵ ڕوپێدا کە بە سەر درهەمی ئیسلامیدا زاڵی دەکرد.

7. وەختە بە دڵنیاییەوە لە بیرەوەری منداڵیی پێنج ساڵانەمەوە[13] بڵێم بەکارهێنانی کەوچک لە خواردندا خەڵکی سەرسام دەکرد، نە دیومانە و نە دیویانە بەر لە هاتنی ئینگلیز لەساڵی 1918دا خەڵک برنج و یاپراغ بە کەوچک بخوا. بەڵام شۆربای نیسک و ماش و خۆراکە شلەکانی دی بە دەست و پەنجە نەدەخوران و کەوچک بوو بە کەرەسەیەک دەستی لێ بەرنەدەدرا، مەگەر ئەوەندەیان نان بگوشیبایەتە خۆراکە شلەکەوە ئاوەکەی هەڵمژێ تا لەگەڵ خواردنیدا نەڕژێتە سەر جلوبەرگ و ڕایەخ[*].

8. زۆربەی داستانە خورافییە باوەکان جێگای ڕێزبوونە چونکە ڕێژەی لۆژیکی زانستی لە دەماغی نەوەکانی ڕابردوودا ئەوەندە کەم و ساکار و بێ بنەما بووە بەرگەی ئەوەی نەگرتووە باسی خولانەوەی زەوی قەبووڵ بکا بە دەوری خۆردا. دەبینی لەحەکایەتێکدا دەڵێ قارەمانی داستانەکە بە شەو، خەریکی ئەنجامدانی کارێکی گرنگ بوو و لە چۆڵەوانی پیرێکی دی تۆپێکی ڕەشی کڵاف دەکرد و هەر وا کەمێکی لێمابۆوە. پرسیاری تۆپەکەی لە پیرەکە کرد ئەویش گوتی ئەو ماوەیەی شەوە کە ماوەتەوە و نەختێکی تر خۆر هەڵدێ. ئەویش پیرەکەی گرت و چوارپەلی بەست هەتا چوو کارەکەی ئەنجام دا و شەوی حەکایەتەکە درێژەی کێشا تا مەلای بەیانی چەندین جار بانگی

---

[*] لە بیرم نەماوە لە کوێم خوێندۆتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە خوێندوومەتەوە کە کورد لەو میللەتانەیە لە کۆنی کۆنەوە کەوچک و تەنانەت چەتاڵیشی ی بەکار هێناوە. بەر لە پەیدابوونی کەوچکی فافۆن، یا زیو و تەنانەت تووجیش، کەوچکی دار هەبووە. وەرگێڕ

دا. له سەرەتای چلەکان یا کۆتایی سییەکاندا باسی حەکایەتی (بلوقیا)ی هەزار و یەک شەوم بۆ هەندێ لە دانیشتوانی گوندی (پێپازۆک) کرد، کە لە باسەکە بوومەوە ـ کە هیچترین و بێماناترین و سەخیفترین حەکایەتی دنیایە ـ کوێخای گوندەکە گوتی: بەو خوایە ئەم حەکایەتە لە خۆی ڕاستتر نییە.. لەو حەکایەتەدا ئەوە دەبیستی کە دوورگەی واقواق دارێکی لێیە لەگەڵ خۆرهەڵاتدا گەڵاکانی دەوەرێن و لەگەڵ بەردانی هەر گەڵایەکدا دەڵێ: واق واق سوبحان الملک الخلاق، ناشزانین بۆچی لەو دوورگە دوورەدەستەدا بە عارەبی ئەوە دەڵێ. لە بەینی خۆماندا بێ ئەو شەوەی ئەو ساڵەمان دڵگیر بوو بە سەماوەرەکە و شەوچەرەی گوێز و بادەم و مێوژ و هەنجیری وشکەوە... بە تووتنی باڵەکەوە و ئەو دەمە بە زیادەڕۆییەوە جگەرەم دەکێشا.

9. یەکێ لە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی دوای هاتنی ئینگلیز و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی نوێ ئەوە بوو خەڵک دەستی کرد بە پۆشینی جلی ئەوروپایی و لە دەستەی فەرمانبەرانەوە دەست پێ کرا.. دوای ئەوان خەڵکی نافەرمانبەریش دەستیان پێ کرد و لە سەرەتادا بە کوفر دەزاندرا.

10. دانانی قوتابخانەی کچان بە لای خەڵکەوە داهێنانێکی ناشەرعی و دەرگای تێکدانی ئەخلاق و باوەڕ بوو و ئەوەش بەس بوو کیژ لە قوتابخانەدا بە دەنگی بەرز سروود بڵێ تا بێحیجاب بێ. لە ڕاستیدا ئەو کیژانەی لە تەمەنی مێردکردندا بوون ئەو تورەهاتانەیان بڵاو دەکردەوە، بەڵام زۆری نەخایاند، دوای دامەزراندنی هەندێ لەو کیژانەی قوتابخانەیان تەواو کردبوو، ئەو پڕوپووچانەش نەمان. هێزی داهێنانی ئەوروپا بە داهێنانە سەرسوڕهێنەرەکانیەوە، وەک فڕۆکەی ئاسمان و ئۆتۆمبیلی سەر زەوی و کارەبای شەوی تاریک، یەکلاییکەرەوە بوو. زۆری نەمابوو ژمارەیەک لە پیاوە توندڕەوەکان خوێندنی ئەستێرەناسی کۆپەرنیکی بە کوفر دابنێن کە دەڵێ خۆر وەستاوە و زەوی دەسووڕێتەوە. پیاوانی ئاینی بە نموونەی ساکار دەمەتەقێیان لەگەڵدا دەکردم وەکوو: ئەگەر پەلەوەر بفڕێ و زەوی بسوڕێتەوە، دوایی جۆن لە سەر هێلانەکەی خۆی دەنیشێتەوە و خۆ دەبوو سەدان و هەزاران کیلۆمەتر لێی دوور بکەوێتەوە.. چ نرخێکیان بۆ ڕاکێشانی زەوی دانەدەنا و بە ساختەی کافریان دەزانی تا بێباوەڕی خۆیان بڵاو بکەنەوە. ئەو جۆرە ڕاکێش و بکێش و شلکردنە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوامن و هەتا سبەینێیەکی دووریش، لە بەر هەندێ هۆ بەردەوام دەبن:

أ ـ لایەنەکانی ململانێ زۆربەیان وابەستەی باوەڕی توندوتیژن و پیاوەتی و ئازایەتی لەدەمی تیغ و زمان و نەفامیدا دەبینن و مادام لەگەڵ ئەو جیهانەدا ڕاهاتوون کە بە بەڵگە سەپاوە و لەگەڵ هەستیاندا گونجاوە ئاوڕ لە ڕاستییەکانی بوون نادەنەوە. ئەگەر بڵێی فلانە وەلی سەرزەمینی

سمسمەی دۆزیوەتەوە کە لەم زەمینەی خۆمان فراوانترە، دڵیان زیاتر ئاوی پێ دەخواتەوە لەوەی شتی پڕوپووچی وەک فرۆکە و تەلەڤزیۆن و ئاسمانگەڕی بدۆزرێنەوە!!

ب ـ چۆن لای ئەو خەڵکەی بەرەو هێزی سەرووی سروشت و کەرامات ڕاکێشان هەیە، لای ئەوانەش کە وابەستەی لۆژیکی ماتریالانەن جۆرە بەبەردبوونێکی باوەڕی سیاسی هەیە و چەندین پلەش لەوە سەرەوەترە کە عەقڵ چاوەڕانێتی. ئەوەی باوەڕی بە هێزی سەرووی سروشت هەیە چاوەڕوانی نیعمەتی هەمیشەیی دوای مردنە لەکاتێکی ئەو مرۆڤەی باوەڕی بە لێکدانەوەی ماتریالانەی کۆمەڵگا هەیە، تەنها باوەڕی بەو ژیانە دیاریکراوە هەیە کە بە سەری دەبا و پێی وایە باوەڕهێنان بە خوا و زندووبوونەوە فێڵێکە بۆ بەستنەوەی سەرجەمی خەڵکی ساکار تا گوێڕایەڵی تەڵەکەبازان بن. ڕاستیی زەق ئەوەیە کە ئەو ماتریالستە توندڕەوانە لە باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر لە ئیماندارەکان توندترن. با بیری خۆمانی بهێنینەوە ستالین چی بە دەیان هەزار سەربازی پۆڵۆنی کرد و هیتلەر چی بە جوولەکە کرد و مستەفا کەمال چی بە کورد کرد و مۆسۆلینی چی بە لیبییەکان و خەڵکی حەبەشە کرد... بزانە جەنگیزخان و تەیموورلەنگ و خەڵکی تر چییان بە خەڵکانی تر کرد و دەکەن تا ئەو کاتەی ئەو کارە ئەنجام دەدرێ کە خوا فەرمانی ئەنجامدانی داوە!! موسوڵمان لە ئاستی مەسیحیدا زمانی خۆی دەگرێ چونکە باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی عیسا هەیە و بە کەلیمەی خوای دەزانێ کە بە مەریەمی ڕاگەیاندووە و مەسیحیش باوەڕی موسوڵمانی بەوەی کە عیسا ڕۆحی خوایە بەرز دەنرخێنێ، بەڵام حیزبی ڕۆژهەڵاتی لە جیهانی سێیەمی دوای بیستدا قسە و لۆژیک لە مەیدانی هاوبەشی نێوانیاندا، لەگەڵ نەیاری خۆیدا بەکار ناهێنێ بەڵام ئەگەر بتوانێ ڕێگاکە بەوە کورت دەکاتەوە کە لەناوی بەرێ.. مردوو قسان ناکا و چەک هەڵناگرێ و نابێتە چقڵی چاوی زندووەکان و نابێنە پاڵپشتی دوژمنان... ئەوجا... ئەوجا... هەتا بیست ئەوجا پیلان بۆ ڕووخاندنی ئەم ڕاستکردنەوەی ئەو دەگێڕدرێ، چونکە حیزبایەتییەک بە تێکۆشانی شۆڕشگێڕانە ئاو درابێ بۆ تێکشکاندنی دوژمن و هەناسەبڕینی ئەو دۆستانەی تەماحی یەکەمایەتی و سەرکردایەتی و پێشڕەوایەتییان هەیە تەنها باوەڕیان بە توندوتیژی هەیە. نوکتەیەکم بیر کەوتەوە لە گۆڤارێکی میسریدا بەر چاوم کەوت دەڵێ خانمێک لە خانمە هاوڕێیەکی خۆی پرسی ئاخۆ هاوڕێی سێیەمیان چۆن باسی ئەم دەکا، ئەویش گوتی: تۆ چۆن باسی ئەو دەکەیت، ئەویش ئاوها باسی تۆ دەکا. ئەویش شین و مۆر هەڵگەڕا و قیژاندی: ئەو قەحپە بەدڕەشتە..! با ئەوەش بخەینە ناو حیسابەوە کە حیزبی لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا مەرجەکانی حیزبایەتییان تێدا نییە چونکە خەسڵەتی حیزبی ڕاستەقینە ئەوەیە ڕێزێ ڕای گشتی بگرێ، ئەمانە ڕوو دەدەن: 1ـ دەنگدان بە بێ فێڵ دەکرێ. 2ـ نوێنەرایەتییەکی پاک بۆ ڕاکێشانی دەنگدەران. 3ـ حکوومەت بە زۆرینەیەک کە پشتگیری لێ دەکا، دادەمەزرێ و بەردەوام دەبێ و ئەگەر لەبەر

هەر هۆیەک خەڵکی دەستخەڕۆ کرد هەڵبژاردنی تر بەو هیوایە دەکرێ دروشمی پاڵێوراوان بە شێوەیەکی ڕوونتر پیشانی دەنگدەران بدرێن. پێویست ناکا بچینە ناو باسی یەک یا دوو مەجلیسی پەرلەمان و مافی سەرۆک بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی تازە هەڵبژێردراو و نەبوونی ئەو مافەی بکەین چونکە باسی ئێمە جۆرەکانی سستەمی دیموکراتی نییە لەو وڵاتانەدا کە دیموکراسین. لە جیهانە سێیەمەکەماندا بە شێوەیەکی گشتی و لای ئەو شۆڕشگێڕانەی خۆیان بە (دیموکرات) دەزانن بە تایبەتی، پەرلەمان لە ژێر دەسەڵاتی دەسەڵاتداردا بە شێوەیەک هەڵدەبژێردرێ، مەگەر بە دەگمەن وا نەبێ، کە لە ئەنجامی دڵنیابن. بەڵام سستەمی شۆڕشگێڕ دەتوانێ کام پەرلەمانتاری بوێ لە جەژنی قوربان یا خەتەنەکردنی کوڕەزای سەرۆکی حیزبدا سەری ببڕێ.

ج ـ دوای ئەوەی هاوسەرگیری لە ڕێی دادگاوە ڕێکخرا (پێشتر دادگەی شەرعی بوو) وای لێ هات هاوسەرگیری دەرەوەی دادگا نایاسیی بێ و کاریگەری نەبێ و گوێ لە کێشەی نێوان دوو هاوسەرەکە نەگیرێ. گەلێ کەس لەوە نارەحەت بوون دادوەر جلکی نائیسلامی لەبەر نەبووبێ و بە کاتەکانی نوێژەوە وابەستە نەبووبێ و ژنیش مارە ببڕێ، ئەویش ناچار بوو بە حوکمی یاساوە وابەستە بێ، بۆیە چارەسەرێکیان لەوەدا دۆزییەوە بچنە لای مەلا بە پێی شەرع جارێکی تر مارەی ببڕنەوە. ئەم بارودۆخە ماوەیەکی زۆری خایاند بەڵام وای لێهات پێویست نەمێنێ، چونکە نوێگەرایی و سەردەمگەرایی) لەو مەسەلەیەدا زاڵ بوو بە تایبەتی بۆ ئەو ئاسانکارییەی دووبارە مارەبڕینی لای مەلا و پارەپێدانی لابرد. بەسبوونی دادگا دوو ئەرکی لابرد: یەکەم ـ دیارییبردن بۆ مەلا. دووەم ـ ماندووبوونی چوون و هاتنەوەی لای مەلا. هەردووکیان گرنگییان نەما.

دەمەوێ بگەڕێمەوە سەر سەرنجێکی پێەیست ئەوەش دەست تێوەردانی حکوومەتە لە مەسەلەی هەڵبژاردندا، دەڵێم: قسەی ئاسایی لە سەر زانینی ڕای خەڵک بوو لە سەر بەرژەوەندی گشتی و ئەمەش دوو نموونەی گرنگ کە دەبێ حیسابی زۆریان بۆ بکرێ:

یەکەمیان، ئازادی تەواوی دەنگدەر پێچەوانەی ئەو ئامانجە دەبووەوە کە لۆژیکی هەڵبژاردن لە خۆی دەگرێ یا پێشقەرەوڵێتی، چونکە ژمارەیەکی زۆر کەمی ڕۆشنبیرانی شار سەرکەوتنیان بە دەست دەهێنا و نیمچەخوێندەوارەکان کە هیچ لە ڕێوڕەسمی دەسەڵات نازانن زۆرینەی هەرە زۆر دەبوون، چونکە گوند ئەگەر لە دەشتایی بێ یا لە شاخ لە لایەن سەرۆک عەشرەتەوە دەستیان بە سەردا گیراوە و ڕۆشنبیر بەختی نابێ. حکوومەتەکان سەرە گەورەکانیان ڕازی دەکرد و لە ڕێی ڕاوێژ و تێگەیشتنی نێوان گوند و شارەوە ژمارەیەک لە ڕۆشنبیرانیشیان تێ دەخست و هەڵدەبژێردران، واش نەبوایە زەحمەت بوو لەپەرلەمانێک حکوومەت دروست بکرێ لەسەدا

نەوەدی نەخوێندەوار بێ. دەڵێن فەیسەڵی یەکەمی پاشای عیراق لەموسڵەوە چوو بۆ هەولێر و دوای ئەوەی لە ناحیەی گوێر لە ڕووبارەکە پەڕییەوە، خەڵک و پۆلیس ڕیز ببوون و بۆ خێرهێنانی خاوەن شکۆی بە یەک دەنگ هاواریان دەکرد: خوا بتکاتە باشچاوش... ئەوە لە سەرەتای سییەکاندا بوو.

دووەمیان: لە شارەکاندا ڕۆشنبیرانی پایەدار هەبوون کە جەماوەریشیان هەبوو. ئەوانە لە هەڵبژاردنی ئازاددا دەردەچوون و بە خیتابە ئاگرینەکانیان شەقامیان دەهەژاند و ئەنجامیش دەبووە یەکێ لەو دوو کارەساتە: یا دەبوو حوکمی عورفی ڕاگەیەندرێ و هەموو ئەو دەنگانە کپ بکرێن کە هەق یا نیوە هەق دەڵێن، یا دەبوو حکوومەتێک بێت کە دەیەوێ خراپەکاری (بە بۆچوونی خۆی) لە ڕەگەوە هەڵکەنێ و سستەمەکە بگۆڕێ (وەک نموونەی عیراق کە بوونی ئینگلیزی پشتئەستوور بە پەیماننامە لایەنێکی گرنگ بوو). لە ئینقلابی 14ی تەممووزدا دیتمان چۆن بارودۆخ گەیشتە ئەوپەڕی خراپ.. لە ڕووی بەراوردکارییەوە دەڵێم یەکێتی سۆڤیەت کە لە سەر بنەمای شۆڕشی چینایەتی بنیات نرابوو نێزیکەی حەفتا ساڵ دەوامی کرد، بەڵام شۆڕشی تەمووز بە سەرۆکایەتی کەریم قاسم چوار ساڵ و چەند مانگێک لە ناو بارودۆخی ناخۆشدا دەوامی کرد، ئەوجا هێز پەرشوبڵاو بووەوە و ڕاپەڕینی کوردیش کە سیاسەتی قاسم فەرزی کردبوو بەردەوام بوو و بووە خەسڵەتێکی بەردەوام و جاروبار پشوویەکی کورتی بێ ئەنجامی پێ دەدرا. عیراق هێرشی کردە سەر حکوومەتەکەی خومەینی و نێزیکەی هەشت ساڵی خایاند و ئەوجا شەڕی خەلیجی بە دوادا هات.. جگە لە دەسەڵاتداران و دارودەستە و هەندێ مشەخۆر کە پایەیان گەورە و بەختیان یار بوو، عیراق بووە دەوڵەتێکی هەژار. دوای ئەوە زیادەڕۆیی حکوومەت لە چاپکردنی ملیارەها دیناری بێ (ڕەسید)دا وای کرد بەهای دینار ببێتە 1/3ی یەک فلس، واتە یەک فلسی سەردەمی تەندروستی دینار بایی سێ دینار بوو و هێشتاش بە بەریەوە ماوە.. زۆر کەس کە (ڕەسید)یان لە بانکدا هەبوو دەستیان لە بنی هەمانەوە دەرچوو چونکە ئەگەر دە هەزار دیناریان هەبووبێ، دەبووە 3 دینار و 333 فلس بە بەهای کۆن، واتە 1/3 3 دیناری کۆن. لە ڕۆژگاری کۆندا دینارێک پێنج دۆلاری دەکرد دوایی یەک دۆلار بووە هەزار دینار..

ئەم جیهانە چ شێتێکە! عاقڵەکانیشی بە سەر دەستەی جیاوازدا دابەش دەبن: دەستەیەک شانبەشانی بارودۆخەکە بە بێ بەرهەڵستکاری دەڕوا و یەکێکی تر لە ماڵی خۆی یا کونجی خۆی سەری کز کردووە و ڕازییە و دەستەیەکیش فێڵبازانە خۆیان لە بەهێزەکان دەبەنە پێشێ تا مەڕێک بکەنە نێچیر و دەستەیەکی تریش هەن کە ئازان، جارێ دەبەنەوە جارێ دەدۆڕێنن و دووریش نییە سەروماڵی لە سەر دانێن. لە لووتکەشدا دەسەڵاتدار دەسەڵاتی لە وڵاتێکەوە بۆ

یەکێکی تر (لە جیهانی سێیەمدا) بە پێی بارودۆخی ئەو وڵاتە جیاوازە. لە ڕووی شارەزاییەوە دەڵێم کە دادگا لە میسر و عیراق تا ڕۆژی بەرپابوونی شۆڕشەکانیان، لەوپەڕی پاکی و چاکیدا بوو. سستەمی پزیشکی لە عیراقدا هەتا بەرپابوونی شۆڕشی 1958 لە سستەمی ئینگلیزییەوە نێزیک بوو و دوای ئەوە تێکچوو. جێی سەرسوڕمانە کە لە قوتابخانەکانماندا دەبینین قوتابیان وابەستەییان بە حیزب و نازانم چییەوە هەیە و لە تاقیکردنەوەدا 80% دێنن بەڵام بە هۆی ئەو وابەستییانەوە نومرەیان دەبێتە زیاتر لە 100% و بەوەش پێوانە تێک دەچێ و ئەوەی بە توانای خۆی 80% دێنێ، لەوە باشتر دەبێ کە 100% دێنێ و ئەو خوێندکارەی بە ڕێژە بێتوانایە دەچێتە کۆلێژی پزیشکی و خوایە بە تەمای تۆ! ئەم بارودۆخە نیوە بەیتێکی فارسیم بیر دەخاتەوە کە دەڵێ: "گر تو نمی پسندی تغيير ده قضارا) ـ ئەگەر بە دڵت نییە قەزاوقەدەر بگۆڕە.

خوێنەر دەبینێ باسکردنی ئەو وێنانەی پێشتر و سەرنجە ڕوونکەرەوەکان نموونەی ئەو شێتخانەیەن کە دەموێ تیایدا سەرنجی بخەمە سەر ڕووبەرێکی فراوان کە تەنها بارودۆخ و ڕەفتاری بەشەر لە خۆ دەگرێ و چ ئاژەڵێک خاترانە نازانێ و چ پەلەوەرێک نوێژ ناکا و چ مێرووڵەیەک شیعر دانانێ و هیچ بوونەوەرێک بەرتیل نادا و شایەدی درۆ نادا.. هەروەها جگە لە بەشەر هیچ بوونەوەرێک ڕەگی سێجا دەرناهێنێ و هیچیان تەفسیری بە دوای یەکدا هاتنی وەرزەکان ناکەن. مادام بەشەر لە تێگەیشتن و بینین و سەپاندن و چوونە ئاسمان و داهێنانی موعجیزەدا لە پێشەوەی گیاندارانەوەیە، ئەگەر لایدا یا زێدەڕۆیی کرد یا هەڵەی کرد یا قینی هەستا یا عاشق بوو لێی دەوەشێتەوە دووریی لە ڕاستییەوە یا مامناوەندییەوە لەگەڵ گیاندارانی تردا بەراورد نەکرێ چونکە هەموو مەودای نێوان مەلایەکەتێک و مرۆکوژێک یا شەیتانێکی لە بەردەستدایە بەڵام کە دەماغی دابەزی لە ئاستی پشیلە و بۆق نزمتر دەبێتەوە. سەیر لەوەدایە ئەگەر باوەڕی بە هەڵە هێنا گەرموگوڕییەکەی بۆ ئەو هەڵەیە زۆر لەوە زیاتر دەبێ کە بۆ ڕاستی هەیبێ. ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئەگەر گومڕایی بە ناو خەڵکدا بڵاو بووەوە و لە تێگەیشتندا قەبووڵ کرا وەک نەخۆشییەکی ترسناکی لێ دێ جورعەتێکی لەوە بەهێزتری بوێ کە هەڵامەت پێی دەوێ. نەخوێندەواری نقومبووی نەزانینی شێوەی سووڕانەوەی ئەستێرەکان و بەدواییەکهاتنی شێوەی مانگ و هاتوچۆی خۆر لە نێوان ئەوپەڕی دووریی لە زستاندا و ئەوپەڕی نێزیکی لە بەهار و هاویندا بۆ دانیشتوانی جەمسەری باکووری زەوی و زستانی باکوور هاوینی باشووره هاوینیشی زستانێتی.. هتد. دەڵێم بەڵگەنەویستە کەسێکی ئاوها بەرانبەر مەعجیزەکانی ئاسمان سەرسامە و بە قەدەر داخراوی دیاردەکان لە تێگەیشتنی، خۆبەقوربانکردن و توانەوەی ئیرادەی لە نهێنییە نارۆونەکانی سووڕانەوەی پێچکەی ئەو کەونە زیاد دەکا. ئەگەر باسێکی ڕێڕەوی "کونە ڕەشەکان" بەر گوێی بکەوێ مخوورِ دادەگیرسێنێ و هەندێ خێریش بە سەر هەژاراندا دابەش دەکا تا ئەو

کوفره برِەوێتەوە. دەربازکردنی نەفامێک لە خەیاڵی دێو و عفریتی ئاسمان و ئەو گایەی زەمینی لە نێوان شاخەکانیدا هەڵگرتووە و فلان وەلی حەوت ساڵان هەوساری خۆری ڕاکێشاوە، هەزار جار لە هەڵهێنان و چارەسەرکردنی ئاڵۆزترین مەتەڵ کە هۆشی مرۆ سەرسام دەکا زەحمەتترە. ئەگەر دوای ماندووبوون و زەحمەتییەکی زۆر گرێیەک لەو گرێیانەت بۆی کردەوە نەخشەی تێگەیشتنی دەشێوێنی چونکە شتێکی ڕێقنگی وای تێ دەکەوێ کە لەگەڵ وردەکاری تێگەیشتنە داستانییەکەیدا نایەتەوە و ئەو خاڵە ڕوونە لە ڕاستیدا، دەبێتە خاڵێکی نائارامی یاخی لە تێگەیشتن و ناڕوونی ناو خاڵە ڕوونەکانی تری وەک تەختیی زەوی و بروسکە قامچی ڕقبوونەوەیە و کۆڵکەزێڕینە بزەی مەلایەکەتە.. هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش نازانێ چۆن باوەڕ بە خڕیی زەوی بێنێ کە لە ڕواڵەتدا تەختە و ڕێی تێ ناچێ زەریاکان لە سەر جەستەیەکی خڕ جێگیر ببن.. لە ڕاستیدا خەڵکانی زۆر لەوانەی باوەڕیان بە سووڕانەوەی زەوی و جێگیریی ئاسمان و لاریی زەوی بە ڕادەی 5،23 پلە لە خولانەوەیدا بە دەوری خۆردا هەیە لە ئەنجامی حاڵیبوون و باوەڕهێنانەوە نییە بە تیۆرییە فەلەکییەکان بەڵکو لە ناچارییەوەیە. ئەوان هەموو ڕۆژێ دەبیستن خۆر سێ سەعات لە لەندەن، دوای هەڵاتنی ئێرەی هەڵدێ و لە ڕۆژهەڵات بۆ نموونە لە دووریی 90 پلە، شەش سەعات لە پێش ئێرەدا هەڵدێ و تەنانەت ڕێبواری ئاسمانی درک بەو دیاردەیە دەکا و چار نامێنێ هەر دەبێ باوەڕ بکا بەڵام ئەو ڕاستیانە بە هیچ شتێکی دنیاوە نابەستنەوە و بە دووری نازانم بە درۆخستنەوەیان پێ خۆش بێ، چونکە یەکەم، بۆ تێگەیشتنیان ئاسان نییە لەگەڵ ئەو شتانەدا کە لەگەڵیاندا ڕاهاتووە یەک نایەتەوە و تەنانەت پێچەوانەشە.. وەک تەختیی زەوی و هەڵاتن و ئاوابوونی خۆر و مانگ و ئەستێرە، دژی ئەو یەقینەشە کە خۆی و باوباپیرانی تا دەگاتە باپیرەی سەتەمی پێی گەیشتبوون. لە بیرمە مامۆستایەک کە فەلەکی کۆنی خوێندبوو لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییدا وانەی فەلەکناسی نوێی پێدەگوتینەوە، دوای کۆتایی وانەکە دەیگوت: کوڕەکانم، هەموو ئەو قسانە لە بارەی سووڕانەوەی زەوی و خڕییەکەیەوە، پێچەوانەی ڕاستین و دژی دینن، بەڵام زەروورەت سەپاندوویەتی و چ چارەیەکی نییە...

گەلێ جار بیر لە بارودۆخی ئەو کەسانە دەکەمەوە کە باوەڕێکیان هەیە و شتێک دەڵێنەوە لەگەڵ باوەڕیاندا ناگونجێ و نە گێژیش دەبن نە تووشی هەڵامەت دەبن نە سەرگەردانی.. ئەوانە لەگەڵ دژەکاندا ڕێککەوتنیان مۆر کردووە، ئەوەش نەک بە هۆی ئیرادەی ڕووتەوە بەڵکو بە هۆی ڕووکەشیی باوەڕیانەوە، نا بەڵکو لەبەر ئەوەی شتێک لای ئەوانە نییە ناوی (بیر) بێ تا بیانخاتە هەڵەوە کەچی ئەگەر بتەوێ لە کڕین و فرۆشتندا دەمەتەقێیان لەگەڵدا بکەیت دەبینی مامۆستای دۆزینەوەی هەڵەن و لەکێشانە و پێوانەدا ڕێگای شاراوەی وایان هەیە کە کڕیار پەی پێ نابا و دنگی ویژدانیشیان کپ کردووە و دەبینی دوای فێڵکردن و قۆڵبڕین لە نوێژی عەسردا چالاکن و

لەدەسنوێژدا پێیان تا قولەپێ دەشۆن و لە (مەسح)ی سەردا ئەوەندەی تەڕ دەکەن چەند دڵۆپەیەکی لێ داچۆڕێ و بەوەش هاوکێشەی هاوتا لەنێوان باسی خڕێتی زەوی و سووربوون لە سەر گرنگی نوێژ و ڕازیکردنی مەلایەکەت ڕادەگرن و خوداش غەفوور و ڕەحیمە.. ناوەڕۆکی ئەم قسانەم بۆ خەڵکی شارەکەمە، بە تایبەتی موسوڵمانەکانیان، بەڵام حوکمدان بە سەر مرۆڤی دانیشتووی دوو وڵاتی دینجیاواز و نەریتجیاوازدا لەهەردوو بارەکەدا لە یەکترەوە نێزیکن. ئەوەی لەم بوارەدا بە لامەوە مایەی قەبووڵکردنە بە بیرهێنانەوەی خوێنەرە کە پێنج سەد ساڵ بەر لەئێستا قەشە و مەسیحی فەلەکناسیان لەسەر ئەوە سووتاند کە ڕایگەیاند زەوی بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە کەچی دەبینین قەشەکان لە سەردەمی ئاسمانگەڕیدا ئینجیل دەنێرنە سەر مانگ. پێش دە ساڵ یا زیاتر، ڕۆشنبیریکی کورد هۆکاری ئەوەی لێ پرسیم کە ئایەتوڵا و حیجەتولئیسلامی شیعە و قەشە مەسیحیەکان زانیارییان لە سەر بزووتنەوە زانستیەکان و سیاسەتی نێودەوڵەتی هەیە کەچی بە دەگمەن نەبێ، مەلای سوننە لە ڕابردووی نێزیک و دووردا نابینین گرنگی بە شتی دەرەوەی شەرع و ڕۆژوو و نوێژ و مارەبڕین و زەکات و سەرفترە بدا، وەڵامم دایەوە کە مەلای شیعە و قەشەی مەسیحی خاوەنی مەسەلەن بۆیە ڕاست نییە لە توێژینەوە و کێشەکانی سەردەم و ڕەهەندە سیاسی و ئابووری و دیموکراتی و دیکتاتۆرییەکانی بێئاگا بن لەگەڵ ئەو سەرنجەشدا کە قەشە لە مەلای شیعە زانستانەترە چونکە ڕاستییە زانستییە زەمینی و ئاسمانیەکان لە جیهانی مەسیحیدا ڕەگی داکوتاوە، لەکاتێکدا مەلای سوننە هەتا چەند ساڵێک پێش ئێستا خولانەوەی زەوییان پێ کفر بوو و زەوییان پێ جێگیر بوو و حەوت ئاسمانی ئیسلامی دەوری داوە و دوای ئەوەش فەلەکی هەشتەمی ئەستێرە جێگیربووەکان دێ و فەلەکی نۆیەمیش بەڕێوەبەری هەموو ئەو فەلەکە ناوبراوانەیە. گوتیشم فەلەکناسانی کۆنی موسوڵمانان دەیانگوت عەرش و کورسی دوو فەلەکن کە ژمارە (9)تەواو دەکەن. لە ڕاستیدا گونجاندنی فەلەکناسی بەتلیمۆسی و زانستی ئەم کەونە کە نە فەلەکی تێدایە و نە سەرەتا و کۆتاییەکی دیاری هەیە تا دووری خەیتەوە و چاکی کەیتەوە شتێکە لە سەرەوەی مەحاڵ.. تەنانەت خەیاڵێکی نەخۆشیشە. ئەمڕۆ ئامێری مەیلەو سیحری دەبینی لە سەر مانگ و مەڕیخ دادەبەزێ و خودڕەوی تایەدار بە ئامێری گەیاندنەوە شیکردنەوە دەکا و ئەنجامەکان بۆ زانایانی سەر زەوی دەنێرێتەوە، ئەوەش مۆخی مرۆ بە تەنها پێی ئەنجام نادرێ. ئەوجا دەبینی و دەبینم و هەموومان دەبینین سۆفییەک یا دەروێشێک حاڵی لێ هاتووە و چاوی زەق بوونەتەوە و لە جیهانی ئەو دەجاڵەدا بزر بووە کەدنیا پڕ دەکا لە کوفر و ناویان لێ ناوە (مەسیح)ی دەجاڵ دوای ئەویش (مەسیحی)ی حەق دێ و بە سەریدا زاڵ دەبێ و ناشزانین ئاخۆ ئەو شەڕە لە سەر زەوییەکی تەختی وەک ئەوە دەکرێ کە پێشینان بۆی چوونە یا لە سەر زەوییەکی خڕ! ناشزانین جۆن زەوی ئەو ئاوەی

خوارەوەی خۆی ڕادەگرێ تا نەڕژێتە ناو فەزای خوارەوە! دەڵێن کەرەکەی (مەسیح)ی دەجاڵ تەنها بە گوێیەکی سێبەر لە حەفتا هەزار جوولەکە دەکا.

نازانین کەهنوتیە هندۆسەکان، بۆ نموونە، لە بارەی گونجاندنی قسەی ساکاری کۆنیان و بیری ئەم سەردەمەوە، کە موعجیزەی ئەنجامداوە و خورافاتی بە درۆ خستۆتەوە و بە ئاسمانەکاندا گەڕاوە چ دەڵـێن، زۆری پیشەسـازی و پەرەسـەندنی بـەکارهێنانی ئـامێر مەترسـییەکیان دروسـت کـردووە ئەوەش کونبوونی چینی ئۆزۆنە کە بیری زاناکانی وروژاندووە.. لە پەراوێزی ئەم دیاردەیـەوە دیـارە جیاوازی شارستانەتی نێوان دوو وڵات بە میقداری ئەو دووکەڵە خۆی ڕادەگەیەنێ کە لە ئۆتۆمبیل و مەکینەی هەمەجۆرەوە دەردەچێ، دەوڵەتی پێشکەوتوو هـەوڵ دەدا پـێش بـەو دووکەڵـە بگـرێ و پێم وایە ئەگەر دووکەڵ لە ئۆتۆبیل و ئامێرەکانی ترەوە دەرچێ لە وڵاتێکی وەکوو سویددا، بە پێی یاسا سزای هەیە، لە کاتێکدا ئەگەر هەنـدێ ئـامێر لـە وڵاتـی ئێمـە و وڵاتـانی وەک ئـەوەی ئێمـەدا دووکـەڵی نـەبێ جێـی سەرسوڕمانە و ڕەنگـە یاسـا سـزای بـدا. مامۆسـتایەکی میسـری سـەردەمی ئامادەییم لە بیرە، ناوی، ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، محەمەد سابیت بـوو، هـەموو ساڵێک کتێبێکی لـە سـەر ئـەو دەوڵەتـە دەنووسـی کـە لـە پشـووی هاوینـدا سـەردانی دەکـرد، باسـی قـەومێکی زۆر هەژاری هندی دەکرد کە زۆر ڕێزی مەیموونیان گرتـووە و ژمـارەی ئـەو مەیموونانـەی بـە بیسـت ملیـۆن مەزەنـدە دەکرد،کـە بەشـی بیسـت ملیـۆن بەشـەر زەرەریـان داوە و کەسـیش ئـازاری پـێ نەگەیاندوون.. ئەوانە مەیموون ئازار نادەن و دەریان ناکەن بەڵام لە دەمەقاڵێیەکدا بکوژ و کوژراو لە نێوان خۆیاندا دەبێ و پێم وایە هەموو ساڵێک لە جەژنی قوربانـدا لەگەڵ موسوڵمانەکاندا لە سەر ئـەوەی موسـوڵمان ڕەشـەوڵاغ دەکەنـە قوربـانی ژمارەیـەک لـە یـەکتر دەکـوژن. خوێنـەری بـەڕێز بیهێنەوە بەر چاوت: لە کتێبە ئاسمانیەکاندا کە قورئان دواهەمینیانـە هـاتووە کـە ئینـراهیم ویسـتی کوڕەکـەی خـۆی سـەربڕێ و پێـی گـوت (بەتـەمام سـەرت ببـڕم..) و کوڕەکـە بـاوەڕی کـرد کـە خەونەکە لـە خـوای گەورەوەیـە. ئـەوجا قوربـانی هـات (ففـدیناه بـذبح عظـیم) ئـەوە چـووە باوەڕی ئاینییەوە و بۆ قورئان گوازرایەوە و عارەبەکان وڵاتانیان داگیر کرد، لەوانەش هند کە تیایدا خەڵک هەبوو زندوویان سەرنەدەبڕی و موسوڵمان لە جەژنی قورباندا قوربانییان دەکرد، ئەوجا هەردوو لا بـووە شـەڕیان و هـەردوو لاشـیان هنـدین و هـەموو سـاڵێک خـوێنی بەشـەر دەڕژێ بـە درێژایـی زەمـانیش فیتنـەیی لەگەڵـدا هـاتووە. بـە دڵنیاییـەوە دەڵـێم لـە سـەردەمی دابـەزینی قورئانـدا ئەگـەر مرۆڤێکـی خەیاڵبـەرین و زمـانلووس هەبوایـە بـە خەیاڵیـدا نـەدەهات عـارەبی موسـوڵمان دوای تێکشکاندنی ڕۆمانەکان بە ناو ساسانیەکاندا بە سەرکەوتوویی بگەنە هنـد و بـە زۆر قوربـان بکەنـە ئەرک بە سەر دانیشـتوانەوە ئەگـەرچی دژی هەسـت و سۆزیشـیان بـووە و لەسـەر بـەران و مانگـا شەڕی عارەب بکەن.

نەختێ بە گرنگییەوە ئەو وێنانە پیشان دەدەین تا لەگەڵ ئەوەدا ڕابێین کە ناومان نا "نەخۆشخانەی شێتان" چونکە ئەوەی لە ناو خەڵکیدا باوە ئەوەیە لەگەڵ بیرۆکە و بارودۆخ و بەوها و نەریتەکان و شتی لەو بابەتانەدا ڕا دێن کە تایبەتمەندی کۆمەڵگەی مرۆڤن و هەر کەسەش بە یاری خۆیدا هەڵدەڵێ و هەموو کەسیش بەرانبەر غەریب یەکەم جار کورژ دەبێتەوە. بەر لە بیست ساڵ پیشاندانی وێنەی ڕووت و جوتبوون وەک ئەمڕۆ لە تەلەڤزیۆنەوە نەبوو کەچی ئەوانەی ئێستا تاقیبی دەکەن بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی دوای نیوەشەون تا ئەوەی مەسەلەی "گەنجبونەوەی شێخ" قسەیەکە باس دەکرێ و بۆتە "مۆدێلێکی کۆن" و ئیشتیای جەنابی هونەروەرانی دوادوایی سەدەی بیستەم ناکاتەوە. شانۆگەری و تەمسیل لە ڕۆژاوادا پێشکەش دەکرێن و ئەکتەرەکان، چ ژن و چ پیاو، هەموو ڕووتن. ویستم بەم کورتەیە ئاستی قوربانیەکانی نێوان هندۆس و موسوڵمانەکانی هند بەرز بکەمەوە بۆ ئاستی بەرزتری تێگەیشتن و درکپێکردن کە لە ڕەفتاردا تێگەیشتن و عەقڵ چاوەڕوان دەکرێ بە تایبەتی بابەتێک کە گرنگی و مەترسی وا لە ئەنجامەکەیدا هەبێ چاوەڕواننەکراو بێ. بەڵام ڕای خۆم دەخەمە پاڵ بۆچوونی مێژوونووسێک کە ناویم بیر چۆتەوە: یەکەم جەنگی جیهانی بە هەموو حیسابێک نەدەبوو بقەومێ لە کاتێکدا زۆر جەنگ نەقەوما کە بە هەموو حسابێک دەبوو بقەومێ. ئەو ڕایەی خۆمی دەخەمە سەر کە بەشداریکردنی تورکیا لەیەکەم جەنگدا شانبەشانی ئەڵمان، ڕەفتاری شێت بوو و هیچ پێویست نەبوو بکرێ، تەلعەت و ئەنوەر و جەمال بە سێقۆڵی دەسەڵاتی عەبدولحەمیدیان ڕماند بەو حیسابەی توانای ئەو دەسەڵاتەی نییە کە هەیەتی، کەچی ئەو سیانە سەڵتەنەتی ئالی عوسمان و خەلافەتی ئالی عوسمانیان لە گۆڕ نا و خۆشیان لەگەڵیدا ناشت و ڕێگەیان بۆ دەسەڵاتی ئەتاتورک خۆش کرد ببێتە دەسەڵاتداری ڕەها کە قسەی ڕەتبوونەوەی نەبێ. ئەوجا لەگەڵ مندا ئەو کارەساتانە بە سەر بکەوە کە بە سەر تەڕ و وشکدا هاتن، نەک بە هۆی لافاو و بوومەلەرزە و گەردەلوولەوە بەڵکو بە هۆی سەرشێتی و ڕۆحزلی و بۆچوونی هەڵە و نەوسی ئەشعەبانە یا هەڵچوونی تاکەکەس یا کۆنەقینەوە... تا کۆتایی لستی هۆکارە ئامادەکراوەکان کە لە مەودای نێزیک و دووردا سوودیان نەبووە. ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەیتەوە و بەرەو سەرەوە، بۆ مێژوو بگەڕێیتەوە و دەفتەری ئێستا هەڵدەیتەوە و بەرەو داهاتوو بچیت کارەساتی دەستکردی مرۆڤ لە سەر شێوەی جەنگ و توندوتیژی و زۆرداری و تالان دەبینی کە لەو ماوانە زیاترن بە ئارامی و بێجەنگ وتۆقاندن بە سەر چوونە. ئەگەر ئەو ماڵوێرانیانەی لێ دەرکەین کە پێش هەزاران ساڵ ڕوویان داوە کە هێشتا ئەو هەستە لای ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێ، نەبووە ئاشتی پێ باشتر بێ، دەبێ دانی پێدا بنێین کە دزیکردن لە دراوسێیەکی هێمن و بێزەرەر کە خراپەی بۆ کەس نەبووە، تەنها زوڵمێک نییە مرۆڤایەتی مرۆڤ دێنێتە خوارەوە بەڵکو خوێڕێتی و سووکی و حەیوانیەتیەکە کە ئەنجامدەرەکەی دادەگرێتە ئەو جێیەی لە خوارەوەیدا شوورەیی و بێڕەوشتی نییە، بە تایبەتی لە دوای دامەزراندنی دەوڵەت و یاسا

و دەستوور و سستەم و پەیماننامەی هەزاران ساڵ پێش ئێستا. ئەگەر ڕوودانی ئەو جەنگ و هێرشانە وەک بارینی باران و گەرمی ئاگر و پێگەیشتنی تری بوایە، کەس گلەیی نەدەبوو، بەڵام جەنگ، هەر جەنگێک تەنها ئەوە نییە ڕوودانی حەتمیی نەبێ، بەڵکو بۆ هۆی گەورەیی مەترسیەکانی و زۆریی مەسرەفی و قورسایی خەسارەتەکانی، نەدەبوو ڕوو بدا یا دەبوو بە دەگمەن ڕوو بدا: هەر جەنگێک کە دەقەومێ، قورسایی و ئەرک و ڕاهێنانی جەنگی و سەربازی ماوەی چەندین ساڵی بە دوای یەکدا، ئەوەندە کەرەسە و پارە و ماندووبوون بە خەرج دەدا بەشی ئەوە دەکا بە بێ جەنگ و کوشتن وماڵوێرانی سەرف بکرێ. لە ڕاستیدا خۆئامادەکردن بۆ شەڕ خۆی لە خۆیدا بەشێکی زۆر گرنگی پارە و ئاسوودەیی و ئارامی ئەو دەمە خەرج دەکا و بارودۆخی پاشەڕۆژیش سەغڵەت دەکا چونکە دەشیا ئەوەی سەرف کرا، بۆ داهاتوو ببێتە زەخیرە و بە وزەی خۆی دەروازەی تر بۆ ئەو دەمە و داهاتوو بکرێتەوە. لە دەسەڵاتی خۆمدا نییە هەموو ئەو جەنگانە ڕەت دەکەمەوە کە زەوییان بە خوێن ڕەنگ کردووە و ئاوەدانییان وێران کردووە. قسەکانم ئەوانە ناگرنەوە بەرەنگاری دەستدرێژیکەر دەبنەوە و خۆئامادەکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی زۆردار و تاوانبار پاکانەیانە، چونکە ئەوەی بە دارستاندا بڕوا لۆمەی ناکرێ ئەگەر چەک هەڵگرێ تا ئەگەر گورگ یا ڕێگر پەلاماری بدا بەرگری لە خۆی بکا. منیش وەک تۆ دەزانم کە جەنگ بەر لە هەزاران ساڵ بەرپا بووە و لە سەردەمەکاندا هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوام بووە، بە فووی جادووگەر و وردەخوێندنی قۆڵبڕ بەرپا نەبووە و بۆ دابینکردنی ئارەزووی کەسێکیش نەبووە کە بۆ کوشتن و خۆهەڵنان ڕاهێنان بە باسکی خۆی بکا (ئەگەرچی ئەو پاڵنەرانەش لە نەخشەی ڕەفتاری مرۆڤدا نابێ پشتگوێ بخرێن) بە هەمان وریایی مرۆڤێک لە بەرگریکردن لە خۆی و خێزان و سامانی بەرانبەر بە گێچەڵی دز و پیاوخراپ و دڵڕەش، عەشرەت و شار و دەوڵەتیش بیر لە ڕەفتاری چاوەڕواننەکراو لە دراوسێی خۆی دەکاتەوە، جا چ عەشرەت بێ یا شار بێ یا دەوڵەت. وزەی ژیان کە لە بەردەم هەڕەشەی بەردەوامی سروشتی یا دەستکردی لەناوچوونە، یەکەم جار بەرگریی دەوێ و دووەم جاریش سەرکەوتنی دەوێ، ئەوەش سەیر نییە چونکە هیچ کەسێک نییە کۆمەڵی سەرقاڵی تایبەتی نەبێ کە پەیوەندییان بە کرامەت و سەروەرییەوە نییە بەڵکو دەڵاندنی خراپەی ئەو دەروونەیە کە فەرمانی خراپەکاری دەدا و شتی وای دەوێ کە زۆربەیان لەخێزانەوە پەیدا نەبوونە. تاکی هەژار دەستی لەوە کورتترە دەیەکی ئارەزووەکانی بە حەڵاڵی تێر بکا و ڕەنگە شوان لەو دەشتودەرە بەختی لە هی خەڵکی تر باشتر بێ چونکە بە دەستی مێینەیەک لە گوندەکەوە خۆراکی بۆ دێ چونکە پیاوان سەرقاڵی کاری ڕۆژانەن. جگە لەوەش شوان مەڕەکەی دەدۆشێ و تا مڕ دەبێ شیر دەخواتەوە.. تەونی کۆمەڵایەتی زۆر تێکەڵاوی و ئاڵۆزی تێدایە کە لە ڕەفتاری کۆمەڵگە و تاکەکان و پەیوەندی تاکەکانی کۆمەڵگە جیاوازەکان بە یەکترەوە و پەیوەندی کۆمەڵگەیەک بە کۆمەڵگەیەکی ترەوە تێی کەوتووە. چەند هەوڵ بدەین سنوور بۆ خەمەکانی تاک

و کۆمەڵگا و عەشرەت و دەوڵەت دابنێین بە هیچ ئەنجامێک ناگەین و ڕوودانی ڕەفتاری بەد و چاک و بێ لایەن ئاسایین و داهێنانی گەمە و گرەو و مەتەڵ و گۆرانی و هەڵپەڕکێ جگە لە ڕاکردن لە وشکان ژیان هیچی تر نییە تا بە تێکەڵکردنی ئەوانە لەگەڵیدا، تەڕی و تام و جوانییەکی هەبێ قورسایی و تفتیی ئەرکەکانی سووک بکا و هەموو ئەوانەش سامانێکی ئەرێنییە کە بە قەدەر نەرێنییەکان دەبێ، بەڵام بە داخەوە سنووردارە. کە خێزانێک شەوێکی بەهاری تاریک لە ژوورێکی پڕ جانەوەردا، بە تایبەتی کێچ کە زۆر لە خوێنی نوستوو دەمژێ و تووشی کەمخوێنی دەکا، یەک شەوی ئاوها هەموو خۆشی و نەبوونی و بزەیەکی دەستکردی ژیان ڕادەماڵێ.

جەنگ، بە بۆچوونی من، سەرچاوەی بژێوی لە دەروونی مرۆڤ و ئاماژەکانی کۆمەڵگەدا هەرچییەک بێ نەفرەتلێکراو و تاوانبارە. لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگەشدا جەنگ تاوانبارتر و لە ناو بازنەی داهێنانە سەرسوڕهێنەرە زانستەیکانیشدا کە بە ڕێژەیەکی ئەندازەیی پێشدەکەوێ زیاتر بەر نەفرەتی دادگاییکردن دەکوێ. چ کارەساتێکە هەنگاوی بەرین لە بواری دۆزینەوە و پێشکەوتندا بنێیت و کلیلی (ئەتۆم)ت پێ بێ بۆ ئەوەی شارێک و دوو شاری ژاپۆن بە سەد یا دوو سەد هەزار کوژراوە وێران بکەیت و داڕووخانی خانوو و بینا و فەوتاندنی کشتوکاڵ و گیانداری بە دوادا بێ و لەگەڵیاندا تۆمەتبارکردن و شارستانەتی مەرگ و وێرانکردن ئەنجامی بێ.. من دەزانم ژاپۆن بێری لە هاربەرێتی و بۆردومان دەکردەوە و پشتی هێزی دەریایی ئەمەریکای شکاند و بە ناردنی نوێنەر بۆ واشینگتۆن ڕێی خۆش دەکرد و مەیلی ڕێکەوتنیشی پیشان دەدا و دەشزانم ئەگەر ژاپۆن بۆمبی ئەتۆمی هەبا بەکاری دەهێنا و بەوەش بازنەی تاوانبارکردنی جەنگ بەرینتر دەبێ، سەخیفی و وشکی و شێتی و ڕیسوایی بەوە بەسە پیلانێکی ئاشکرا بکەیتە پەردە بۆ لێدانی ئەوماڵەی تیایدا مێوانیت ئەوجا دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵ لە ئەنجامدانی گەورەترین و ترسناکترین و بەربەرینترین کردار لە هەموو مێژوودا بکرێتە کەرەسەی سەر پێ شۆڕکردنی دوژمن ئەوەش بە کوشتنی دوو سەد هەزار مرۆڤ کە پێش چوار ساڵ هیچ دەسەڵاتێکیان نەبووە..

ڕاستیگەلێکی زۆر لە بارەی هەڵگیرسانی شەڕەوە دەزانین چونکە نموونەی زۆرمان لێیان دیوە کە گرنگترینیان جەنگی 1914 یە (هێشتا من لەدایک نەببووم و بەر لەوەی من لە دایک بم بە یەک ساڵ کۆتایی هات). هەروەها جەنگی 1939 : سوێند بە پیرۆزیی خاکی کوردستان دەخۆم کە دووەم جەنگ بە هۆی بارودۆخی ئابووری ئەڵمانیا و ئیتالیاوە نەبوو (بە تایبەتی ئەڵمانیا ـ چونکە ئیتالیا میزلدانێکی گەورە بوو و هیچی تر) چونکە ئەگەر هۆکارەکە بۆ خراپیی ژیانی ئەڵمانیا

بگێڕتەوە ئەڵمانیا لە شەڕی 1939 و 1940 ئەوجا 1941 و لەوە بەدوا ئەوەندەی کەرەسە و چەک و سەروەت و سامان بە میقداری سەرسوڕهێنەر خەرج کرد ئەگەر ڕێگەی پێکەوەژیانی هەڵبژاردبا بەشی ئەوەی دەکرد ژیانی خۆش بۆ ئەڵمانیا دابین بکا. من دەزانم ئەڵمانیا لە بۆشاییدا نەدەژیا و دەوڵەتەکانی دەوروبەریشی مەلایەکەت نەبوون بەڵام قسەکەم لە ڕووی لێکدانەوەوە وەک خۆی دەمێنێتەوە لەگەڵ ئەو سەرنجەدا کە خراپەکاری دەوڵەتەکانی تر بازنەی شێتایەتییان فراوان کرد بەڵام ئەڵمانیا هەر لە چەقەکەیدا دەمێنێتەوە چونکە چ قارەمانێک نەبوو بێتە مەیدان و بڵێ لەل! ڕووسیا ئامادە نەبوو، بەریتانیا و فەرەنساش بە موستەعمەرەکانیان تێر بوون. ژاپۆن وەک گورگ سەرقاڵی لەتوپەتکردنی چین بوو. پێویستم بە نموونەی تر نییە و بە دڵنیاییەوە ئەو جەنگانەی لە ماوەی 500 ـ 600 ساڵی ڕابردوودا بەرپا کراون، جەنگی دز و ڕێگر بوون و هەورێکی تەنکی بێعەقڵی لەخۆباییبوون و خۆ بەزلزانینیان تێکەڵ بوو. ڕەنگە سوودی هەبێ بڵێین ناپلیۆن بلیمەتێکی جەنگ بوو بەڵام جەللادێکی تێکدەریش بوو کە لە فرمێسک و خوێن و وێرانە تێر نەدەبوو. لە ڕاستیدا ناپلیۆن خۆی لە خۆیدا پێوەری ڕەسەنایەتی و دووڕەگیی گەلی فەرنسا بوو لە وەرگێڕانی دەسەڵاتدا، ئەگەر لە خواستی ئازادی و برایەتی و یەکسانیدا ڕەسەن بوایە نەدەبوو پاشایەکی تێکشکاوی بێدەسەڵات بکوژێ تا عیفریتێک لە جێیدا دابنێ کە دەست بە سەر چارەنووسی فەرەنسا، بە زەمین و ئاو و ئاسمان و خەڵکیەوە بگرێ. ئەوجا بە کڕنۆشبردن بۆ ناپلیۆن لەو کاتەدا کە لە مەنفاوە دەگەڕایەوە و دارلاستیکیشی پێ نەبوو بۆ گەمەی منداڵان، پێی بە سەر کەرامەتی خۆیدا نا. ئەگەرچی ڕووخانی ناپلیۆن بە دەستی دوژمنی فەرەنسا ئەنجام درا، بەڵام دوژمنایەتییەکە بووە دەروازەی دەربازبوونی گەلی فەرەنسا لە دەسەڵاتی ناپلیۆن. بەڵام دەربازبوونی فەرەنسا لە دەستی زۆردار ئاسوودەی نەکرد چونکە دۆڕاندنی شەڕی 1870 لە دژی ئەڵمانیا بووە هۆی دەستبەردانی لە چەند ناوچەیەکی سەر سنووری ئەڵمانیا (دوایی لە جەنگی 1914 ـ 1918) وەریگرتنەوە. ئەوجا قسەکردن لە سەر بێئابڕوویی و چرروکیی و بێکەرامەتی شەڕفرۆشان شتێکە نەفس قێزی لێ دەکاتەوە و قسەی لە سەر کورت دەکەمەوە کە لایەنەکانی هەر جەنگێک ئەگەر ڕێی ڕووناکیی بدۆزنەوە بۆ دیتنی ڕاستییەکان نەهێشتنی جەنگ و ئاسوودەیی لە سێبەری ئاشتیدا لە دەستکەوتەکانی جەنگ و خاکی سووتاو و کێڵگەی وشک زۆرترە، ئەوەندەش بەسە ئەو منداڵەی کە گانگۆڵکە دەکا دەکەوێتە سەر پێ و ڕێ دەکا و دوایی دستی بۆ ڕیشی بابی دەبا ئەوەش خۆشترین خۆشییەکانی دنیایە و باس ناکرێ. لە سەعات دووی پاش نیوەشەوەوە هەتا حەوتی بەیانی یەکەم نەوەی شەش مانگانەی خۆمم لەئامێز گرت و مێشوولەم لێی پاس دەکرد و جێیەکەیم ئارام دەکرد. ئیزن لە خوێنەر دەخوازم چەند دێڕێکی سەرەتای لاپەڕە 9ی "گەشتی ژیانم" کە ساڵی 1988 لە لایەن ئەمانەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی هەولێرەوە چاپ کرا. دەگوازمەوە ئێرە: "ساڵان بە تەرازووە خوارەکەیانەوە کە سەنگی جیاوازی ناو هەرددو تایەکەی،

نیعمەت و غەزەب، خواری کردبوو تێپەڕین ساڵی 1985 بە کەڵبەی گرەوە کە بزەی تێدا بەدی دەکرا و ڕۆژ بە ڕۆژیش بزەکە ڕوونتر دەبوو و مانگ بە مانگیش تارماییەکەی سەمای دەکرد تا شەوی بیستوحەوتی ئەیلوول بەرەو بەیان لە کۆتاییدا بوو، بە لەدایکبوونی یەکەم نەوەی کوڕە نۆبەرەکەم ئەو جەژنە مەزنەی دڵم وماڵەکەم پەیدا بوو:

"ئامەد دەوەن مەسعوود. پێی بووم بە سێگۆشەی سۆز و پینجگۆشەی دڵ و خاوەنی ویژدانی بەرین بە سەر ڕووبەرێکی فراوانی سۆز و خۆشەویستیەوە و زۆر مەنفەز لەبەر چاووم بەرەو دادپەروەی و جوانی کرانەوە و ئەوەی ڕۆحی خۆشحاڵ دەکرد ئەوە بوو ئەو بەشەی تەمەنم کە ماوتەوە لە ئامەددا لە سەرەتای نەوەیەکی نوێدا بژیم کە لە هەموو ڕوویەکەوە لە پێویستی پێگەیشتن لە مرۆڤدا دەکۆڵێتەوە و ئەو لە دروستکردنی پردی پەیوەندی نێوان خەڵک و ڕەتکردنەوەی بانگاشەی شەڕانگێزی دزی و خەسڵەتی دووڕوویی وەکیلی منە تا ئەوەی ئەوانە بە لادەر و تێکدەر و دڵشکێن مۆر دەکا کە لە سەر دوژمنکاری بەردەوامن. لەدایکبوونی، وەرددانەوەی باخچەی گوڵ بوو لە خوێن و دەماری مندا و بەو، ڕەنگەکانی تەقینەوە و گەڵا و چڵی گەش بوونەوە و ڕەگەکانی پاراو بون. ئەوا شەش مانگ دوو ڕۆژ کەمە لە نووسینی ئەم دێڕانە، لەنێوان برژانگەکانی چاومدا کۆڵکەزێڕینە دەنەخشێنێ و لە گوێمدا ئاوازی ئاسمان دەچرێ و بۆ سەردەمی تەمەنی خۆی دەمگێڕێتەوە و سەرلەنوێ شیری خۆشویستنی خەڵک لە چاوی و لە بزەیدا دەمژم و ئای لە سەرسامبوونی تێگەیشتنم لە مەتەڵی بوون: ئەم بچکۆلەیە چەند مەزنە!

یەکێ لە ڕەفتارە سەرسوڕهێنەرەکانی مرۆ ئەوەیە کە توانای خۆی لە پاراستنی تابلۆیەکی زەیتی یا پارچە بەردێکی جوان یا نەخشێکی ڕەنگین یا بەردتاشینی ئەشکەوتێکی کۆن سەرف دەکا بە تایبەتی ئەگەر شتێ بێ پێشەکییەکانی تێکدانی ئاشتی دەربخا. ئەو مرۆڤە ئەوە دەکا و خۆی هونەرمەند یا سیاسەتمەدار یا دەوڵەمەند یا ئەفسەر یا ئەدمیراڵ یا یەکێ لەو دزانەی شوێنەوارە کۆنەکان دەدزێ یا سەرۆکی دەوڵەتە.. بەڵام تاقەتی نییە هەوڵی خۆی بە خەرج بدا بۆ ڕاگرتنی شەڕ کە یەکەم ئەرکی کوشتنی مرۆڤە لە هاوکێشەیەکدا ناوەڕۆکەکەی ئەمەیە: ئەگەر مرۆڤەکانی بەرانبەر توانای بەردەوامیی شەڕیان لە دەست دا، خۆی و هەرچییەکی هەیە دەبێتە هی من! ئەو هاوکێشە نەفرەتییە چەند گەورەیە کە گرنگی بە پاراستنی ئێسکی داینەسۆری ملیۆنان ساڵ بەر لە ئێستا دەدا، ملیۆنان بەشەریش بەرەو بەدگۆڕان و سووتان دەنێرێ و بە دڵێکی ساردەوە غەزەبی ئاسمان و زەمینی بە سەدا دەبارێنێ.

منیش وەک تۆ دەزانم کە مرۆڤ، دوای دروستبوونی حکوومەت و سوپا بەو چەکەی کە لە پلەی عەشرەتیدا لە بەر دەستیدا هەبووە شەڕی دراوسێی خۆی کردووە و شەڕی عەشرەت بە درێژایی مێژووی پێش دروستبوونی حکوومەتیش دەوامی بووە بەڵام بەو توندوتیژییە نەبووە چونکە عەشرەت، مەگەر بە دەگمەن، دەنا هەموو بوونەتە بەشێکی حکوومەت و بەردەوام ڕووی داوە سەرۆکی عەشرەت پەیمانی شکاندووە بەلام بە توندیی سزا دراوە و سزادان ئیعدام و جەزا و دوورخستنەوە و بەندکردنی تێدابووە کە ئەوانەش زۆر جار لە ڕووی یاسا و شەرعەوە پێویستن بە مەرجی تەماحی دەسەڵاتداری تێدانەبێ. ئاوها پێدا وەرە تا دەگەیتە ئەوەی دەستەیەک لە خەڵکی دەکەونە وێزەی یەکتر، بە تایبەتی لە شار کە مەودای پەلاماردان و کشانەوە لە مەودای عەشرەتی بەرتەسکترە. ئەوجا دەگەینە شەڕی تاکەکان کە دەگاتە برینداركردن و کوشتن و هەرزەکارانیش بە دەست و بە دار شەڕ دەکەن... هەموو ئەوانە جەنگ و توندوتیژی و شەرمەزاری و ئابڕووچوونن و نەدەبوو لە نێوان یەک بابەتە خەلقەندەدا ڕوو بدەن کە هەر خۆی لەناو هەموو خەلقەکاندا عەقڵ و تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی بۆ بەرژەوەندی و زەرەر هەیە ئەوەش جنسی مرۆڤە. وای لەو دەستخەڕۆییەی کە لە پەرەسەندنی هۆکاری تێداچوون و زیادبوونی خەسارەتەوە دێ لەمنداڵەوە بگرە تا هەرزەکار، ئەوجا خاوەن خێزان و دەستەیەکی شاریی و دەستەیەکی عەشرەتی گوند تا دەگاتە دەوڵەت کە یاسا و دادگای هەیە. هەموو ئەوانە بە بێ ڕیزپەڕ ئامادەی ململانێ و شکاندنی ئێسک و تەفروتوناکردنی یاسان هەر دەڵێی بەکرێ گیراون تا خەڵاتی نۆبڵ یا شتێکی لەوە گەورەتری پێ وەربگرن. سەرسوڕمان نەبێ هیچی ترم بەرانبەر کەسێ یا دەستەیەک پێ ناکرێ کە بە بێ کرێ دەست لە سەرەخەوی دوانیوەڕۆ بە پشوو و ئاسوودەییەوە هەڵدەگرێ بۆ مشتومشاندن و شەقوەشاندن و خەنجەرلێدان یا خەنجەربەرکەوتن و ڕێشی تێدەچی مەسرەفی چاککردنەوەی برین و گیرسانەوەی شکان وشتی خراپتریش بدا. ئەگەر گوێ بۆ گوتەگوت شل بکەیت فیتنەیی و درۆهەڵبەستانی وا دەژنەوی نەفست قێزیان لێ دەکاتەوە چونکە شەرەفی خەڵک پێشێل دەکەن و فیتنەیی دەگێڕن. کوشتنی خەڵکی بێتاوانم لە سەردەمی منداڵیمەوە لە بیرە دوانیان کیژ و هاوسەرێک بۆ سڕینەوەی عار کوژران چ عار و ماریش لە ئارادا نەبوون بەڵام زمانێکی پیسی نەفرەتیی ویستی خێزانی ئەو دوو کوژراوە بزڕێنێ و دوایی بێتاوانی ئەو دوو شەهیدە وەک خۆری بەیانی ئاشکرا بوو بەڵام... سەد جاران بەڵا.. چ سوود؟! ئەو دوو هاندراوە پیسەش ژیانی تێروتەسەلیان بە سەر برد و کەسیش سەرزەنشتی نەکردن.

بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی سەرنجمان لە سەر جەنگ و توندوتیژی و دوژمنکاری لە سەر بنەمای بەهێز هەڵچنین هەر دەبێ جارێکی تر ئاماژە بۆ ڕاستییەک لە ژیانی زندەوەراندا بکەین، بە

تایبـەتی جیهـانی مـرۆڤ، ئـەوەش 1ـ خۆویسـتی کـە ئـەم لقانـەی لـێ دەبنـەوە: أ ـ ئـارەزووی دەستبەسەرداگرتنی هەرچییەکی دڵ دەیخوازێ. ب ـ ململانێی مانەوە. ج ـ بەردەوامیی وەچە. ئـەم هەوێنانە کە بە ئاگایی و هۆشی نائاگاییەوە لکاون بەردەوام کاریگـەرییان بـە دوو ئاڕاستەدا هەیـە: 1ـ یەکەمایەتی خـۆی و خێزانـی بەرانبـەر خـەڵکی تـر. 2ـ پاراستنی دەسـەڵات بـە سـەر خێزانـدا و لەوەشدا خۆشەویستی بەخیلی تێکەڵ دەبن... لە پلەی خۆشەویستی نێر و مێ یا منداڵ و گەورە یـا بەتوانا و بێتوانا ناکۆڵینەوە. ڕێی تێ دەچێ مەسەلەکە لای هەندێ کەس پێچەوانە بێ و کیژی پتر خۆش بوێ یا پەککەوتەی پتر خۆش بـوێ و لادان تونـدتر دەبـێ تادەگاتـە ئـەوەی بـاوک ڕقـی لـە منداڵەکانی خۆی بێ. ئەو حیسابانەش بزر دەبن و هەر دەبـێ لـە نـاو شـێوازێکی گشـتگری خێزانـدا کە لایەنی گرنگتری تێدایە بزریش ببن. بە هـەموو ئەوانـەدا چوومەتـەوە تـا گـەیشتوومەتە ئـەوەی کە جـەنگ، ئەگـەرچی کارەساتی بـە دواوەیـە بەرهـەمی مـرۆڤ و کـاری دەسـت و هۆشـی مرۆڤـە. ئەگەر زانیمان خێزانێک پلەی جیاوازی خۆشەویستی نێر و مێ تێدا هەیە و کوڕ تیایدا برِبڕەی بێ کیژیش گسک بدا و چێشت لێبنێ و دروومان بکا سەرسوڕمان لـەوەدا نـامێنێ سـەرۆکی دەوڵـەت جـەنگ ڕابگەیـەنێ و چـاوەڕوانی ئـەنجامێکی لـێ بکـا کـە دەسـەڵات و سـامان و بـەرگری بـۆ میللەتەکەی دابین ببێ. تەماحی تەماحکاران هەیە و بزوێنەری سەرکێشی لە ئارادا هەیـە و هـەر یەکـەمان چەنـد هەڵکـەوتی وامـان تـووش بـووە مـەیلمانی بـۆ ئەنجامـدانی کـارێ ختووکـە داوە و نەمانتوانیوە پێشی پێ بگرین و دوایی کە تەمومژ ڕەواوەتەوە ژیوان بووینەتەوە و ژیوانبوونەوەش چ دادی نـەداوە! ڕەنگـە ڕوو بـدا ئەگـەر بەربەسـتیش هـەبن بـە ئـەنجامێک بگـەیت و شـاعیرێکی عارەبیش لەنیوەبەیتێکدا دەڵێ: "نەفس ئەگەر ئارەزووی بۆ دانێی حەزی لێیە"

ئـەو ئارەزووانـەی کـە منـداڵ و هـەرزەکار و لاو و پیـاو و خـاوەن پلەوپایـە و دەسـەڵات دەبـزوێنن، هـەموویان بـۆ یـەک سـەرچـاوەی نـاخی مـرۆ دەگەڕێنـەوە، ئـەوەش دەرخسـتنی بـوونی زاتـە لـە بەدەستهێنانی پێویستی و دەسەڵات و بەدیهێنانی ئارەزوو کە لە منداڵیـدا دەست پێدەکا و لەگـەڵ سەردەمەکانی پێگەیشتندا گەشە دەکا (زۆربـەی ئەوانـەش بـۆ پیاو وان) تـا دەگاتـە ئـەوەی ئەگـەر دەسـەڵاتی وڵاتـی بـە دەسـت هینـا وەزیـر و پیـاوی گرنـگ و ئـەرکانی سوپا بـە دەوریـدا خولانـەوە، هیـوای گرنگـی وەک پلەوپایەکـەی لـە دەوڵەتـدا بـە دڵیـدا دێ. ئەوەشـی دەرخسـتنی پلەوپایـە و دەسەڵاتی بۆ ئاسان دەکا بۆ ئازاردان ئەوەیە کە بە دەست و ددانی خۆی شەڕ ناکا و بە هاوکاری خزمەکار و پیاوەکانی و کەسوکاری و کوڕەکانیشی نایکا بەڵکو سوپایەکی لـە بێگانـان هەیـە کـە لـە (پێناوی نیشتماندا!!) دەمرن و نەمدیوە و نەمبیستووە سەرۆکی دەوڵەت یا سەرلەشکر یـا ئـامر لیـوا لە شەڕدا کوژرابێ و واز لە وەزیر و خاوەنی پلەوپایـەی بـەرزیش بێنـە چونکـە ئەوانـە لـە مەیـدانی شەڕەوە دوورن.. و لەکۆنی کۆنەوە مەترسی بۆردومانی فڕۆکەشیان لە سەر نەبووە تـا ئاسوودەییان

تێکبدەن. بەڵام لە پێش داهێنانی باروود و تۆپدا، گەورە سەرکردەکان بە پارێزگاری دەورە دەدران و ئەگەر تەوژمی زیادیان بۆ بهاتبا، وەک ئاسکە تێیاندەتەقاند.. شیعرێکی هەڵگەڕاوەم لە غەزەلدا بیر کەوتەوە کە دەڵێ:

ئازیزەکەمت نەدیوە لە جوانیدا وەک ئاسکەیە

بە موشیری خوالێخۆشبوو، عەبدولحەکیم عامر کە پێش دەستپێکردنی شەڕ سینای دۆڕاند دەڵێم:

مەشیرەکەمت نەدیوە لە ڕاکردندا وەک ئاسکەیە؟

خوا ڕەحمی پێ بکا و لەو هەموو سووکایەتییەی کە بە سەر گەلەکەی خۆیدا هێنا، لێی خۆش بێ و ئەو دووەم سەرکردە بوو لەمێژووی جەنگدا بە مردنیان لە کاتی جەنگدا بۆ سوپاکەیان سوودمەندتر بوو لەوەی سەرکردایەتی بکەن. یەکەمیان فیدل مارشێل بۆدینی کە ساڵی 1941 سەرکردەی بەرەی ئۆکراین بوو لە جەنگی ڕووسی دژی ئەڵمان، هەر بۆ خاترانە یەک ملیۆن دیلی پێشکەش کرد. لە کۆنەوە لە ناو عارەبدا گوتراوە: خزمەتی مێوان ئەرکە ئەگەرچی درۆزنیش بێ.

وای کە جەنگ شتێکی پیسە و وای لە ئابڕووچوونی ئەوەی سەلامەتی سوپای پێ دەسپێردرێ و بوونی بۆ سوپا دەبێتە بەڵا..

ئەوجا ڕۆژگاری دوای عەبدولناسر وەرسووڕا و ئەنوەر سادات بووە سەرۆکی میسر.. توانی لە قەنات بپەڕێتەوە و بە پشتگیری ئەمەریکا ئیسرائیلی ناچارکرد هەموو سەرزەمینی سینا بداتەوە میسر... خەڵاتەکەشی کوشتن بوو!!

ئەوەیە جیهانی جەنگ و بە هەموو واتایەک و لە هەموو جێیەک و سەردەمێکدا نەفرەتلیکراوی نەفرەتییانە، ئەوە نەبێ وەک پێشتر گوتم شەڕی بەرگریکردن شەرەفێکی گەورەیە و ئەوەشی دەخەمە سەر کە وەرگرتنەوەی زەوی داگیرکراو شەرەفێکی گەورەترە.

میکرۆبی (من) بە واتای خۆویستی و خۆپەسنی و ئارەزووی زاڵبوون لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا هەیە مەکەر پێکهاتەکەی ناتەواو بێ. تاکوتەرا لە کۆن و نوێدا هەبوون و هەن ئیرادەیان پارێزراو بووە ئارەزوو و حەز وەلا دەنێن و بە نەمان لە باوەڕدا (نەفسی فەرمانڕەوا) تێکدەشکێنن و دەروێش و سۆفی جۆرەها شیعری جادووییان هێناوە دڵی خاوەن دڵیان تێدا بزر دەبێ. ڕەنگە ئەم چوارینەیە یەکێ بێ لا باڵاترین نموونەی ویژدان:

یک جرعه می از حریف مستت برسد
صد چاشنهء دمی الستت برسد
این جام نهادەاند در طاق بلند
پا بر سر خویش نه که دستت برسد
لەگەڵ جیاوازییەکی یەکجار زۆری نێوان دەقەکە و وەرگێڕانەکەدا، ئاوهای لێ دێ:
گەر لە مەیگێڕێکی مەستەوە
لە ساتی (الست)ەوە سەد جۆرە تامت بۆ دێ
بادەکەیان لە تاقێکی بڵند دانا
پێ بخەرە بان سەرت هەتا دەستت پێی بگا

ئەم وردەقسانە لەگەڵ خۆم و لەگەڵ خوێنەردا لەگەڵ بابەتەکە و هەرچی پەیوەندی پێیەوە هەیە و لێی دەبێتەوە یا تەواوکەرێتی خەتێکی بەردەوامە و هەموویان یەک شتن (وەک هەموو ئەندامانی جەستە یەک شتە لەگەڵ جیاوازی نێوان مێشک و ڕیخەڵۆکە کوێرەدا) هەوڵێکە بۆ نێزیککردنەوەی وێنەکە و پیشاندانی بە بێ تەمومژ و ڕەنگە من و تۆ لەگەڵ یەکێ لە حەقیقەتە گەورەکانی جیهانی مرۆڤدا بگونجێین ئەوەش جەنگی نەفرەتلێکراوە، ڕەنگە بە ناچاری سواری شەپۆلەکانی بین و هەستیش بەوە نەکەین کارێکی سەیر دەکەین چونکە مەودای نێوان نەفرەتکردن لە جەنگ و بەشداریکردن ـ بە شێوەیەک لە شێوەکان ـ تیایدا، مەودایەکی یەکجار دوورە و پەڕینەوەش پیایدا زۆر زۆر زەحمەتە بەڵام ڕادەی سەرسوڕمان ناگاتە ڕادەی کوودەتا بۆ پێچەوانەی سەرجەمی باوەڕمان بە جیهانی مرۆڤ کە بەزەیی و دادپەروەری و هونەر و داهێنان و زانست و جیهادیشی لە پێناوی ئاشتیدا تێدان و سەربازی ماتریالی و مەعنەویی لە پشتەوەن .. من دەمەوێ باسی "بەدخوویی" ناخی زندەوەر بکەم بەرەو خۆسەپاندن کە لەگەڵ زیادبوونی توانا و دەسەڵاتدا زیاد دەکا، لەوەیە گەنجێک لە لایەنگری (انصار السلام) ئاشتیخوازییەوە بگۆڕێ و ببێتە ساختەکارێکی فرۆشیاری وێنەی کۆتر و نیشانەی ئاشتی. لە بیرمە لە هەندێ سەردەمی دوای 14ی تەمموزی 1958 کاردانەوەی توندوتیژ بەرانبەر ئەو ئاشتیخوازانەی بە فەلەکی سۆڤیەتدا دوسووڕانەوە وای کرد پەیکەری پشیلەیەک هەڵگرن کە کۆترێکی دەخوارد. هیچ کەس بەرانبەر چەمانەوە، بە هۆی باوەڕی خراپەوە یا ڕووداوگەلێکەوە کە هەستی جیاکردنەوەی ڕاست و درۆ وێران دەکا پارێزراو نییە و دەرسدادان و شوشتنەوەی دەماغ و خەڵەتاندنی چاو و جوانکردنی دۆڕاندن لای جەماوەری دواکەوتوو کاریگەریی جادوویی مۆرفین و سڕکردنی هۆش و پەکخستنی ئیرادەیان هەیە... سەرکردەیەکی بواری سیاسەت یا ئاین یا ناشرینکردن و جوانکردن بەوپەڕی ئاسانی دەتوانێ پێشڕەوایەتی هەزاران کەسی ساکار، وەک ڕانەمەڕ و گاگەل بکا و عەقڵ و

تێگەیشتن سێبەری هیچ حیکمەتێکی هیچ کەسیان بەئاگا نایێ و بە گوێرەی دڵی پێشڕەوەکەیان خۆیان سەرف دەکەن.

لە خلیسکاندن بەرەو غافڵگیری، پاکانە بۆ خۆم یا تۆی خوێنەر ناکەم چونکە ڕێی تێ دەچێ فێڵبازێک ئیاردەی من یا تۆ بخاتە تۆڕی خۆیەوە. ئەمە لە تەمەنێکدا دەڵێم کە کەسەکە گەیشتۆتە ئاستی جیاکاری و دەتوانی فڕوفێڵ ئاشکرا بکا بەڵام نەختێ کزبوونی ئیرادە و زیادبوونی ئاستی فێڵ (کزبوونی خەڵەتاو و فێڵی فێڵباز) بەشی ئەوە دەکەن نێچیر بکەوێتە تۆڕەوە. زۆرجار نموونەی ساکاری و بێعەقڵی کۆیلەکانی خوا دەبینم دەمخاتە باری سەرسوڕمانەوە و سەرسام دەبم و هەر دەڵێی چاوی فێڵباز ماگنەتیکیان تێدایە ئەو خەڵکە وەک پەپوولەی بەرەو ئاگر دەوری دەدەن، لەکاتێکدا ڕێنیشاندانی بێ ڕتووشی نیازپاکێک ڕەت دەکەنەوە.

بە هەرحاڵ، لە هەر یەکەماندا بەشێکی غافڵگیری و بەشێکی خۆپەرستن و بەشێکی حەزی خۆنیشاندان و بەشی تری بۆماوەیی و وەرگیراوی مرۆڤ هەیە. بنەما سەرەکییەکە ئەوەیە خاوەن خەسڵەتە لێکچووەکان و شێوەی ڕەفتارکردن بەرانبەر شتێک یا شتگەلێکی دیاریکراو لە یەکتر نزیک دەکەونەوە. بە ڕوونی دیارە لە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاریدا خەسڵەتە لێکچووەکان زەقتر دیارن چونکە ڕەفتاری منداڵێک و منداڵێکی تر، ئەگەر یەکێکیان یا هەردووکیان لە ڕادەبەدەر زیرەک یا لە ڕادەبەدەر گێڵ نەبن، لە یەکتر دەچن. ئەگەر یەکسان بن لە یەکتر نێزیک دەبنەوە و ئەگەر جیاواز بن مەودای نێوانیان دوور دەبێ... خۆشبەختانە لە منداڵییەکی زوومەوە بە هەندێ خەسڵەت ناسرابووم: 1. نازیرەک نەبووم. 2. هاروهاج نەبووم، بە درێژایی تەمەنم هەڵپەی ئەوەم نەبووە خۆم دەربخەم و زمانیشم لە کاروبارێکدا کە هی گەورەکان بووبن تێکنەدەئالا و لەبەر ئەوەی سەر بە خێزانێکی دیار بووم هەستی خۆبەکەمزانینینم نەبوو و پێویستیشم بە خواستنەوەی پلەداری نەبوو. لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بووم مامۆستا بردمیە پۆلی سێ تا حیسابێک حەل بکەم کە منداڵانی پۆلی سێ پێیان حەل نەدەبوو و لە تەمەنێکی زۆر زووەوە مەیلم بە لای ئەدەب و فکردا هەبوو بە تایبەتی کە لە ناو کتێب و قسە و باسی باوکمدا بووم لە مەجلیسەکانیدا. هەموو ئەوانە و شتی تر کە باسکردنیان بە پێویست نابینم ڕییان بۆ ئەوە بۆ خۆش کردم فکر و بۆچوون بەکار بێنم.. لە منداڵیمەوە نەمدەویست باوەڕ بە داستانی خورافی بکەم و بۆ باوەڕکردن گوێم لێیان نەدەگرت بەڵکو بۆ خۆشی،، گەیشتم بەوەی کە چاوەڕوانیم لێ دەکرا، بووم بە پەرلەمانتار و وەزیر و لەم ڕۆژهەڵاتەشدا تەنها من دەرگام بۆ هەموو کەسێک کراوە بوو و هاوسۆزیم لەگەڵ هەموو خەلقەندەکانی خوادا، بە بێ جیاوازی هەبوو. بە ویستی خۆم بە هەمان شێوە لەگەڵ ژیاندا ڕەفتارم دەکرد و بیر و بۆچوونم بە هەموو لایەکی گرنگدا چوو بابەتی غەیبی نەبێ کە دەستم لێ

هەڵگرت بەڵام بە وریایی و ساکاری پەردەم لە سەر نهێنیەکانی ناخم لاداوە و لە ڕووی واقعی ژیانی دنیاییەوە بۆیان چووم و بە نەرمی و کراوەیی، بێ گاڵتەپێکردن و چپەکردن قسەم لە سەر ئەو تیۆرییانە کردووە کە پەیوەندییان بە باوەڕ و سیاسەتەوە بووە.. کورتەی ئەوەی دەمەوێ لە ئەنجامدا دەریبڕم ئەوەیە کە من دوای هیچ بیر و فەلسەفە و ڕایەک یا پێشنیارێک ناکەوم مەگەر لەگەڵ ئەوانەدا ڕێک بێتەوە کە باوەڕم پێیان هەیە و ئەگەر نەشمتوانیبێ هەڵسەنگاندنی بۆ بکەم، وەک ئەوەی نەبووبێ لێی دەگەڕێم و لەبیری دەکەم چونکە ناکرێ بۆ دەربڕینی بۆچوونێک بە بێ سەرچاوەی ژیان، کە چ هەڵدڕاوێکیش نادووریتەوە، لە دەست نیشتمان و ماڵ و کەسوکار ڕابکەیت و بچیتە غەریبی. ئەگەر درۆکردن لە بەرژەوەندی گەلی کورد بێ، هەزار درۆی لەو بابەتە، ئێوارە و بەیانی بەخێر بێن، بەڵام نەکەوتوومەتە هەڵوێستێکەوە ناچار بم خۆبەخشانە بۆ نەجاتدانی واقواق درۆ بکەم.

ئەو سەرەتایەنە لە یەک سەرچاوەوە هاتوون و خۆم لە ناویاندا ئاشکرا کردووە و پێشتریش بۆچوونە بڵاوکراوەکانم ئاشکرایان کردووم و لە هیچ بابەتێکدا شتی شاراوەم نییە تا ئاشکرا بکرێ و ئەی خوێنەر، وەک ئاشکرا بە خۆمی دەڵێم، بە تۆشی دەڵێم کە چۆن وەک مرۆڤێک لایەنی بەهێزت هەیە لایەنی لاوازیشت هەیە.. مرۆڤێک خۆی بە قوربانی خەڵکی تر دەکا و بۆ چنگێ تەڕەپیاز خەڵک دەکوژێ و کوێخایەکی کورد کە ناوی ئاری بوو ڕێبواری وای دەکوشت کە نەیدەناسی، بیانووشی ئەوە بوو دەیگوت دڵم بە فوارەی خوێنی و لەقەفرتێی خۆش دەبێ تا سارد دەبێتەوە. مادامەکی بەمەست لەنووسین (ئەگەر هیممەتی پاک هەبێ) ئاشکراکردنی داپۆشراو و باسکردنی داخراو و دەرخستنی بەرژەوەندی و ئاگادارکردنەوە لە بەلا بێ، دەبێ بەر لەوەی لەگەڵ خەڵکدا کراوەبیت لەگەڵ خۆتدا کراوە بیت، دەنا ئەو کەسەی ئاشکرای بۆ ڕوون نەبێتەوە لە سەر بیانووهێنانەوە بۆ ڕەفتاری خۆی بەردەوام دەبێ: کەواتە ئەوانەی سەرقاڵی کاروباری گشتین لە ڕووی ئەدەبی و نیشتمانی و مرۆڤایەتییەوە بەرپرسن لەوەی لە سەر قسە و ڕەفتاریان، لە بەر ڕۆشنایی بەرژەوەندی گشتیدا، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێ و بەرپرسیارەتی دەستەی سیاسەتمەدارانیش لەو بوارەدا لە پێش بەرپرسیارەتی تاکە بێلایەنەکانەوە دێ، چونکە حیزب وزەی خەڵکێکی زۆری تێدایە و ئەگەر ڕێی هەڵە کرد دوو چارەنووسی مەترسیداری دێنە ڕێ: یەکەمیان ئەوەیە، ئەگەر حیزب دەسەڵاتداریش نەبێ هەڵە بە سەر واقیعدا بسەپێنێ، چونکە ئەوەندەی بەسە خەڵک بە ئاڕاستەی بێسوود، بەڵکە زەرەربەخشدا ببا. هەڵەکەش بە بەردەوامی زاری دەکاتەوە و لە لایەن حیزبەوە کە هەڵەکەی کرد پڕ نابێتەوە. کە حیزبییەک دەبینم بۆ بەرژەوەندی مریشکێک یا بەرخێک یا شتێکی خۆی سەر لە شێوەی پارێزگاری دەردەکا و دوایی لە خۆپیشاندانێکی ناپێویستدا دەبێتە یەک پارچە گڕ کە شایستەی قارەمانە بەڵام دەبێتە هۆی

ماڵوێرانی و لەدەستدانی ئازادی، خەم دامدەگرێ. دووەمیان بڵاوبوونەوەی نارەزایی و بێزاری ناو خەڵکە کە سەر بە حیزب نین بەڵام لایەنگری داواکاری گونجاون بە شێوازی گونجاو.. ڕاپەڕین (وەسبە) ڕووی دا و دوایی خۆی خوارد و ناسەقامگیری و بشێوێتی تر ڕوواویندا کە جگە لە زەرەر و ماڵوێرانی هیچیان تێدا نەبوو تا شۆڕشی 14ی تەمموز ڕووی دا کە لە ڕاستیدا کوودەتایەکی سەربازی بوو و ماوەی چەند ڕۆژێک نەبێ، تەبایی لە نێوان ئەوانەشدا نەهێشت کە ئەنجامیان دا. ئەنجامەکانی تەممووزیشمان بە کارەساتی وەهاوە بینی بە خەیاڵی خەیاڵبازاندا نەدەهات... بەڵام دڵنیاین ئەگەر 14ی تەممووز شۆڕشی جەماوەری بوایە ئەنجامەکەی خراپتر دەبوو، چونکە هەوڵی چارەسەری جەماوەریمان لە موسڵ و کەرکووکدا دیت.. بە هەرحاڵ دەستکاریکردنی کێشەکان بەعەقڵی نیوەبەشەر و پێگەیشتنی هەرزەکار و توندڕەوی ئەوانەی پەلاماری چارەسەری ڕیشەیی(!!) دەدەن، کوشتار و کارەسات نەبێ هیچی تر ناهێنن و چاو بە سەر ئەو ولاتانەدا بگێڕە کە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕییان تێدان ئەوجا کەللەسەری بەشەر و ئاژەڵ و بینای ڕووخاو و ئەو لوقمە نانانە بژمێرە کە پێش بە مردن دەگرن... سەرسام دەبی لە جیهانی سێیەمدا چییان لە بارەوە بڵێیت و لە کوێوە چارەسەری وێرانە و دروستکردنەوەی بینای داتەپیو و دڵنیایی بێنی (بیری هەڵکەندراو و کۆشکی دامەزراو)... نا، هەزار جار نا بۆ دروێنەی ڕۆح و بڕینی لووت و گوێ و چاودەرهێنان و پرسە، کە نە سەرتایان هەیە نەکۆتایی!

ئەو پێشەکی و بۆچوونانە بۆ چپەیەکی ڕاستین تا بە گوێی خوێنەریدا بدەم: شادەی دەرچوون لە نیشتمانپەروەری و بەدەستهێنانی سبەینێی باشتر بە خۆت مەدە، ئەگەر ئامادەی ئەمانە نەبیت: ڕەخنە لە کەموکوڕییە سەرەتاییەکانی خۆت بگرە، چونکە تۆ و من و خەلکی تر ئەو خەلقەندانەین کە لە دێرەکانی پێشدا باسی خەسڵەتاکانیم کرد و هەموو ئەو خەسڵەتانەش مایەی دڵخۆشی خاوەنیانن. ئەگەر نەتتوانی پێش بە ئارەزووەکانی خۆت بگری هەوڵ بدە لە ڕەفتار و قسەکردن و بۆچوونتدا جێگای ڕەزامەندی بیت... ڕێ مەدە هەڵچوونی دەروون جڵەوت لێ وەرگرێ دەنا لە ئەنجامدا دەبیتە مرۆکوژ و دز و زەوتکەر و شەرەفبەر و ئەگەر نەشتتوانی، دەست لە شۆڕشگێڕێتی و حیزبایەتی و نیشتمانپەروەرێتی بەردە و پیشەیەک یا کارێکی وا بکە مەودای ئازاردانی خەڵکی تێدا نەبێ چونکە وەسوەسەی ناخت بەرەو ئەوەت دەبا حەزت لێیە. لە ڕاستیدا، ئەم سەرنجانە هی ئەوەن ئەوەی دەستی لە سەرکردایەتی دەوڵەت و دەوروبەری گیر دەبێ ڕەچاویان بکا. لە کاتی لێدانی زەنگی جەنگدا، ئەو سەرنجانە لە هەموو کاتێک پێویستتر دەبن چونکە بارودۆخی پڕ لە پروشک و هەڵچوون و حەماسی ڕاستبوونەوە بۆ ئاستی ڕووداو زیاد دەکا. با بە بیری خۆمانی بهێنینەوە چۆن کوشتنی میری نەمسا لەساڵی 1914دا لە شاری سەرایێڤۆ فتیلەی یەکەم جەنگی جیهانی داگیرساند. ڕاستە ململانێ لە سەر بەرژەوەندی دەوڵەتان زۆر بوون بەڵام بە ئارامیی

مانەوە و دەکرا تا ماوەیەکی دیاریکراو یا نادیار بە ئارامی بمێننەوە. بەم بۆنەیەوە سێ دەوڵەتی ئەمەریکای لاتینم بیر هاتەوە کە ـ وەک لە بیرم بێ ـ وەخت بوو لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا شەڕ بقەومێنن بەڵام ژنانی ئەو دەوڵەتانە ڕاپەڕین و حکوومەتەکانیان ناچار کرد دەست لە شەڕ هەڵگرن و ئەو پارەیەی کە دەبوو لە جەنگدا سەرف بکرێ سکەی ئاسنی لە نێوان هەر سێ دەوڵەتەکەدا پێ دانران و لە سێگۆشەی سنووریاندا کەبەرزاییەکەی نۆ هەزار تا دە هەزار پێ بەرزە، پەیکەرێکی مەزنی مەسیحیان بە دیار سکەکەوە دانا و لەو ململانێیەدا شاژنی بەریتانیا ناوبژیوان بوو. دەزانین کارەسات هەر ڕوو دەدەن بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین مەحاڵ نییە پێشیان پێ بگیرێ و ئەوەش دەزانین کە هیوا و ئاوات و باوەڕکردن بە فەلەکی گەڕۆک کە جارێ هەر وشە و بۆچوون و ڕێتێچوونن نەک واقعی سووتێنەری کوشندەی ماڵوێرانکەر، ڕێگەخۆشکەرن بۆ دەستبەکاربوون. با هەموومان دانی پێدا بنێین کە لە ناخی هەموو مرۆڤیکدا، ئەگەر خاوەنی هیچ کەرەسەیەکی بەدیهێنانیش نەبێ، حەزی دەرکەوتن و دەسەڵات و بەهێزی هەیە لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا کە لە نێوان ڕادەی مەیلی ئەم مرۆڤ و ئەوی تردا هەیە. نزیکترین کەس لەو جۆرەی کە نەفسی ئارەزوومەند و ورەی خۆتێخزاندنی هەیە و لە دەستی دێ لە هەموو کاتێکدا کە بەدەستهێنانی دەسەڵات پێویست بێ خۆ بهاوێتە ناو مەترسییەوە، ڕەنگە سەلاحەددین سەبباغ لەو جۆرە بووبێ چونکە ساڵی 1948 عیراقی بەرەو بزووتنەوەی ڕەشید عالی لە شەڕی ئینگلیزدا پاڵ نا و دوایی دەرکەوت بەشی زۆری پڕوپاگەندەی قارەمانێتی و نیشتمانپەروەری ئەو بناغە بۆشە بوو کە سوارەکانی بزووتنەوەکە لە سەری ڕاپەڕین، سەرسامبوونی سەبباغیش بە خۆی و ئارەزووی یەکەمایەتی سەرکردایەتی و بە دەستهێنانی دەسەڵاتیشی بخەرە سەر. کە کارەساتەکەش قەوما، ئەوانەی پێی ڕابببوون، (یونس سەبعاوی)[14] یان لێ دەرچێ، هەموو ئەوانی تر بۆ دەرەوەی عیراق هەڵهاتن، بەڵام ئەو داوای لە هەموان دەکرد هەتا مردن یا سەرکەوتن شەڕ بکەن کەچی کەس ئاوڕی لێ نەدایەوە.. مێژوو پڕە لە نموونەی بزواندنی ئاوات بۆ ویستی ئەو کەسەی خەسڵەتی پێشڕەوایەتی هەیە و جارێ سەرکەوتوو دەبێ و جارێ تێکدەشکێ. باوەڕ ناکەم ئەگەر بارودۆخ 40% هیوای سەرکەوتنی لێ بەدی بکرێ کەس هەبێ بارودۆخی هاندەری لە پێش بێ و سەرکێشی نەکا. بە هەرحاڵ، چارەنووسی شۆڕشگێڕەکان جۆراوجۆر بوو و موفتی فەلەستین و ڕەشید عالی دەرباز بوون و چوار ئەفسەریش ئیعدام کران یەکەمیان سەلاحەددین... بوو و یونس سەبعاوی تاکە مەدەنی بوو کە ئیعدام کرا و ئەوانەی ئەفسەر نەبوون ماوەی جۆراوجۆریان لە بەندیخانەدا بردە سەر... ئەوەی بە گاڵتەجاڕی چارەنووس دادەندرێ ئەوەیە کە ئەو چوار ئەفسەرە شەهیدە کوردەی کە پەیوەندییان بە بارزانیەکانەوە کردبوو و دوایی گەڕابوونەوە و خۆیان بە دەستەوە دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی زۆر و گرنگیشیانبۆ درا، بەڵام ئیعدام کران و بیانووەکەش ئەوە بوو ئیعدامکردنی چوار ئەفسەر عارەبەکە کە بەر لە چەند ساڵێک جێبەجێ کرابوو، مەودای

لێبوردن بەو چوارە نادا بە تایبەتی هەردوو بزووتنەوەکەش لە یەک دەچوون. ئەو قسەیە بۆ عەبدولئیلا دەگێڕنەوە ئەگەرچی تەعبیری لە ڕای سستەمی دەسەڵاتیش دەکرد. ئەوجا قەدەر بۆ گاڵتەجاڕییەکی تر لە بۆسەدا بوو چونکە ئەفسەرە شۆڕشگێڕەکان لە 1958/7/14دا دوای بنەماڵەی پاشایەتییان بڕییەوە و نووری سەعیدیش لەگەڵیاندا. ئەوجا زەمان خولێکی چوار ساڵانەی تر سووڕا و عەبدولکەریم قاسم و مەهداوی و تاهای شێخ ئەحمەدیش (بۆ سێیەمیان بەپەرۆش بووم چونکە کەسی ئازار نەدابوو) ئیعدام کران. دادگای مەهداوی کوشتنی کرێکارێکی مینای بەسرای پێش تەمموزی لە دژی سەعید قەززاز کردە بیانوو کە دوو ساڵ (وەک لە بیرم بێ) پێش 1958 کوژرابوو و سەعید قەززازیش لەو کاتەدا لە بەسرا ببوو و مەهداویش حوکمی ئیعدامی بە سەر خۆی و دوو فەرمانبەری ناوخۆدا دا. بەڵام سەعید قەززاز بە قسە بەناوبانگەکەی لەکۆتایی دادگاکەدا (کە بەرەو سێدارە سەردەکەوم زۆر کەس لە بن پێی خۆمدا دەبینم کە شایستەی ژیان نین) شەرەفێکی تری خستە سەر گەورەیی خۆی تا ئەوەی خوالێخۆشبوو کامیل چادچی گوتی: شۆڕشی تەمموز شۆڕشی سەعید قەززاز بوو..

ڕەنگە زەرەری نەبێ سەرنجێک لە بارەی جەنگەوە وەک بزوێنەری مەترسی و لەبیربردنەوەی بەزەیی دەربڕم. خۆت دەزانیت ئەگەر جەنگ لە نێوان دوو دەوڵەتدا بەرپا ببێ هەر یەکەیان بۆ سەرکەوتن بە سەر ئەوی تردا دواتنۆکە توانای خۆی بە خەرج دەدا کەچی لە ململانێی توندی نێوان دوو کەسدا لە سەر بەرژەوەندییەک ناگاتە گوشتن، بەڵام ئەگەر ململانێ لە سەر سەرکردایەتی شەقام کەوتە نێوان دوو حیزبەوە لە سەر دەسەڵات ئەوە بەسەر یەکتردا دێنن کە دوو دەوڵەت لە جەنگدا بە یەکی دەکەن. لەوەوە دەبینی بارودۆخی هەڵچوون گەرموگوڕیی و حەماسی وەها دەخاتە دڵی تێکۆشەرەوە لە هیچ ڕۆژیکی بێهەڵچوونی جەنگدا هەستی پێ ناکا. لە ڕاستی ئەو دیارییە زەقانەی جەنگەوە بۆ نەتەوە و حیزبە دواکەوتووەکانی جیهانی سێیەمی دوای بیستەمەوە، دەبێ وای دابنێین کە نەفرەتلێکراوی یەکەم و دووەم و دەیەمە لە لستەی ئەو کارەساتانەدا کە ڕێی تێ دەچێ ڕووبدەن. جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەوەدا کە لافاوێک کەسێک یا زیاتر ڕامالێ و بارام جەمشیدی هاودەمی دوێنێی خۆی و هاوڕێی حیزبی خۆی بە هۆی جیاوازی بۆچوونەوە لە سەر (زێدەبایی) یا لەسەر ئەوەی خۆپیشاندان لە ئەرزەحاڵناردن بە باشتر بزانێ بکوژێ... نەوەدونۆ لە سەدای خەباتگێڕانی شۆڕشی عیراقی یا چینایەتی یا دینی لە جیهانە دواکەوتووەکەی ئێمەدا بە جۆرێ نەیاری خۆی دەکوژێ وەک ئەوەی لەشەوی زەماوەنددا بچێتە پەردەوە و ڕێشی تێ دەچێ لەو شەوەدا ئاڵۆز بێ و ئەرکی خۆی پێ ئەنجام نەدرێ، بەڵام سەربڕینی نەیارەکەی شەرەفێکی گەورەیە و نابێ لە دەستی بچێ... بەداخەوە!

چەند هەوڵ بدەم وێنەی کارەساتی جەنگی نێوان دوژمنان یا دۆستانی دوێنێ بکێشم ناگەمە هەزاریەکی ئەوەی لەناخمدا کۆبۆتەوە، لە کارەساتەکانیەوە بگرە تا دەگاتە ئەنجامی دوژمنکارانە و تۆڵەسەندنەوە کە ڕەنگە یەک دوو نەوە بەردەوام بێ، ئەگەر دوژمنایەتی توندی چەپی کورد بەرانبەر خەتی نەتەوەیی (کە ئەویش بە بۆیەی مارکسیزم ڕەنگ کرابوو) لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم و دواتر شەڕی باڵەکانی حیزبی قەومی لە 1964 بە دواوە و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ حسێب بکەیت، دەبینی خەرمانێکی زیان و زەرەری ماددی و لەناوچوونی خەڵک و وێرانبوونی بناغەی شارستانەتی و لەدەستدانی دەرفەتی نەتەوایەتی لە بەردەمتدایە، ئەوجا لەو واقیعە خراپە ورد بیتەوە کە وەک هەڕەشە لە بوونی کورد لە سەر شێوەی بازنەیەکی داخراو دەوری کوردی تەنیوە، وێنەیەکی ڕوونکردنەوەی چڕکراوەی دەقاودەقی ناونیشانی ئەم کتێبە دەبینی کە دونیاکەمان تیایدا بە نەخۆشخانەی شێتان چواندووە.

جەنگ لە سەرجەمی ناوەڕۆکەکانیدا وەحشیگەری و دۆڕاوە: ئەو لایەنەی جەنگ دەباتەوە، بە خوێن و ئاسایش و تەمەن و داهات و شەرەفی مرۆڤانەی خۆی نرخەکەی داوە. ئەوجا بارودۆخ دەگۆڕێ بۆ ئەوەی لە جەنگێکی داهاتوودا جەنگ بدۆڕێنێ. بەو شێوەیە سەرکەوتن و دۆڕاندن دەبنە هاوکوف یا نرخی سەرکەوتن کە مەسرەف و کوژراو و لەدەستدانی ئاسایش و مرۆڤایەتییەکەی لەگەڵ سەرکەوتنەکەدا یەکسانە، یا لە یەکسانیش کەمتر دەبێ. ئەوجا پاشەڕۆژ بۆ سەرکەوتوو دەچێتە کەمینەوە و تا تێکینەشکێنێ و سەری پێ شۆڕ نەکا دەستبەرداری نابێ، جا تێکشکان و دۆڕاندنی بە دەستی دوژمنە دۆڕاوەکەی پێشتر بێ یا دوژمنێکی تازە حەزی سەرکەوتن بیوروژێنێ.

هەرچۆنێ بێ، چەرخی گەردوون لە بەر خاتری کەسێکی وەکو من کە بە بەر چاوی کرپارانەوە گەوهەری حیکمەتی خۆی پەخش دەکا، خوا جەزای بداتەوە، لە سووڕان ناوەستێ.. تەنانەت لە ناو کورد و خەڵکی نێزیکی کورددا دوژمنانی ئەو گەوهەرانە لە ژمارەی گوێگرانی زۆرترن ئەگەرچی ڕابردووی تاقیکارییان بەڵگەی ڕاستی هەر وشەیەکە کە لە دووتوێیدایە و چاوێکی نیوەکراوەش وەک خۆری بەیان بە ڕوونی دەبینێ کە پاشەڕۆژ سەر بۆ ئەو قسە بێسەروبەرانە شۆڕ ناکا کە لە ماوەی سێیەک یا زیاتری سەدەیەکدا خۆی سەپاندووە: ئارەزووی سیاسەتی نێودەوڵەتی لە چاونوقاندن لە بێعەقڵییەکانی نەفامی وەک ئێمە بەرەو بەرتەسکبوونەوە دەچێ و بواری ئەوە نادا گەمەی (شای گەمان)[15] لە سەر سەکۆی بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا بکرێ و پاشماوەی نەریتی وێرانبووی دەستی هەرزەکاران لە سێبەری هاوکێشە نێودەوڵەتییەکاندا ماوەیەکی تریش مەودای هەڵوەستەی سەرشێتەکان دەدا. ئەو نەریتە وەک دەنکە تەزبیحێک داوی پسابێ

پەرشــوبڵاو دەبــێ و ئــەوەش لــە بــەردەم تــەوژمی ڕووداوەکــان و کۆمــەڵبوونی کێشــەکان و سەرسوڕهێنەرە ناوەکییەکان و هاواری ئایدۆلۆژیا و کونبونی ئۆزۆن زیادبوونی دانیشتوان بە ڕێژەی ئەندازەییـدا.. بـە بیابـانبوون.. ڕووتبـوونی زەوی و دارسـتان و بێدەسـەڵاتی لـە چارەسـەری دەرد و دوژمنایەتی توندوتیژ لە سەر کێشەکان، چارەنووسە و کـەس نـابوێرێ. بـە هـەرحاڵ نەخۆشخانەی شێتەکانی زەوی جێی شێتبوونی ئەو دەروێشانە نابێتەوە ئەگەر لەگەڵ نۆتەکانی ئاوازی سـەردەمدا یەک نەگرێتەوە. واقعیش ئەوەیە ئەوەی من ئەنجامی دەدەم و دەینووسم زەرەری کەسی تێدا نییە و زیاتر ڕێی تێ دەچێ ئەوانە بیخوێننـەوە کە لێی نـاڕازین و دەیانـەوێ مەبەستەکانی بشێوێنن و سوود لە شتێ وەردەگرن کە لای ئەو خـاوەن بڕیـارە گردەبڕانـەی کە لـە کـاتی تووڕەبووندا زەرەر دەدەن، لەبـەر دڵان نییـە. بـەڵام شـەقام و بـازاڕ و گونـد، بـە تایبـەتی ئەوانـەی کـەمتر لـە ڕۆحـی سەردەمەوە نێزیکن، لە دۆڵێکدان، چاک و خراپ چ پەیوەندی بە مەسەلەی هزر و شارستانەتی و مـافی بەشـداریکردنی نەتـەوەوە نییـە چونکـە خـەمی یەکـەم و کۆتاییـان پەیـداکردنی پـاروەوە نـان و کـونجی حەوانـەوە و هـەبوونی پێداویسـتییە و لەخەڵکیشـم بیسـتووە کـە جـەماوەرێک لـە تەمـەنی هەمەڕەنگدا دەرفەتی (فەرهوود)یان لە هەولێر قۆستۆتەوە و چوونەتە بینایەکەوە پڕ بووە لە شتی وا کـە دڵـی ویسـتوویەتی و لەگـەڵ گوللـە تۆپـدا بـەژوور کـەوتووە بـێ ئـەوەی گـوێ بـەوە بـدات چ دەقەومێ... خانمێکی بە تەمەن لە شارێکی تـردا کەرتوپارچـەی مێزیـک یـا کورسییەکی بردۆتـەوە ماڵێ تا ئەوە خوایە بە تەماشاکردنی دڵی خۆش بێ و خوداش غـەفوور و ڕەحیمـە... ئەگـەر مرۆڤـە ئازاردیدە هەژار و مافخوراوەکان، وەک ئەو ژنانەی کە لەگەڵ گوللەتۆپدا پێشبڕکێیان بـۆ نـاو ئـەو بینایانـە دەکـرد کـە بـەر تـاڵان دەکـەوتن (بیناکـانیش هـی حکوومـەت بـوون نـەک بـۆرژوای نـەفرەتلێکراو)، ئـەو ئازایەتییـەیان تێـدا هـەبێ داوای دادپـەروەری بکـەن (ناشـڵێم لـەناوبردنی چـین چونکە تـاوان و پاشکەوتنە) دەکرا کۆمەڵگەیـەکی ئاسوودە پێکبـێ بـە یـەک مـەرج: هەسـت بـەوە بکرێ چی جایزە و چی ناجایزە چونکە دادپـەروەری وشـەیەکی جوانـە بـەڵام ئـاڵۆزە. ئـەوە دەڵـێم و دەشزانم دادپەروەری ڕەها کە تاجی سەری چاکەکانە، ئەگەر بەرهـەمهێنانی خـۆراک و پۆشـاک و کشـتوکاڵ و پیشەسـازی و پـەیمانگای زانسـتی پراکتیکـی و تـەکنیکی و ڕێگاوبـان و دەسـتپاکی دەسەڵات و دادوەران لە خوار ئاستی دادپەروەرییەوە بن ناتوانن خەڵک تێر بکـەن. ئەمـە دەڵـێم و سەرم بۆ ئەو هەواڵە بادەدەم کە شۆڕشی ئـاینی لـە ئەفغانسـتان خوێنـدن لـە ژن قەدەغـە دەکا... جیاوازی نێوان ئەو ژنانە چەند زۆرە کە ڕێگەیان لە بەرپابوونی جەنگ گرت لەگـەڵ ئەوانـەدا کە نازانن ناوی پەروەردگار بنووسن[16].. ئەوجا سەرت بەرەو ئاسمان هـەڵبڕە و گوێ بگـرە و ببینـە چ هەواڵێک لە مەڕیخەوە، لە ڕێی ئەو ئامێرانەوە دەگەنە زاناکانی سـەر زەوی کـە مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی ناردوون ڕاستییەکانی کەونیان بۆ بهێنن. ئەوەی ڕێگەی لە ژن گرت فێری ئەلفوبێ بێ هـەر خـۆی

لـە دەسـتی دێ هـەموو زاناکـانی زەوی بکـوژێ و هـەموو ئـامێرە زانسـتییەکان تێکبشـکێنێ تـا مەلەکووتی باڵا بە پاکی بمێنێ ئەگەرچی کەون چ باڵا و دامێنی تێدا نیە..!

لە خەسڵەتە سەرسورهێنەرەکانی مرۆڤ بەرینی ئەو مەودا و ڕووبەرەیە کە لە نێوان نەخشەی (کـردار و بۆچـوون)ی تـاک و دەسـتە و خەڵکەکانیـدا هەیـە و چـۆن خـەڵەتانـدنی زەیـد وەک خەڵەتاندنی هیچ کام لە ملیارەها بەشەر نییە، بە هەمان شێوە ڕەوشت و مزێج و هەوەس و تایبەتمەندی و ئاسۆی بەرچاوی هیچ یەکێ لەو خەلقەندانە دەقاودەق نابێ لەگەڵ مرۆڤێکی تردا هـەروەها لـە شێوەدا و تەنانـەت چاوی چەپ بە چاوی ڕاست ناچێ هـەروەها هـەموو جووتە ئەنـدامێکی لـەش وەک گوێچکـە و کونـەلووت و دەسـت و پـێ و پەنجـەکانی ڕاسـت و چـەپ و تەنانەت نینۆکی پەنجەکانیش بە یەک ناچن و هی چەپیش بە هی ڕاست ناچێ و (ئاژەڵانیش تا ڕادەیەک هەمان باسیان هەیە) و ئیدی پێدا بڕۆ تا دەگەیتە ئەوەی دەنگی هیچ مرۆڤێک بە دەنگی مرۆڤێکی تر ناچێ و ئەوەشی بخەرە سەر کە دەنگ بەخۆی بە پێی تەمەن دەگۆڕێ. ئەگەر لـە خـەیاڵ و هیـوا و ئارەزوو و ئاواتی مـرۆڤ... هتـد ورد بیتـەوە دەبینـی جیاوازییـەکان سنووردار نـاکرێن و ئەگـەر پێکـەوەژیان و پێداویسـتییەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی جـۆرە هاوشـێوەییەکی سـەرقاڵبوونی بـۆ بـەردەوامی ژیـان دروست نـەکردبا، ئـەوەی کـە زەیـد دەیویسـت و ئـەوەی بـەکر دەیویست لەوپەڕی جیاوازیدا دەبوون. ڕەنگە سەرنجت دابێ شێوازی بیناسازی لە یەک شاردا، لە ڕووی شیواز و ئەندازیاری و پانی و درێژی نەخش و ڕووناک و هەواگۆڕکێوە ئەوەنـدە جیاوازییان هەیە سنووردار ناکرێ... ئەوجا ئاوڕ لە جیهانی باوەڕ بدەوە: چۆن باوەڕی ئەسکیمۆ لە هی هندییە سوورەکان و هوتنتوت و بیکمی و ئیسلام و ئەوجا مەسیحی... هتد ئاینەکانی تر دوور کەوتۆتەوە و لە ڕووی جیاوازی و تێکەڵاوی و زۆرییانەوە بوونەتە هەڕاجخانە و ئەگەر بەربەستی کۆمەڵایـەتی و پێداویستی و زۆر شتی تر نەبوونایە ئەو دینانە لێیان دەوەشایەوە یەکتری ڕیشەکێش بکەن چونکە هیچ دینێک نییە دینەکانی تر بە ناڕاستی تەواو نەزانێ تا ئـەوەی جـەنگی شارستانی کارەساتئامێز قەوماون و چەندین سەدە دەوامیان بووە و ئەوەندەیان خەڵک لەناوبردووە لەو منداڵانە زیاتر بوونە کـە هاتوونەتـە دونیـاوە و دوایـی دوایـان بڕاوەتـەوە. پـێم وایـە لـە یـەک کتێـب زیـاترم لـە سـەر عەشـیرەتی ئەمسـەر و ئەوسـەری دنیـا خوێندۆتـەوە بـە تایبـەتی لـە ناوچـە ناشارسـتانیەکان، بـە تـەواوەتی قـڕ کـراوە... لـە ڕاسـتیدا، ئەوەشـی پێـی دەڵـێن شارسـتانەتی، لـەو بـوارەدا کەمتەرخـەمی نـەکردووە و ڕەنگـە مەبەستیشـیان ئـەوە بـووبێ بـە هـۆی زیـادبوونی بەشـەرەوە قـەیرانی ئـابووری دروسـت نـەبێ!!! خـۆ پێـدەچێ بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـە چاوەڕوانکراوەکـە بیریـان لـە خەسـاندن نەکردبێتەوە... عارەب لە کۆنەوە کیژیان زندەبەچاڵ دەکرد (ناویان لەو کارە نابوو وەئد) و ئیسلام هەڵیوەشاندەوە بەڵام (جیهاد) وەک ڕوکنێک کە گەورەترینی چاکەکانە دەیان جار تۆڵەی کردەوە و

له ماوەی کەمتر له سەدوپەنجا ساڵدا دەسەڵاتی بە سەر ئیمپراتۆریای فارسدا گرت و بە سەریدا هند و ئەولاتریشی گرت، وەک تورکستان و زۆربەی ئەو خاکەی ئێستا پێی دەڵێن تورکیا... ئەوجا میسر و باکووری ئەفریقیا و ئەندەلوس... وڵاتی تری ناوەڕاستی ئەفریقیاش... پێی ناوێ زیاتری لە سەر بڕۆم، هیچ شوێنێکی ئەو ناوچە فراوانانە بە بێ شمشێر (زۆر بە دەگمەن نەبێ) نەچوونە ڕیزی ئیسلامەوە... مەسیحیەتیش کە لە سەرەتادا، ئەگەر لە ڕوومەتی چەپیت بدابا ڕوومەتی ڕاستی بۆ دەهێنایتە پێش، بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و هەر ئاڕاستەیەک پێی کرابێ پێی بگا، بووە دینی داگیرکاری و پێم وا نییە هیچ جەنگێکی ئاینی وەک جەنگی خاچهەڵگرەکان دووسەد ساڵی خایاندبێ، دوایی تورکەکان، دوای داگیرکردنی ئیستەنبوڵ هێرشیان کردنە سەر و لە ڕووبەرێکی فراوانی بەڵکاندا ئیسلامیان بڵاو کردەوە و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ دوژمنایەتی دینی و ئەتنی هەیە و کەس نازانێ چارەنووس لەداهاتوودا چۆن دەبێ.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە کۆمکاری قەومی و دینی زەقترین دیاردەی هاوبەشی و پێکەوەژیانن بەڵام لە هەمان کاتدا بوونەتە گەورەترین هۆکاری دابڕانی نێوان ڕەگەز و دینەکان... ململانێ لە سەر ئابووری لە سەر بنەمای باوەڕ جیاوازی لە نێوان خەڵکدا ناکات، ئەوەتا ساڵی 1914 ـ 1918 ئەمەریکا و ئەوروپا شەڕیان کرد و عوسمانلییە موسوڵمانەکان هاوپەیمانی ئەڵمان بوون، کەچی عارەبە موسوڵمانەکان لە دژی خەلافەتی عوسمانلی هاوپەیمانی ڕۆژاوا بوون. ئەوجا ناتەبایی و شەڕ لە نێوان مەزهەبەکانی یەک ئاین و حیزبەکانی یەک ڕەگەزدا قووڵ دەبێتەوە بەڵام چۆن ئاینێک بە ناو چەندین گەلی جیاوازدا بڵاو دەبێتەوە، ئاوهاش بیرۆکەی ئومەمییەت لە ناو هەموو گەل و ڕەگەزەکاندا لایەنگری هەیە. لە چەندین گۆشەنیگاوە بیرۆکەی ئاین و ئومەمییەت لە یەک دەچن: 1ـ نەفامترین و دواکەوتووترین خەڵک بە پەراوێزی هەردوو بیرۆکەکەوە وابەستە دەبن کە پڕە لە داستان و وەهم، ئومەمییەتی ڕۆژاوا دەستبەرداری شۆڕشی پرۆلیتار بوو بەڵام ئومەمییەتی کوردی و خەڵکی تری وەک کورد لە جیهانی سێیەمدا هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ ستالینپەرستی دەکاتە دروشم و دوای ئەوەی خەڵکی لینینگراد پەیکەری لینینیان ڕماند و ناوی شارەکەیان کردەوە بە پەترۆگراد، ئەوجا لینین دەپەرستن. سۆڤیەتیش وەک خانووی موقەبا هەرەسی هێنا (دوور نییە لە داهاتوودا دروست بێتەوە) 2ـ بۆ ئەوانەی وابەستەییان بە ئاین و ئومەمییەتەوە هەیە، لە زۆربەی بارودۆخەکاندا، باوەڕی ساکار و ئاسانی وەها لە زاریان شیرینە، کە لە لۆژیکی منداڵەوە نێزیکە و ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر لە دژی لۆژیکی عەقڵ و زانست دەوەستنەوە. 3ـ لە کاتی ڕوودانی بشێوێنی و جەزبەگرتنی سۆفیانەیاندا بۆ بەدەستهێنانی شەرەفی یەکەمایەتی، هەر یەکەیان بە پێی باوەڕی خۆی، لە سووتاندن و وێرانکردن و تۆقاندندا لە پێشی پێشەوەن و لایەنیکی[17] سیاسی حیزبی نییە کە لە بوارە گشتیەکاندا کار بکات، پڕ نەبێ لە قینی کوشندە و ئەوپەڕی جیاوازیشیان

له جیاوازی بیروباوەڕی دەستەیەک و دەستەیەکی تردا لە ڕۆژی هەڵبژاردندا دەردەکەوێ و ڕەنگە لە سەر (باج)ی هەڵکشاو یا خۆماڵیکردنی هەندێ بوار.. یا.. جیاوازییان هەبێ، بەڵام ئەو ڕەشەخەڵکەی کە لە حیزبدا نین لە هەموو لایەنەکانی تر کەمتر شەڕانین.. خۆش و جێی پێکەنین ئەوەیە کە وەرزێری میسری و هەندێ لە خەڵکی شارەکان دەنگی خۆیان بەوانە دەفرۆشت کە پارەی زیاتریان دەدا بەڵام دوای دەرچوونی ئینگلیز و سەربەخۆیی میسر، ئەو هەژارانە ئەو فرسەتەیان لە هەڵبژاردنەکانی تردا نەما، چونکە هەموو دەنگەکان بۆ پاڵێوراوی شۆڕش بوو و دەوڵەمەندمان دیت لە هیچ هەڵبژاردنێکی بەر لە شۆڕشیی 22ی تەممووزدا دەرنەچوو بەڵام دوای شۆڕش لە پێشی پێشەوە بوو. سۆسیالیزم جێی (دین و ئیمان)ی گرتەوە و پەیژەی گەیشتن بە شوێنی ڕێزلێگیراو و خەڵاتی بەرژەوەندی بووە بەڵای گەورە لەژیانی سیاسی و ئابووری میسردا.. داواکاری گشتی، (تەیموورلەنگ)ی سەردەمی خۆی بوو.. با قسەیەکی کورتی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە: لە پێش شۆڕشی تەمموزدا، بزووتنەوەی ئیسلامی دوو سەرەکوەزیرانی میسری کوشت کە سەر بە حیزبی سەعدی بوون، ئەوانیش ئەحمەد ماهیر و نەفراشی بوون. لە وەزارەتەکەی ئیبراهیم عەبدولهادیدا یەکێک (ڕەنگە لە یەکێ زیاتر بووبێ) دوای سەپاندنی تۆمەتەکە، لە سەر کوشتنی ئەو دوو سەرەکوەزیرانە ئیعدام کران.. لە سەردەمی شۆڕش و لە کاتی تەبایی نێوان موسوڵمانان و حکوومەتە تازەکەی میسردا، ئیبراهیم عەبدولهادی درایە دادگا و دوو پارێزەر ویستیان بەرگریی لێ بکەن، بەڵام دادگای سەربازی یەکێکیانی بەو تۆمەتە قەبووڵ نەکرد کە لە وەزارەتی تۆمەتباردا وەزیر بووە. کاتێ پارێزەرەکە چووە دەرەوە و گەیشتە سەر شەقامەکە، ئەم بروسکەیەی بۆ دادگا سەربازییەکە نارد: هیوادارم دادپەروەری دادگاکەتان ئەوە بە سەر ئیبراهیم عەبدولهادیدا بسەپێنێ کە لە دادگای 1920ی ئینگلیز بە سەریدا سەپێندرا. کە بێبەریکردنێتی لەو تۆمەتی کوشتنەی ئاڕاستەی کراوە. (ئەم ڕووداوە لە بیرەوەرییەکانی نوینەری وەفدییەکان، ئیبراهیم تەلعەتەوە وەرگیراوە). لاحەولە وەلا قوەتە ئیللا بیللا!!! حوکمی ئیعدام ڕاگەیەندرا، بەڵام، ڕەنگە بە هۆی ئەو بروسکەیەوە بووبێ، ئیعدام نەکرا. بۆ شیرینکردنی دوای ئەو تاڵییە، ئەمەش دەگێڕمەوە: یەکێ لە ئەفسەرەکانی شۆڕشی میسر (بە شۆڕشگێڕی ئەسمەر ناسراو بوو) لە جیاتی شەوێکی ڕابواردن، ڕێی بە یەکێ لە خوشکەکانی شافارووقی ڕووخاو دا بە خۆی و سامان و گەوهەرەکانیەوە لە میسر دەرچێ. (ئەم باسەش لە سەرچاوە میسرییەکانەوە گوازراوەتەوە).

پێشتر گوتمان لێکچوون لە نێوان ڕوخساری دوو مرۆڤدا نییە، هەروەها لە نێوان دوو چاو یا دوو گوێچکە یا دوو کونەلووتدا، بەڵام سەرسوڕمان لە شتی تردا دەردەکەوێ و لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەمەیە:

دەزانن دەنگی گیانداران (مەبەستم زۆربەیانە) لە ناو یەک جۆریاندا زۆر لە یەک دەچن و ئەو گیاندارە هەتا کەمتر پەرەی سەندبێ دەنگی تاکەکانی زیاتر بە یەک دەچن: جووکەجووکی چۆلەکە و زیکەزیکی بولبول و گیزەگیزی زەردەواڵە و کیفکەی مار.. زۆر لە یەکتر دەچن، دەشزانین ئەو دەنگانە لە گیاندارااندا، جێی زمانی مرۆڤیان بۆ گرتوونەتەوە، بەڵام مرۆڤ دەنگی هەیە و (زمان)ی ئاخاوتنیشی هەیە: دەنگیش بە گوێرەی باری دەروونی قسەکەر دەگۆڕێ، پێدەکەنێ و دەگریێ و گۆرانی دەڵێ و دەنگی تووڕەیی و خۆشحاڵی و گاڵتەپێکردن و دەستخۆشی و ڕەتکردنەوە و قەبووڵکردن... دەردەکا و هەموو ئەوانە ئەگەر لەگەڵ بابەتی زمانی ئاخاوتندا بەراورد بکرێن لەوپەڕی ساکاریدان. دەزانین گیانداران ناتوانن بۆ نموونە دەنگی خۆیان بە 100 جۆر بگۆڕن بەڵام ئەوە لە چاو (بیانوو و سەرسامی و ئیعجاز)ی قسەی مرۆڤەوە هیچ نییە، نەک تەنها قسەکردنی ڕوونکردنەوە کە خۆی لە خۆیدا سەرسوڕهێنەری سەرسوڕهینەرانە بەڵکو لە بەر شتێکی تری سەیرتر، یا با بڵێین لای من نهێنییەکی شاراوەیە هەتا ئەمڕۆ پەردەی لە سەر لانەچووە و چ تەفسیرم بۆی نییە، دیتمان گیانداران دەنگیان بە یەکتر دەچێ و هەر گیاندارە و دەنگێکی دیاریکراو بۆ مەبەستیکی دیاریکراو دەردێدێنێ و گیاندارە لێکچووەکان یەکتر لە مەبەستی خۆیان تێدەگەیەنن. بەڵام بەشەر ئەگەرچی کۆمەڵگا و لۆژیکی هەیە یەک زمانی هەڵنەبژاردووە و بە ژمارەی کۆمەڵگاکان زمانی هەیە و تەنانەت یەک کۆمەڵگەش شێوەزاری جیای هەیە و ئەوجا دوا بە دوای یەکتردهاتنی نەوەکان و لە دوای چوار پشت زمانەکە نامێنێ و ئەگەر شێوەزارەکانی یەک نەتەوەی گەورەی وەکو هند و چین و عارەب کۆ بکەیتەوە لە تێگەیشتنیان سەرسام دەبیت.

سەرسامبوونی من لەجیاوازی زمانەکاندا تا ئەو ئاستە لەوەوە دێ کە دایک و باوکی زمان عەقڵە و ئەگەر مرۆ بە تێگەیشتن لە خەسڵەتی شتەکان لە هەموو جیهاندا یەک جۆرە هەوجاڕ دروست دەکا و ئەو دیوارانەی دروستیان دەکا لە یەک دەچن و میوەیەک لەگەڵ میوەیەکی تردا، لە ئوسترولیا و فینلەندا موتوربە دەکا و قوماش دەچنێ.. و ... مەحاڵبوونی یەک شێوە تەعبیرکردن لە بارانبارین لێرە و لەسەنغافوورە لە کوێوەیە؟ من دەزانم وەک نیگاری ئاسک بە بێ زمان دەلالەت لە ئاسک دەکا، تەعبیرکردن لەژمارە (2) بە (1+1)ش قسەی ناوێ و هەردووکیان (تەجرید)ن، بەڵام زەحمەتە قەبووڵ بکرێ بۆچی یەک وشە لەناو نەتەوەکاندا بۆ یەک مەبەست پەیدا ناکرێ! هەر دەڵێی هەموو عەشرەت و میللەتێ لە جیهاندا سوور بووە لە سەر ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی ئەو وشەیەی کە عەشرەت و گەلی تر بەکاریان هێناوە. قسەشمان لەسەر دەستە سەربەخۆکانە نەک ئەوانەی لە یەک سەرچاوەوە هاتوون و داوای لێکچوونی ڕێزمان و بەشەکانی ئاخاوتن و گۆڕینی (فیعل)یشمان نەکردووە بەڵکو دەمانەوێ وشەیەکی وەک وشەی (ماء)ی عارەبی کە

هەزاران ساڵ بەکارهاتووە لە ناو قەومەکانی تردا نایبینین. کتێبی عارەبی باسی پیاوێک دەکا کە گوتبووی لە وشەی بێگانە واتای نێزیکی تێدەگەم و وشەیەکیان لە ڕۆمانی (وەک لە بیرم بێ) لی پرسیبوو گوتبووی: توندوتیژی یا ڕەقیی تێدا دەبینم... بەڵام من وشەی (رق)ی عارەبی پێ دەڵێم کە نەرمونیانی و سۆز دەدا کەچی لە کوردیدا (ڕەق) توندوتیژی و بەهێزی دەدا و لەو دوو زمانەدا زۆر لە پێچەوانەوە نێزیکن. بۆ نموونە لە عارەبیدا پیتی ڕابردە لە سەرەتای فیعلەوە دەبینی و تەنها نیشانەن و بۆ ئەرێتی و ڕوودان دەست نادەن. کە دەڵێی: 'یدخل ـ دەچێتە ژوورەوە' ئەوجا نەفی دەکەیتەوە: 'لا یدخل ـ ناچێتە ژوورەوە'. ئەو (ي)یەی سەرەتا لەجێی خۆیدا ماوە ئەگەرچی (لا)ی نەفی لە پێشیدا هاتووە. کەچی لە کوردیدا دەڵێی: دەکەم، ئەوجا نەفی دەکەیت و دەڵێیی: ناکەم و (دە)ی داهاتوو بەزر دەبێ و (نا) جێی دەگرێتەوە. ئەگەر بە پێوانەکاری عارەبی لەگەڵدا بکەی دەبێ بە کوردی بڵێی: (نا دەکەم). بە کورتییەکەی زمانی گەلان لە سەرچاوەی جیاوازەوە بێ ئەوەی پەیوەندییان بە یەکەوە هەبێ دارژاون و لە دارشتنت و شێوەی واتادا داهینانی جیاواز کراون وئەگەر ئەو خەڵکانە دانیشتووی ئەستێرەی جیاواز بوونایە، جیاوازی دەربڕینیان لەوە زیاتر نەدەبوو. سەیری ئەو سەیرەی ڕێزمانی عارەبی لەکتێبدا بکەن کە دەڵێ: پیاوێک لە کیژێکی ناوچەیەکی نێزیکی خۆیان پرسیاری بابی کرد، ئەویش گوتی: 'فاء الی الفیفاء لیفئ الفئ حتی إذا فاء الفئ یفئ' واتاکەشی: چۆتە بیابان تا ڕاوی نێچیر بکا و ئەگەر سێبەر درێژ بێ دەگەڕێتەوە..

زۆر جار بیر لەم ئایەتە دەکەمەوە (وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا) دەبینم جیاوازی زمانەکان تا ئەو ئاستەی کەسێکی عەشرەتی (ک) لە کەسیکی عەشرەتی (م) تێنەگا، بە مەحاڵی دەزانم خەڵکانێک لە زمانی یەکتر تێنەگەن، یەکتر بناسن بە تایبەتی مەودای نێوانیان چەند مانگیک ڕێ بێ و هەندیکیان (بەر لە دۆزینەوەی ئەمەریکا) کەس لە دنیاکەی تردا ئاگای لە بوونیان نەبووبێ. ئەگەر کۆمەڵگەی یەک وڵات کە بە یەک زمان دەدوێن و یەک دینیان هەیە و پێغەمبەران لەناویاندا ژیابن ببێتە ناخۆشییان و فێڵ لە یەکتر بکەن و لە سەر تەماح جەنگ بەرپا بکەن، چۆن خەڵکی سکۆتلاند لەگەڵ خەڵکی ژاپۆن و ئەمەریکادا یەکتر دەناسن کە یەکتر نابینن و لە هەموو شتێکدا لێک جیاوازن و خەڵکانێکی تر لە دووریی دە هەزار میلەوە نەیبیستوون. خۆزگە دانیشتوانی یەک وڵات و یەک گەڕەک و یەک بازاڕ یەکتریان دەناسی و لەگەڵ یەکتردا بە ویژدان دەبوون تا ئەگەر کێشەیان بوو بە چاکە چارەسەری بکەن.. بە داخەوە کێشەی نێوان خەڵکی، بە تایبەتی دواکەوتووەکانیان، لە ڕوودانەوە نێزیکە نەک چارەسەر. ئەگەر شوێنەکە قەفرایەکی چۆڵوهۆڵ بێ و شتێکی وای تێدا نەبێ تەماح ببزوێنێ نەفسی بوغرای زەلیلکردنی خەڵک دەبزوێ و نەفسی ئەو نەفرەتەی بەسە خۆ فش بکاتەوە و پەڕەکانی خۆی گیف بکاتەوە و لووتی بەرز بکا و بڵێ: کەس هەیە بێتە مەیدانم؟

ئەگەر زانیمان وشەی لێکچوو بە شێواز و واتاوە لە زمانە جیاوازەکاندا هەیە، لەمێژووی بەنیئادەمدا نەبووە ڕێزمان (شیکاری و حاڵەتی ناو و کار و شتی تر) لە زمانەکاندا لێک نێزیک بن وەک گۆڕینی کار و کات و ڕابردوو و داهاتوو و فەرمان و (لازم) و (موتەعەدی)یان و شێوەی بە (تەعدی)کردنی لازم و حاڵەتی ناو و بکەر و کارتێکراوی تاک و کۆ... تا وردەکاری دوور و درێژ کە لە کتێبی زمانەوانیدا باسیان کراوە. هۆکاریش ئەوەیە، عەقڵ چۆن بۆ تەڵە و کشتوکاڵ و چنین چووە هەر ئاوهاش بۆ ئەوەیان چووە و هەموویان مەسەلەی ماددی بەرهەستن و هەندێ گیانداری تریش لە ڕووی پێویستی ژیانەوە ئەو جۆرە ڕەفتارانە دەکەن بەڵام شیکردنەوەی (کار) ڕەهایە بوونی هەستپێکراوی نییە و نە بە گەز دەپێورێ و نە دەژمێردرێ و نە بە قزناغ دەپێورێ و نە دەکێشرێ و نە دەگوازرێتەوە... مەسەلەی ناویش وایە چونکە خاوەنی ناو مرۆڤێکە بوونی هەیە و هەستی پێ دەکرێ، وشەی "رجل" تەنها لە عارەبیدا هەیە بەڵام "رجال" بە عەقڵ دادەتاشرێ و ڕەنگە لە هەموو زمانیکدا ئەوە بکرێ. ئەگەر لە ڕستەیەکی تەواودا، حاڵەتی (بکەر) بێ بکەرییەکە خۆی ڕەهایە و بوونی ماددی هەستپێکراوی نییە. یا ئەگەر (کردار) لە ڕابردەوە کرایە داهاتوو لەهەردوو حاڵەتەکەدا ڕەهایە و بوونی ماددی نییە. لەمەوە بۆت دەردەکەوێ کە بارودۆخی وشە کە پێیان دەڵێین ڕێزمان ڕێی هەیە لە هەموو زمانەکاندا لێک نێزیک بن چونکە تەواوکەری قسەن، تا ئەوەی هەندێ لە زمانە کۆنەکان وشەیان تێدا دووبارە دەکرایەوە تا واتای کۆبدەن. ئێمە و خەڵکی تری ناعارەب شێوەی جووت (مثنی)مان نییە و وشەیەک بۆ دیاریکردنی جووت دادەنێین ودەڵێین: (دوو پیاو... دوو مەل two birds و بەو شێوەیە)

لە سەردەمی ڕابردوودا دەکرا قەومێک سەرنجی کاروباری قەومێکی دراوسێی خۆی بدا، وەک پرسە و زەماوەند و شێوەی خواپەرستی و جەژادانەوە و شێوازی ڕاووشکار بە سەگ و بە چەک و سەکۆی زۆرانبازێ و هونەرەکانی مێوانداری.. هتد و لەوانەشەوە وشە لە عەشرەتێکەوە بۆ یەکیکی تر یا لە وڵاتێکەوە بۆ یەکیکی تر دەگوازرانەوە. بەشی ژنی کورد ئەوە بوو لە لووتەوانەدا لاسایی ژنی عارەب بکاتەوە ئەگەرچی ناشرینی و ئازاریشی هەیە.. هەروەها کونکردنی نەرمەی گوێ بۆ گوارەش، خوا موبارەکی نەکا... لەم بوارەدا قسەیەکی باوکم لە سەر هەڵپەڕکێیەکی کوردی بیر دێتەوە کەپێی دەگوترێ سێپێیی و دەیگوت لە جۆماڵ و هەڵگێڕانەوەی خاک وەرگیراوە چونکە بزاوتنەکان لە هەردووکیان لە یەکەوە نێزیکن. خۆشبەختانە بۆم دەرکەوت کە ناوی هەڵپەڕکێکە لە وەرگێڕانی خاکەوە وەرگیراوە چونکە لەوەشدا هەردوو لاق و بێڵەکە دەبن بە سێ.

بە گوێرەی ئەوەی کتێبی مێژوونووسان و دۆزەرەوەکان باسی دەکەن هەندێ عەشرەت کە بە شارستانییەوە وابەستە نین لە ڕەفتاردا توندوتیژ بوونە و بەزەییان بە بێگانەدا نەهاتۆتەوە و دوای

کوشتنی گۆشتەکەشیان خواردووە و بۆچوونیان تەماوی بووە و وەک بۆچوونی نەتەوەکانی تری وەک یۆنان و چین و ڕۆمان و لەپێش ئەوانیشدا سۆمەر و ئەکەد و خەڵکی بابل و ئاشوریەکان و ڕۆشنبیری زەردەشت (نێزیکەی دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ تا سێ هەزار ساڵ بەر لەئێستا) بەرهەمی نەبووە ـ لە پلاتۆن (سەدەی پێنجەمی پێش زاین)ی دەگێڕنەوە گوتوویەتی زەردەشت شەش هەزار ساڵ بەر لەو ژیاوە و نەمدی گرنگی پێ دەرابی و لای بە لای ئەو بابەتەدا بکەنەوە، جێی سەرسوڕمانیشە هوتنتوت و بیکمی و قەبیلەی وەک ئەوان ئەوەندە دواکەوتوو بوون عەقڵ نەیدەبڕی و لەهەندێ ڕیپۆرتاژی تەلەڤزیۆنەوە پێمان دەڵێن ئەو دواکەوتووانە ئێستاش گۆشتی مرۆڤ دەخۆن.. سەرۆکی عەشرەتیان دەسەلاتی خوایانەی هەیە بەڵام سەرجەمی مەسەلەکە بە لای شاردنەوەدا دەشکێتەوە، چونکە ئەفریقیا بووە چەندین دەوڵەت و تیایاندا لە مەودای پێشکەوتنی شارستانەتیدا زۆریان بڕیوە و هەندێ لە شارەکانیان لە ئاستی شارەکانی ئەوروپادان و سەیرانگەیان هەیە بە تایبەتی (قەڵەشی مەزن) کە مرۆ سەرسام دەکا.. خۆزگە بەشەر خۆشی وەک ئەو دیمەنانە و وەک دەستکردەکانی خۆی جوان بوایە، بەڵام...

نیگاری ناشرینیی و پڕوپووچیی و زوڵم و ساختەکاری و فیتنەبازی و گێرەشێوێنی و.. و.. هەتا کۆتایی لستەیەکی دوور و درێژی لەو بابەتە شتە خراپانە زۆر زۆرە و کۆمەڵگەی مرۆڤیان کردۆتە خۆراکێکی حەزبزوێن بەڵام خوێیان زیاد تێ کراوە یا نەوتیان پێدا کردووە و دوو لە سەر سێ بەشی تاموچێژی لە دەست داوە و دوور نییە وەک خۆراک بەکەڵک نەیێ... لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانین ئەوەی لە بارەی ئارەزووی نەفسەوە بۆ بەدەستهێنان و پێشڕەوایەتی و کەم و زۆر هەرچی بۆ ئەوانە پێویستە و گوتمان، بە بەکارهێنانی توندوتیژیشەوە، لە ئارادا هەیە بەڵام مەرج نییە هەرچی پایەدار و ماڵدار و دەسەڵاتدار بێ زاڵمیش بێ، چونکە ڕوو دەدا بەهێز و بەدەسەڵات بە هۆی لێبوردەییەوە زوڵم نەکا و خۆشی لە حەرام ببوێرێ وەک ڕێی تێدەچێ جەماوەری نەدار و بێ دەسەڵات هەموویان مەلایەکەت نەبن، بەڵام زۆرینەی بەهێزەکان بۆ بەدەستهێنانی سامان و ئارەزووەکانیان پەنا بۆ هێز بەرن، وەک چاوەڕوان دەکرێ زۆرینەی هەژاران بە پێی بەرەیان پێ ڕاکێشن و ئەوانە بارودۆخ و دیاردەی ئاسایین و جێی سەرسوڕمان نین و چ زەرەر بەو کەپرە کۆمەڵایەتییە ناگەیەنن کە سێبەر لە زۆرینەی خەڵک دەکا... لە ڕاستیدا من لەگەڵ خۆمدا بەوە ڕازی دەبم کۆمەڵگە وەک بازاڕ بەڕێوە بچێ کە تیایدا هەر لایە و دەیەوێ بە موعامەلە و نەختێ لە قازانجی کڕین و فرۆشتن بە پێی بوون و داخوازی (عرض وطلب) دایناوە، دڵی ئەوی تر ڕازی بکا. ئەگەر لاپەڕەکانی ڕابردوو هەڵدەینەوە دەبینین (بازاڕ) وردترین پێوەرە بۆ ڕەزامەندی و نارەزایی خەڵک (قسەم لە سەر بارودۆخی ئاساییە نەک کاتی بەرەڵایی و زوڵمی ئاشکرا) و مزێچی تاکەکەس لە دانانی نرخی کەرەسەیەکدا کە بۆ فرۆشتن دانراوە جێی نابێتەوە بەڵکو ئەمانە

یەکلایی دەکەنەوە: 1ـ چاک و خراپیی کەرەسەکە. 2ـ کەم و زۆریی کەرەسەکە. 3ـ ئارەزووی خەڵک بۆ کڕینی. بازاڕ لە ڕاگرتنی تەرازووی خۆیدا گردەبڕە و گەورەترین فەرمانبەری شارەکە و بەتواناترین کەسی ناو خەڵکەکە بیر لەوە ناکەنەوە ئارامیی و جێگیربوونی بازاڕ لە دانانی نرخدا بشێوێنن و ئەوەش وەک مزگەوت و دێر و کەنیسە و شوێنی خواپەرستی هی هەموو میللەت و عەشرەتانە کە هەموو کەس لە ژێر کاریگەری ڕێوڕەسمی خواپەرستیدایە و وا نەبێ پەیوەندی بەهێزی نێوان خەڵک و خوا نامێنێ... ئەگەر گومانی مەترسی بازاڕ و جێی خواپەرستی پەڕییە دڵی بێدینەکانەوە، دەبێ هەمیشە لە بیرمان بێ کە بۆرژوای مەلعوون (بە پێی بۆچوونی ئەوانەی کە دەیانەوێ بیرووخێنن) کاری خۆیان سەربەخۆیانە ئەنجام داوە بۆ بەستنەوەی ئەمسەر و ئەوسەری دنیا بە یەکەوە و پێداویستی بوون نەبێ هیچ شتێک ناپارێزێ بە بێ ئەوەش شارستانەتی پێکنایێ. تەنانەت ئەوەشی کە پێی دەڵێن ڕێگای ئاوریشم سەرسوڕهێنەرییەکەی دەگاتە ئاستی دیواری هەرە مەزنی چین و بەوەش کە ڕێگاکە هەر خۆی دەوامی بە خۆی دا و بەردەوامبوونی بە پێی پێداویستی خەڵک بووە، لە دیواری چینیش سەرسوڕهێنەرترە.. گرنگی شوێنی خواپەرستیش ئەوەندەی بەسە کە لەگەڵ ئەو هەموو مەترسییانەشدا کە دەهاتنە ڕێگای ئەوانەی دەچوونە حەجی مەککە و قودس، هەر بەردەوام بوو و جگە لەوەی خوا لە گوناهیان خۆش بێ هیچ مەبەستێکی تریان نەبوو. ئەگەر خوانەناس حەزی لێیە بە بیانووی ئەوەی کە دین فێڵی بۆرژوایە بۆ سەرقاڵکردنی خەڵکی ساکار تا بەرژەوەندی ڕاستەقینەی خۆیان نەبینن، با وریای هۆشیارییە ئاوەژووەکەی خۆی بێ، چونکە ئاین لەو ڕوانگەیەوە بەهێزتر و گرنگتر دەبێ و وابەستەیی خەڵک بە شتێکی پووچەوە تا ئاستیماڵبەختکردن و گیانبەختکردن لە پێناوی بەهەشتێکی خەیاڵیدا نیشانە و دەلالەتی پیرۆزی وەهای تێدایە لە سەرەوەی بیرکردنەوەدایە. ئەگەر ئاین بە ڕاستی و زرپوزندوو لە خواوە بێ جێی سەرسوڕمان نامێنێ بەڵام خەڵک لە پێناوی پایەداری و ناوداریدا سەروماڵی فیدای بکا، ڕاست نییە، تەماشا بزانە پلەوپایەی دین لە کوێ و پلەوپایەی شەرەف و کەرامەت لە کوێ! تۆ چەند کەموکوڕیی لێ بدۆزیتەوە و بەڵگە بۆ ئەوە بێنیتەوە کە ناڕاستە، ئەو لای باوەڕداران بەرزتر و جوانتر دەبێ. ئەوجا ماتریالستەکانی جیهانی سێیەمی ئێمە کە تووشی نەزۆکی فکریی بوونە لە بەهێزکردنی بیری مارکسیزمدا (فەلسەفەی مارکسی بە گشتی لەوە جیاوازە کە تووتییە سیاسییەکان دەیڵێنەوە) هەمان ئەو کارانە دەکەن کە باوەڕداران بۆ بەهێزکردنی ئاینی خۆیان دەیکەن. ئەوەتا سۆڤیەت ڕووخا و شێتییە خوێناوییەکانی ستالین ئاشکرا بوون و درەوشانەوەی لینین نەما بەڵام چۆن دەروێش بە ڕدێنی شێخەوە وابەستەیە، ئەوانیش ئاوها بە تیۆری سەردەمەکانەوە وابەستەن. لە جێیەکی کوردستان دادەنیشێ و دڵداری لەگەڵ ئەو ڕۆژەدا دەکا کە بە قودرەتی قادر چەوساندنەوە نامێنێ و ئەو پرۆلیتاریایەی کە هێشتا لە کوردستاندا لەدایک نەبووە، دەبێتە خاوەنی تاج و عاسا و ئاسمانیش هەنگوین و حۆری دەبارێنێ و

وەی لەو مارکسییەی باشترین داهێنەرە! لای حاڵلێهاتووەکان مەسەلەکە ئاسانە چونکە لە سەرەتاوە عارەبانەی دوای ئەسپ دروست دەکەین ئەوجا عارەبانەی بە مەکینە ئەوجا بە هەڵم و ئەوجا قەتاری جۆری دەگمەن و ئەوجا و ئەوجا... هەتا بە فڕۆکەی دەستی کرێکارانی ئەحمەدئاوا و قرناقە دەفڕین و نەوت و بەنزین و سووتەمەنیشمان بۆیان هەیە... بژی ستالین... ماو... مەسەلەکەش چ کەموکوڕی تێدا نییە ئەوە نەبێ کە نازانین فڕۆکە بەکار بێنین و کام جۆرە بەنزین بۆی دەبێ و چۆن فڕۆکەخانە و ئامێرەکانی ڕێنماییان بۆ فڕین و نیشتنەوە دروست بکەین بەڵام بە ڕینماییەکانی ستالینی داهێنەر بە سەر ئەو کێشانەدا زاڵ دەبین. ئەدی ئەو خاوەنی موعجیزەی بەکۆیلەکردنی وەرزێر و کرایکارە ڕووسییەکان نەبوو؟ لە خەساندنی ئۆکراینیەکان و پۆڵۆنییەکاندا ئەوەی نەکرد کە قەیسەرەکان لەگەڵ ئەو دوو گەلەدا پێیان نەکرا؟ جگە لەوانە، ئەوە ئەو بوو لە هیچەوە نایابیی ستیخانۆفی داهێنا تا وای لێ هات ئۆتۆمبیلی سۆڤیەت لە لستی ئۆتۆمبیلەکانی جیهاندا لە هەرە دواوە بێ.

هەموو باوەڕێک چەندیش پیرۆزیش بێ بە تەواوەتی بۆش دەبێ ئەگەر بێت و ببێتە (دۆگما Dogma) چونکە لە ڕیزەکانیدا دیندار و سیاسەتمەداری توندڕەوی بۆچوونێکی زانستی دیاریکراو یەکسان دەبن و لە هەگبەی مەعقوولەکانیشدا شتێ نییە لە سەرەوەی دەمەتەقێ و تاقیکارییەوە بێ، سەیر لەوەدایە خاوەن یەک باوەڕ، وەک سۆسیالیزم، لە لێکدانەوەی واتا و بنیاتیدا، بە گوێرەی جیاوازی سەرکردەکانیان جیاوازییان هەیە و ململانێی نێوانیان گەرم دەبێ و لە ئەنجامدا لێیان دەبێتە دووبەرەکی و دوژمنایەتی وەک ئەوەی لە نێوان ڕووسیای کۆمۆنست و چینی کۆمۆنستدا ڕوویدا و زۆری نەما لە دژی یەکتر بچنە جەنگەوە. جۆرج بوش[18] لە سەردەمی ماودا سەردانی چینی کرد و خێرهاتنی کرد و ڕێشاندەری لەگەڵدا نارد بۆ دیتنی تۆڕی ئەو نەفەقانەی کە بۆ خۆپارێزی لە بن پەکیندا دروست کرابوو و پێی گوت: ئەوەی دیتت یەدەگێکە بۆ خۆپارێزی لە ڕووسیا نەک ئێوە!! ئەم نموونەیەم بۆیە لە بیر ماوە چونکە ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی تێدایە خاوەن فەلسەفەی پرۆلیتاری یەک چارەنووسیان هەیە.. بەڵام ئەو دەوڵەتانەی یەک فەلسەفەیان لە سیاسەت و مێژووی دا نییە و باسی هاوچارەنووسیی ناکەن و بە درێژایی مێژوو ململانێی یەکتریان کردووە و تەنانەت دەوڵەتە ڕۆژاواییەکان لە دژی ئەڵمانیا، لەجەنگی دوومی جیهاندا بوونە هاوپەیمانی ڕوسیای کۆمۆنست.

هەرچۆنێ بێ، گۆشەنیگا لەم جیهانە نەخۆشەدا بۆ چنینەوەی نموونەی باوەڕهێنەر زۆرە کە کۆمەڵگەی مرۆڤ بە سەرجەمەوە نەخۆشخانەی شێتانە... شێتایەتیش خۆی لە خۆیدا پلە و جۆری خۆی هەیە و تەنانەت سروشتی تایبەتی خۆی هەیە کە لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تری جیایە.

تووشبوو جیاوازە. دەکرێ بە پلەکانی ڕەفتاری شێتبووندا بچی بەر لەوەی تاقیکردنەوە لە سەر جۆری شێتبوونەوەکەی بکەیت. خەڵکم دیوون بە بێ هیچ بۆنەیەک و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ئاوڕت لێ دەدەنەوە یا بە بێ هۆ بزە دەکەن یا هاواری فریاکەوتن بۆ غەوسی گەیلانی دەکەن... تەنانەت گوندنشینێکم لە ماڵی ماممدا دیت کە گڵۆپی بینی بە بێ ئاگر ڕووناکایی دەدا، لە بەر پێکەنین زۆری نەمابوو ببووریێتەوە کەچی گوندنشینی ترم دیبوو کە یەکەم جار ڕادیۆیان دی سەرسام نەبوون و هەموویان هەواڵی کارەبا و ڕادیۆیان بیستبوو و جیاوازییان لە یەکتر بە هۆی زانیاری پێشەکییانەوە نەبوو. بەڵام ئەو جۆرە غەفڵەتە زەرەری نییە مادام ڕەفتاری کەسەکە خۆی ئاسایی بێ بەڵام زەرەر لەوەوە دێ بە ڕێگەی ناشەریفانە ئارەزوو تێر بکرێ و ڕێی تێدەچێ ئەو (ناشەریفی)یەش مەترسییەکانی کەم بێ بەڵام ڕێگەدان بە کەم، بەرەو زۆر و گەورەت دەبا و دەزانیت سوعبەتێکی ساکار ڕەنجانی بە دوودا دێ و بۆی هەیە ببێتە هۆی شەڕ و خوێنڕشتنی وا کە بەندکردن و جەزای لێ پەیدابن. بەهیچگرتنی هەستی خەڵک خۆی لە خۆیدا تاوانە و ئەگەر قسەی سووکی بە دوودا هات، لێدان و خەنجەر و چەقۆهەڵکێشان و کوشتنی شوشتنەوەی عاری لێ دەکەونەوە.. گەلێ جار ڕوو دەدا کەسێک بۆ بەردەوامی قسان نوکتەیەک بۆ هاوڕێیەکی خۆی دەگێڕێتەوە و ئەویش لێکی دەداتەوە تا گوناحێکی هێند گەورەی لێ دادەتاشێ کە موسیبەتی لێ بکەوێتەوە. پەیوەندییان پچڕان و نائارامیی تێ دەکەوێ. ئەمە ڕاستییەکی نەفرەتییە و لەڕەوشتی زۆر کەسدا ڕاستە و سەرچاوەکەی بە شێوەیەک لە شێوەکان (خۆویستی)یە و وەک کەسێکە مێگەلە مەڕ بەرداتە دەغڵی دراوسێکەی و گوێ نەداتێ بەڵام کەسێک هێسترێکی کردە دەغڵەکەی ئەوەوە پەنا بۆ شەرع و مافی هاوسێتی و ڕەوشتبەرزی دەبا.. ئەوانە پەراوێزی بێزارکەری کۆمەڵگەن بە تایبەتی لەوانەدا کە لە کاروانی شارستانەتی جێ ماوون و شێوەی ڕەفتاری نایاسایی وەک دەستکاریکردنی سەعاتی ئاو و کارەبا و فێڵکردنی بەقاڵ لە کێشانەی بە دوادا دێ... خەڵکی تریش بە بێ هۆ و بێ دوژمنایەتی و دەستکەوت سەرقاڵی هەڵبەستنی درۆی زیانبەخشن و هەندێ جار درۆی وا دەکەن نە قازانجی هەیە نە زەرەر، بەڵام نەخۆشییەکی دەروونییە و تووشی خەڵک دەبێ و زمانی خۆی پێ ناگیرێ. خەڵکی تر، دووچاری شێتبوونی دزیکردن یا شێتبوونی خۆبەزلزانی یا ئەویندارى خۆیان و نەخۆشی تری دەروونی بوونە و کۆمەڵگە لە بری (باج)ی نائاگایی ناپێگەیشتوویی خۆی دەیدا و زۆربەشیان خەڵکانێک دەگرنەوە چ تاوانیان نییە بەدبەختی و ڕێکەوت نەبێ.

خەڵک هەن کە لەدایک دەبن حەزی گوێگرتنی پەنادیوار و جاسووسێتییان لەگەڵدایە بە تایبەتی تەماشاکردنی عەورەتی ئافرەت. لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە یەکێ لەوانە بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ یەکێکی تردا لە سەر کیژێک کە ویستوویەتی بیخوازێ ململانێی هەبووە و کیژەکەش لای بە لادا

نەدەکردەوە. فرسەتی ئەوەی قۆستبۆوە کە حەمامی ماڵی ئەو کیژە بە قەد ماڵیانەوە دەبێ و ئەمیش کونێکی وای لێ دەکا بەشی وینەگرتنی کیژەکە بکا بە ڕووتی. ئەوجا شانازی بەوەوە دەکرد کە وینە ڕووتەکەی ئەو کیژەی بە ناو خەڵکدا بڵاو کردۆتەوە و گەیاندویەتیە دەستی ئەو کەسەش کە بە تەمای بووە. شانازی دەکرد کە ئاوها ئابڕووی برد و بە دەستی هێنا. بۆ زانیاری زیاتر ئەو هیچوپووچە قایمقامی کۆیە بوو و پێم وایە دوای ناتەبایی چەند مانگێکی نێوانمان دەیویست بەو باسە خۆشەویستیم بە لای خۆیدا ڕاکێشێ. با ئەو شایەدییەش بدەم کە ئەو ئافرەتە نموونەی بەئەدەبی و ڕەوشتبەرزی و عاقڵی بوو... خوا کاری خۆی بە خەلقەندەکانی خۆی هەیە!!

جۆرەها دەستدرێژی تاک هەیە بۆ سەر خەڵکی هەر لەبەر ئارەزوویان لە دوژمنایەتیکردنی خەڵکی تر... دەستکەوتیان تەنها تلیاکی دەروونی نەخۆشە.. لەزەتکردنە لەو بەڵایەی کە بە سەر خەڵکدا دێ. لە هەموو ئەوانە مەترسیدارتر ئەو جۆرە تاوانکارانەن کە پلان بۆ فیتنەییەک دەگێڕن کە زۆر کەس دەگریتەوە بێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ دەستکەوتێکی ماددی یا مەعنەوی بێ. ئەوە وێنەیەکی خراپەکاری ڕەهایە و تەنها لەپێناوی خراپەکاریدا بە خوینیاندا دێ و دەچێ. لە ڕاستیدا، لە دەروونی زۆرینەی خەڵکدا، چاکەکان و خراپەکان، حەزێکی ساکاری ئەوە هەیە خەڵک بکەونە بارودۆخی ناخۆشەوە تا بزەیەک بیانگرێ. لای هەندێ کەس ئەم حەزە بەهێزترە و دەگاتە ئەوەی ئەم و ئەو بکەونە بارودۆخی وەهاوە ببێتە مایەی شەرمەزاربوونیان. هی تریشیان هەن تەڵە بۆ خەڵکی ساکار و نیەتپاک دەنێنەوە و ئەوانیش نازانن جۆن لەو تێکەوتنە دەرباز ببن. ئەوجا مەیلی خەڵکی تر لەوەدا بەهێزتر دەبێ کەبە ڕیشی خەڵکی تر پێبکەنن و ئازاری بدەن و زەرەری پێ بگەیەنن یا بیخەنە هەڵوێستێکەوە کە کەرامەتی مرۆڤ ڕەتی بکاتەوە. ئەوەی جێی سەرنجە ئەو جۆرە بەشەرانە ئەو جۆرە کەسانە تێوەدەگلێنن کە توانای بەرپەرچدانەوەیان نییە. لە کتێبی هەزار و یەک شەودا چیرۆکێک هەیە دراوەتە پاڵ کەسانی دەسەڵاتدار کە ژیرییان هەیە و یەکێ لەوانە ئەبو نەواسە کە لە مەجلیسی ڕەشیددا گوتوویەتی: ڕێکدەکەوێ بیانووهێنانەوە لە ڕەفتارەکە خراپتر بێ، ڕەشیدیش بەرپەرچی دەداتەوە. دوایی کە هەڵدەستن، ئەبونەواس دەست بە پاشەڵی ڕەشیددا دێنێ و ئەویش تووڕە دەبێ و سەرزەنشتی دەکا، ئەبونەواسیش دەڵێ: گەورەم ببوورە، وام زانی ست زوبێدە بوو. ڕەشیدیش پێی گوت: هەی نارەسەن بیانووەکەت لە ڕەفتارەکەت خراپترە! داهێنانی ئەم باسە کە لە خەیاڵی خەیاڵبازانیشدا جێی نابێتەوە، دوو هۆی هەیە: یەکەمیان سەلماندنی لێهاتوویی حەکایەتخوانە، دووەمیشیان خۆشی بەرزبوونەوەیەتی بۆ ئاستیک کە ڕەشید لە لێهاتوویی حەکایەتخوان سەرسام بێ. دیارە ئەو خەلقەندەیە کە لەهەموو توانا و پلەوپایە داماڵدراوە، بەوە داناکەوێ نوکتە لە سەر کەسانێک بگێڕێتەوە کە لە ئاستی حەماڵ و فەڕاشدابن.

دەزانین بەڵگەنەویستە کە ئافاتی جەنگ گەورەترین ئافاتە کە تەڕ و وشک دەسووتێنێ و منداڵ و پیر دەکوژێ و گوند و شار لەناودەبا و پەتا بڵاو دەکاتەوە و برسێتی و نەخۆشی و ماندووبوونیش دەبنە یارمەتیدەری بۆ زیادکردنی ژمارەی مردوو. من لە لای خۆمەوە باوەڕم وایە کە بەرپابوونی جەنگ زەقترین بەڵگەیە بۆ بێویژدانی بەشەر (دەستەیەکی پاکژی لێدەرچێ کە بەشەر و شارستانەتییان خۆش ویستووە) ئەوە چ ئیفلاس و دارمان و دڕندەییەکە مرۆڤێک شەرم بکا سووکایەتی بە کەسێک بکا و دوایی وەک گرکان بە سەر خەڵکدا بتەقێتەوە و هەر بە دروێنەکردن دروێنەیان بکا و چاو نەترووکێنێ!! ئەگەر مەیدانی نەفرەتلیکراوی جەنگ جیبهێڵین و دەروونی خەڵک، چ تاک و چ کۆمەڵ، هەڵکۆڵین خەرمانێک بە دەست دێنین کە جێی دڵخۆشی نییە و ئەوانەش جۆر و پلەیان هەیە و یەکەمیان ئەوانەن دووچاری نەخۆشی دەروونیی بوونە و چارەسەر ناکرێن یا چارەسەریان قورسە، لەمەدا جیاوازیش لە نێوان سادستیکی خوێنڕێژ و کەسێک ناکەم کە بە توندوتیژی و ئازاردان خۆی دەسەپێنێ چونکە لە دەستی دێ لەگەڵ خۆسەپاندندا تاوان ئەنجام بدا.

خەڵکی تریش هەن لە سەر هێڵی جیاکردنەوەی نێوان ڕاستی و چەوتیدان و وابەستەییان بە ڕاستییەوە پێ قورسترە لەوەی بەرەو چەوتی و لادان لابدەن و چ بەربەستیان بۆ ئەنجامدانی تاوان لەبەردەمدا نییە بە تایبەتی ئەگەر ئەنجامدانی ئاسان بێ. خەڵکی ناو ئەم دەستەیە، ئەگەر لە دەوروبەرێکی پاکژدابن، دەرفەتی دەربازبوونیان لە دارمان هەیە.

خەڵکی تر هەن بە هۆی نەخۆشییەوە تاوان ئەنجام نادەن بەڵکو لە بەر دوو هۆ ئەنجامی دەدەن: یەکەمیان نەبوونی بەربەستە لە کۆمەڵگەیەکدا کە چەوتی تێدا ڕیسوا ناکرێ. دووەمیان پەڕینەوەیە لە هێڵی ئارامیەوە بەرەو دیوی سەرکەوتن و شانازیکردن. تاقیکردنەوەکانی ڕۆژگار ڕاستیی ئەم سەرنجەی سەلماندووە کە خەڵک بە گشتی خۆیان لە ورووژاندنی ئەو جۆرە کەسانە دەپارێزن و ڕازیکردنیشیان بە قسەی خۆش بە سیاسەتێکی باش دادەنرێ..

دەستەیەکی تر هەن لەوانی تر جیان و تاکەکانیان دزی و ڕێگری دەکەن و پیاوی پایەدار و خاوەن دیوەخانی وایان تێدا بووە کە بە ئەشراف و پلە یەک دانراوون. بەڵام دز و ڕێگر ئەوپەڕی ڕێزیان لەوەدا هەیە کە خەڵک لە خۆیان و توندوتیژییان دەترسن و توانای ئەوەیان نییە بۆ پارێزگاریکردنی ماڵەکانیان بە درێژایی ساڵ شەونخوونی بکێشن و ئەوەندەیان بەسە لە پێناوی ئاسایشی خۆیاندا ڕوویان بدەنێ و هەندێ کاروباریان ئاسان بکەن. بەڵام ئەشراف، بە تایبەتی لە شارەکاندا ڕەفتاریان جێی ڕەزامەندییە ئەگەرچی وەک هەموو خەلقەندەکانی تری خوا بەشەرن و

هـەوڵی بەدەسـتهێنانی پلەوپایـە و پێشـڕەوایەتی دەدەن و چ کێشـەیەک لـەوەدا نییـە ئەگـەر هەوڵەکانیان لە سنووری شەریفانە بن. لە ڕاستیدا پایـەداری و پێشڕەوایەتی گرانبـەهان تـەکلیفیان لە دەستکەوتی ماددی زۆرترە.. سوعبەتم لەگەڵ یەکێ لەو پایەدارانەدا دەکرد، پێم گوت: ئەگـەر کەرێکی پێنج دیناریت بۆ بدزن، لە شاردنەوە و داپۆشینی، پارەی هێسترێکی دە دیناری سـەرف دەکەیت تا پۆلیسخانە ڕازی بکەیت. لە تەکلیفی پایەداری ئەم نموونەیە دەهێنمـەوە: چـل پیـاو لـە سەرەتای زستاندا لە کوردستانی ئێرانەوە هاتبوونە پشدەر تا پێویستی خۆیان بە دەست بێنن، بەڵام هەرکە بوونە مێوانی دیوەخانی خاوەن گوندەکە بەفرێکی زۆر باری و ڕێگاوبان بڕا و (باپیر بابـەکر مەحموود ئاغای خاوەنی گوندی نوورەددین) ماوەی مانگێک زیاتر بە بێ بێزاری و چارەگرژکـردن مێوانداری کردن، جا بـۆ هـەر کەسـەیان سێ ژەم خـۆراکی ڕۆژانـە حیساب بکـە کـەرەتی ژمـارەی مێوانەکانی بکە... خوا لێی خۆش بێ، یەکێ بوو لە سوارچاکەکانی پشدەر و سێیەکی گوندەکە نەبێ هیچی تری نەبوو چونکە دوو برای تری هاوبەشی بوون. مەسەلەیەکی کوردی هەیە دەڵێ بێڵی پڕ لە قوڕ، لە دەستی ئەوانەدا سووکە هەڵیناگرن.

ئەو وێنەیە ڕووبەرێکی دیار لە کۆمەڵگەی مرۆڤ داگیر دەکا و لووتکەی کارەساتیش نییە، چونکە لـەو دەروونانـەدا کـە حـەز لەبشـێوێنی و گوتـەگوت دەکـەن شوێنەواری حـەزێک هەیـە کاوێژی دەکەنەوە و داشناکەون. هەیانە قسە و قسەڵۆک کۆ دەکەنەوە تا دەیکەنە چنگێکی وا بەشی ئـەوە بکا ناحەزی لێ بکەویتەوە و هی تریان هەن خەریکی دانانی داستانی درۆن لێی دەوەشێتەوە ببێتـە هۆکاری دوژمنایەتییەکی وا بەردەوام دەبێ و شوێنەواری دەمێنێ و تەنانـەت ڕەگیش دادەکوتێ و وەک کەلـەپوورێکی ڕێزلێگیـراوی ڕابـردوو، لەنەوەیەکـەوە بـۆ نەوەیـەکی تـریش دەگوازرێتـەوە و بنەماڵەم دیوە دوژمنایەتییان تا دووسەدساڵ دەوامی بووە و ژنوژنخوازیش بەشی ئەوەی نەکردووە لاپەڕەیان پێ هەڵداتەوە: تەماشا چۆن فیتنەیی دڵڕەشێکی مەلعوون دەبێتە هۆکاری بـەردەوامبوونی ناحـەزی و دوایـی بـە لوقمـان و سـلێمان چارەسـەر نـاکرێ چونکـە دڵ وەک شووشـەیە و بشـکێ ناگیرسێتەوە. لە هەموو ئەوانە سووکتر هەڵبەستنی ئەو تۆمەتانەیە کە بـە لای دەسـەڵاتەوە گـرنگن ئـەوجا خەبەردانـە لـە لای دەسـەڵات. ئـەو خەبـەردەرە بـە قـەدەر داڕشتنی ئـەو دێـڕە ژەقنەبووتـە هەڵبەستراوانە دەچێتە ڕێزی حەیوانەوە و بە قەڵەمی خۆی دەچێتە دواوە و وەک کلکی سـەگ یـا هێستر قیت دەبێتەوە. لە سەردەمی کۆندا دووزمان و فیتنە خوێندەوارییان نـەبوو بۆیـە بـە ناچـاری لــە خەبــەردان لــە ســەر کەســی خــوازراو، زمانیــان بــەکار دەهێنــا و ئابڕووچوونەکــەیان لای دەسـەڵاتداران ئاشکرا بـوو و ئـەوەیش دەرگایـەکی تـری بـۆ دوو جـاران ئـابڕووچوونی خەبـەردەر دەکردەوە چونکە ئەو فەرمانبەرەی ئاگای لە دووزمانییەکە دەبوو داوای مێینەیەک یا لووسکەیەکی لێ دەکرد و بۆ ئەوەی ئابڕووشی نەچێ سەلامەتترین ڕێگا ئـەوە بـوو کیژەکـەی خـۆی یـا ژنەکـەی

خۆی یا کوڕەکەی خۆی، بە پێی خواستی کەسەکە بۆ بەرێ. لە درێژەدا، دەبێ حەقیقەتێکی پەراوێزی بابەتەکە ڕوون بکەیەنەوە ئەوەش ئەوەیە بە قەدەر سەرەتایی و ساکاریی ژیانی کۆمەڵایەتی کاریگەری و چڕی و ئاڵۆزی ئەو ئابڕووچوونانەی دەستنیشانمان کردن کەمتر دەبن و زامیان ڕووکەش دەبێ لە چاو ئەو کۆمەڵگایەوە چاوی کردۆتەوە و ئەمانەی بووە: 1ـ سەرەتای ڕۆشنبیری. 2ـ سەرەتای پەیوەندی بە شارە نێزیکەکانەوە. بە ڕوونیی لەبیرمەگەنجی کۆیە لە کۆتایی پلەی سەرەتایی قوتابخانەدا و ئەوانەی دەچوونە خانەی مامۆستایانەوە لە بەغدا یا ناوەندییەوە لە هەولێر هەستی نەتەوەیی خوینیانی دەهێنایە جۆش و زۆربەی خەمیان ئەوە بوو کە مێژوو غەدری لە گەلی کورد کردووە. لە سەر بابەتی ئاوهادا دەمەتەقێیان لەگەڵ خەڵکی بازاڕ و حاجیە توندڕەوەکاندا دەکرد تا قسەی کوڕی پایەدارێک لە دژی ئەوانەدا بڵاو ببۆوە کە بە عارەبی گوتبووی: ئەو شەلشەلییانە باشی شیاشەت دەکەن...لە بری پیتی (س)، (ش)ی دەگوت، خوا لێی خۆش بێ. ئەمە لە کاتێکدا کە کارکردن لە سیاسەتدا یەکێکە لەئەرکەکانی سستەمی پەرلەمانی و بوونی حکوومەت بە بێ هەڵبژاردن نابێ و دەنگدان ماف و ئەرکە دەنا حکوومەت دەبێتە دەستەیەکی وابەستە بە ڕای خۆیانەوە و ئەوپەڕی باشییان ئەوە دەبێ یاساگەلێک دارێژن تا بۆ شێوازی قسەکردنی مرۆڤ بۆی بگەڕێنەوە و ڕەعیەتیش تێبگا تا خۆیان لەو بەڵایە لەدەن کە دەسەڵات دڵی دەیخوازێ. مێژوو باسی ڕەفتاری حەججاجی کوڕی یوسف دەکا کە لە ناو خەڵکدا بانگەوازی کرد ئەوەی بە شەو دەربچێ ئیعدام دەکرێ، ئەوجا پیاوێک دوای خۆرئاوا هاتە شارەکەوە و بەرەو مردنیان برد و ئەویش داوای لێبوردنی کرد کە خەڵکی گوندەکەیان گوێیان لەو بانگەوازە نەبووە... حەججاجیش گوتی: تۆ ڕاست دەکەیت بەڵام ئیعدامکردنت لە بەرژەوەندی سەرجەمی موسوڵمانانندایە و ئیعدام کرا!! تۆ بڵێی ئەگەر حەججاج خۆی دوای شێوان بچووبایەتە شارەکەوە و والی فەرمانی کوشتنی دابا بە دڵێکی کراوە و سینگی فراوانەوە حوکمەکەی قەبووڵ کردبا؟! لە شەرعی ئیسلامدا شتێک هەیە پێی دەڵێن بیانووبڕین و ئەوەش بنەمایەکی ڕاست و داهێنەرانەیە مەبەستیش دارشتنی یاسایەکە بابەتەکە بە گشتی بگرێتەوە و کەلێن و بۆشایی وای تێدا نەبێ هاونیشتمانی زەرەری پێ بگا و قازی ئەگەر ویستی پێچەبەدەورەی پێدا بکەتەوە. لە هەواڵەکاندا باسێکی باوەڕپێکراو هەیە دەڵێ یەکێ لە خەلیفە عەبباسییەکان ویستی لەعەرەسەیەکدا کەماڵی پیرەژنێک لە لایەکی بوو، کۆشکێک دروست بکا و هەوڵیان دا لێی بکڕن تا هەموو عەرەسەکە بەتاڵ بێ بەڵام ڕازی نەبوو. هەواڵەکە گەیشتە قازی (ئەبوو یوسف) و ئەویش ناردی بە دوایدا و هات. داوای لێ کرد خانووەکەی بفرۆشێ ئەویش سوور بوو لە سەر نەفرۆشتنی و هەرچەندە چەندین قات پارەیان بۆی زیاد کرد سودی نەبوو. پێی گوت: تۆ ژنێکی کەمکەڵکیت و بڕیار دەدەم بۆچوونت فاسدە و خانووکەت بۆ خەلیفە لێ دەستێنم، ئەویش گوتی: بۆچی حوکمی کەمکەڵکی و فەسادی بۆچوون بە سەر خەلیفەدا نادەیت کە دەبینی بۆ کڕینی

خانوویەک چەندین قات پارە دەدا؟ قازی سەرسام بوو و وازی لێ هێنا... باسێکی هاوشێوەی ژنێک لە بەرلین هەیە کە لایەنێکی بەهێز ویستوویەتی خانووەکەی لێ بسێنێ و ئەویش ڕازی نابێ، ئەوجا کابرا هەڕەشەی لێ دەکا و ئەویش بەرانبەری لووت بەرز دەکاتەوە و لە کاتێکدا لە هۆڵی موعامەلەکە دەچێتە دەرێ، دەڵێ: بەرلین دادگای لێ هەیە!! هەی ئافەرین بۆ ئەو دوو خانمە مەلایەکەتانە! هەی ئافەرین بۆ ئەبوو یوسف و خەلیفە و کابرای بەتوانای بەرلین کە گوێڕایەڵی دادوەریی و لۆژیک بوون! تۆ بڵێی چەند دەسەڵاتداری جیهانی سێیەم بۆ دەنگی دادپەروەری نەرم دەبێ کاتێ لە مرۆڤیکی لاوازەوە دەبێ و چەند تەماشاکەر لایەنگری ئەو لاوازە دەبن کە هەندێ ڕوو ڕووناک دەکەنەوە و هەندێکیش گرژ دەکەن...

سەرپێیی بە سەر سەرەتاکانی ڕۆسنبیری و سەرەتاکانی سیاسەت و سەرەتاکانی پەیوەندیکردندا بە جیهانەوە تێپەڕین: نابێ بە هیچ جۆری لە بیری کەین کە ئەو سەرەتایانە لە بنەماوە سەرچاوەی پاکبوونن بەرەو ئامانجێکی بەرز. کاتێ لە هەنگاوی نیشتمانپەروەرە تازە پێگەیشتوەکان ورد دەبیتەوە دەبینی قوتابی لەو مامۆستایە گردەبڕترە کە مەعاشێکی باشی (سەرەتا مانگی 8 دینار و دواتر 10 دیناری وەردەگرت و نیوەی سەرف نەدەکرد) ئاستێکی وەهاشیان لە وانەگوتنەوە و تاقیکردنەوە و ڕەوشتراگرتن و شتی لەو بابەتانەی دەبوو کە نابێ پشتگوێ بخرێ تا ئەوەی ژنی دەهێنا و بە ئیسراحەت لە ماڵی خۆی دادەنیست، ئەوجا شتێ ڕووی دەدا کە لە سەری دەگوازرایەوە بۆ کوێرەدێیەک یا شاریکی دوور ئەوجا بە بەرنامە قەومییەکەی خۆیدا دەچووەوە و بیانووی بەجێی دەدۆزییەوە بۆ دامرکاندنەوەی هەڵچوونەکانی تا بیگێڕنەوە شارەکی خۆی یا بیکەنە بەڕێوەبەری قوتابخانە... جگە لەوە، توندڕەویی قوتابی کە بەرپرسیارەتی لە بەخێوکردنی خێزاندا نییە لە گۆشەنیگای خاوەن خێزانەوە (بە تایبەتی ئەگەر ژنەکەی مامۆستا بووبێ) دیماگۆجیایکی بێ سەمەر بوو و بە کەڵکی پەرەسەندنی شارستانەتی و پەروەردە نەدەهات چونکە دنیا ئاوڕ لە دەستەیەک گەنج ناداتەوە دروشمی بێ کەڵک بڵێنەوە و بەرز بکەنەوە و ئەو ئەفەندییە، بە گەرموگوڕی هەرزەکاری و منداڵیی چەپایەتی 1939 ـ 1945 ەوە بارودۆخی دنیا و دەوڵەتە زلهێزەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان و مەزەبی ئیمامی شافعی ژێروژوور دەکا ئەوجا بابەتی حەتمی لە ململانێی بەدەستهێنانی وەزیفەدا (بەڕێوەبەر... بەڕێوەبەری پەروەردە یا موفەتیش) دێنە پێشێ. قوتابی توندڕەو دوایی دەبێتە فەرمانبەر یا پیر و تەمبەڵ دەبێ و ئامانجە قەومی و چینایەتییەکانیشی یەک هەنگاو نەچوونەتە پێش. ئەوجا نەشرەیەکی نهینی بە شەوان بڵاو دەکرێتەوە یا دەستەیەک لە نیشتمانپەروەران و (دواتر چینایەتی) هەرایەک لەگەڵ پۆلس یا سوپادا بەرپا دەکەن ئەگەرچی دەسەڵاتیش بێزار دەکا بەڵام چ ئەنجامی نەبوو.. ئەگەر بێویژدانی لەگەڵ خۆماندا نەکەین بە دڵێکی ئاسوودەوە دەڵێین هەموو ئەوانە لە خۆپیشاندان و شتی تردا

تێداچوون بە هەدەر چوون چونکە ئەو بارودۆخەی تێکۆشەرەکان لێی نارازی بوون تا بزووتنەوەی 14ی تەمموزی 1958 بەردەوام بوو کە ئینقلابێکی سوپا بوو و بە سەر حکوومەتدا کردی و بووە ئافاتی ئافاتەکان و گۆڕستانی هیواکان و فرسەتی پروشکەی شەڕ.. ئەو کارەساتانەی لە دوای لێقەومانی 1958ەوە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ ڕوویانداوە و ئەو مەودایانەش کە بە خۆماتدانی کۆمۆنستەکان بۆ چوونە سەر دەسەڵات کەوتنە نێوانیان و ئەوجا ئینقلابی بەعسییەکان بە سەریاندا و بەردەوامی حیزبی کوردی لە دژی کەریم قاسم و ساڵانی ئەنفال و کوشتنی بارزانییە لایەنگرەکانی بەعس لە لایەن بەعس خۆیەوە و جەنگی بەعس لەگەڵ خومەینی بۆ ماوەی زیاتر لە حەوت ساڵ و.. و.. سەیرانی سوپای عیراق بۆ کوێت هەتا دوا کارەساتەکان و خۆتێهەڵقورتانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی... هەموو ئەوانە و شتی تر ئەوەی لە بیری خەڵک بردەوە کە خەباتگێڕەکانی سییەکان و چلەکان چ ئاوات و هیوای جوان و ساکاریان هەبوو و ئەوە لەبزووتنەوەی کورددا بە خەیاڵدا نەدەهات ئەو دووبەرەکییە بوو کە سکرتێری حیزبەکە، ئیبراهیم ئەحمەد، ڕێی بۆ خۆش کرد و جیابوونەوەی مەکتەبی سیاسی لە سەرکردایەتی مەلا مستەفا ڕاگەیاند و لەگەڵیدا چووە شەڕێکی دۆڕاوەوە و ئەوەش بووە سەرەتای براکوژی و لەگەڵ دەستەکەیدا بۆ ئێران ڕای کرد. ئەوجا لەگەڵ جەماعەتەکەیدا پەنای بۆ بەغدابرد... هتد... هتد..،،
کە مەودای ئەوە نییە بە دوورودرێژی باس بکرێ. وەک دەبینی هێزی کوردی و عارەبی و فارسی و ئەوروپی گردکرانەوە و بوونە لایەنێکی دوودڵ بە تایبەتی شوێنەواری شەڕی خەلیج لە ڕووداوەکاندا ئەوجا چارەنووسەکان بە پێی کزەبای بەرژەوەندی لە نەوت و ستراتیژی - ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و شتی لەوانە فراوانتر لە ئاستی جیهاندا، بە لادا دەهاتن. (باسی ئەم لایەنە بە شێوەی پەراوێز ناکرێ بۆیە لێرەدا لێیدەگەڕێم) کورتەی ئەو قسەیەی کە لە ڕووی نیگاری ئاواتی نیشتمانی لە سەرەتاکانی ڕۆسنبیری و سەرەتاکانی سیاسەت و سەرەتاکانی پەیوەندی بە لایەنی ترەوە، لە سەر نەخشەی بەرژەوەندی ستراتیژییە گەورەکاندا هەڵدرایەوە و سڕدرایەوە و ئەوانە نەبێ کە لە غەیب دەزانن، کەس نازانێ چارەنووسی کورد و ئەو ناوچانەی کوردی تێدا دەژی چۆن دەبێ و چارەنووسی زۆر لە گەلانی جیهانی سێیەمدا چۆن دەبێ، لەگەڵ ئەو سەرنجەدا کە ئەو گەلانەی کیانی سیاسی دانپێدانراوی نێوەدەوڵەتییان هەیە خەسڵەتی شەرعیەتیان هەیە و ئاسان نییە لە لایەن دەوڵەتانی ترەوە بە سەر مافەکانیاندا باز بدرێ چونکە لە نەتەوە یەکگرتووەکان و مەجلیسی ئاسایشەوە پشتگیرییان دەکرێ ئەگەرچی ئەو دوو ڕێکخراوە ناوبراوە کەلێنیشیان تێدایە، وەک: 1. مەجلیسی ئاسایش پێنج دەوڵەت دەگرێتە خۆی و هەر یەکەیان لە دژی بڕیاری زۆرینە مافی فیتۆیان هەیە. 2ـ لەوەیە گەلەکۆمەکێ لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە دژی لایەنێک بە لای لایەنێکی تردا دایشکێنێ و هەندێ بڕیار کە لە بەرژەوەندی دەوڵەتە لاوازەکاندابن ڕەت بکاتەوە.

ڕەنگە جێی خۆی بێ لە دەرگایەک بدەم کە پێشتر، مەگەر سەرپێی و لە تویێی باسی تری هەمەلایەندا لێمدابێ و مەبەستیشم بابەتی درۆیە کە جیاوازی لەگەڵ هەڵبەستندا هەیە. واتە ئەو دووە یەک شت نین و هەردوکیشیان جیاوازییان لەگەڵ تەزویردا هەیە و ئەمەشیان لە فێڵ جیایە و فێڵیش هەڵگێڕانەوە نییە و ئەوجا لادان و ئەوجا و ئەوجا.. تا لستەیەکی زۆر لە خێزانی ئەو بابەتە نابەڕێزانە. ئەوەی جێی سەرنجە (درۆ) لەو قسە ڕەهایە پێکدێ کە وزەی قسەکردن یا هونەری یا قەرەقۆزانەی تێدا سەرف دەکرێ بۆیە ئاسانترین ڕێگا بۆ ئەوەی درۆزن مەبەستی خۆی بەدی بێنێ (ڕەنگە خەڵکیش هەبن بە بێ هیچ مەبەستێک درۆیان بکەن) و بە هۆی ئاسانیی درۆکردنەوە دەشێ بە بەربلاوترین هونەری خەڵەتاندن دابندرێ. لە وەسێتەکانی باوکم ئەو قسەیەم لە بیرە کە دەیگوت قسەکردن بە تێکەڵکردنی دەقەکەی لەگەڵ شتی شیریندا بەتامتر دەبێ و ئەگەر مرۆ بتوانێ جارێک و دوو جار بە سەر خۆیدا زاڵ بێت و ئەوەی تێکەڵ نەکات، بە ئاسانی لە درۆ دوور دەکەوێتەوە. تووشی خەڵکی هەمەپلە بوومە لە باسکردنی خەیاڵ و مەحاڵدا درۆی ئاشکرایان کردووە و ئەوانە دووچاری نەخۆشی درۆ بوونە و لە دەسەلاتی خۆیاندا نییە و بە دەگمەن نەبێ، بە هۆی ناوبانگی خاوەنیانەوە لەو بوارەدا زەرەریشیان نییە. باسێک هەیە کە دەڵێ باوکیک سێ کوڕی دەبێ، لە باسی گەورەکەیاندا گوتی: هەرچی بڵێ ڕاست دەکا. لەبارەی ناوەنجییەکەوە گوتی: هەرچی بڵێ درۆ دەکا. لە بارەی بچووکەکەشەوە گوتی: جاری قسەی ڕاست دەکا و جارێ درۆ، بۆیە منیش سەرم لێی سوڕ دەمێنێ. خەلکیش لە ئارەزووەکانیاندا جۆری زۆریان هەیە.

لۆمەی کەسێک ناکەم درۆیەک بۆ ئەوە بکا خۆی یا خەڵکی تر لە بەلایەک بپارێزێ. لۆمەی کەسێکیش ناکەم لە برساندا درۆ بکا. لۆمەی ئەوەیش ناکەم بە هۆی نەخۆشی درۆوە درۆ بکا. لۆمەی ئەوەش ناکەم بۆ دەستکەوتێک درۆ بکا کە خاوەنی دیاری نییە، بە تایبەتی ئەگەر خۆی لە هەموو کەس لە هەژارییەوە نێزیکتر بێ. لۆمەی کەسێکیش ناکەم لەترساندا درۆ بکا. هەموو ئەو حاڵەتانە بە خۆیان و ئەنجامی بێزەرەریانەوە دڵۆپێکن لەو زەریایەی کە خاوەنیان، بە هەژار و مامناوەندی و دەوڵەمەند و بەتوانا و بەستەزمانەوە خۆیانی بۆ تەرخان دەکەن... ڕووبەڕووی کەسانی وا هاتووم خۆشیانویستووم و بە ناڕاستی پێیاندا گوتووم و نەمتوانیوە شەرمی خۆم بشارمەوە بەوە نەبێ ڕەوتی قسانم بەرەو باسی ئاسایی گۆڕیوە. لە هەندێ باری دەگمەندا ناچار ماووم ئەو کەسە شەرمەزار بکەم کە پێمیدا هەڵداوە هۆیەکەش ئەوە بووە بێدەنگبوونم دەبووە ئەوەی لەدرۆکردندا هاوبەشی بم. ئەوەی جێی سەرسوڕمانیشە درۆی نووسراو نابێتە هۆی گلەییکردن لە مەدحکەر و مەدحکراو و هەندێ سەرسوڕمان بەوە نامێنێ کە مەدحی لەو جۆرە گرنگی پێ دراوە و وردیێوی تێدا کراوە و بە دەگمەن نەبێ بەڵگە هێندراوەتەوە مەگەر

خوێنساردێک لە مەدحکردن و زەمکردندا وڕێنە بکا. ئەدیبێکی شاعیری گەورەی عارەب، موتەنەبی، دوو جاران لە بەر دەرگای (کافووری ئەخشیدی)دا خۆی ریسوا کرد: جارێکیان لە پێداهەڵدانی زیاددا کە دەڵێ:

گەورەم لە بادەکەت هیچ نەماوە وێمبدەی؟
ئەوە بەینیکە دەخۆیتەوە و من گۆرانی دەڵێم

کاتێکیش بێهیوا بوو و میسری بەجێ هێشت، قەسیدە ناودارەکەی لە زەمکردنی ئەخشیدیدا لەدوای خۆی جێ هێشت:

جەژن، بە چ حاڵێکەوە هاتیتەوە ئەی جەژن
بەوەی بە سەرچوو یا شتێکی تازەت پێیە؟

جورئەتێکی وا لە پاڕانەوەکەی موتەنبیدا هەیە دەنگی گلەییمان بۆ دەداتەوە!! دەردی موتەنەبی دەرمانی نەبوو جونکە توانا شیعرییەکەی بۆ بەرزایی هەرە بەرز بڵندی دەکا بەڵام پلەوپایە و دەسەڵاتی نەبوو لەو بەرزاییە ڕایبگرێ و ئەو دووەش دنگەی پێشکەوتن و دەرکەوتنن لە ناو هاودەماندا. ئەگەر بۆ ڕێزگرتن بشیانکردایەتە وەزیر بۆ شیعر دەگەڕایەوە و بۆ ڕووخاندنی دیواریش بە شیعر پەراوێزی دەنووسی و لەوەبوو بڵێ:

دیوارەکە یا بەهێز بکەن یا بیرمێنن
چۆنتان دەوێ ئاوها خزمەت بکەن

موتەنەبی لەمەدحکردن و زەمکردندا زیادەڕۆیی دەکرد و هەردووکیشیان لەعادەت دەردەچوون و ئەویش وەک شاعیرە مەدحکەرو زەمکەرەکانی تر درۆزن بوو بەڵام سەردەمەکەیان ڕێی ئەو زیادەڕۆییەی دەدان:

ئەهلی کوفرت وەها تۆقاند تا ئەوەی
ئەو نوتفەی نەخولقاوە لێت دەترسێ

بەڵام ئەوەی هەر بۆ دەمێنێتەوە کە وای لی کردبوو لە پێشەوەی شاعیرە مشەخۆرەکانەوە بێ و بگاتە سنووری منەتکردن بە سەر ئەوانەدا کە پێیدا دەگوتن و لە ناو شاعیرە عارەبەکاندا لە وێنەی نییە  و لە ناو میللەتانی تریشدا، لە چەندین بواردا وێنەی کەمە.

ئەو درۆ ساکارە وەک چۆن بای بەهار بە ناو گیادا دەڕوا، ئاوها بە ناو کۆمەڵگاکاندا ڕۆیشت، بەڵام بەو جیاوازییە دیارەوە کە لەکۆمەڵگەی سەرەتاییدا، بە ڕازیکردن و مامەحەمەیی نەبێ دڵنیایی مرۆڤ نییە و لە کۆمەڵگای شارستانی ڕەگداکوتاودا (بە دەگمەن نەبێ) پێویستی بە نیفاق نییە. مەگەر بە دەگمەن دەنا کەس خۆبەخشانە مێچکەیی بۆ خاوەن دەسەڵات و پارە نەکردووە و دەبێ لێرەدا ڕستەیەکی بەرپەرچدانەوە هەبێ بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، ئەوەش ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەموو کۆمەڵگاکاندا خەسڵەتی جیایان هەیە و بە قەدەر لێکچوونیان لە حەزی لە درۆ، لە خۆشویستنی جوانی و دەنگخۆشی و سەرنجی ورد و ئارەزووەکاندا لە یەک دەچن و درۆ بە ڕوخساری خاوەنەکەیەوە دیار نییە وەک جوانی و ناشرینی پێوە دیارن و مەترسی درۆی ئاسایی، وەک پێشتریش باسمان کرد، زۆریی تێگەیشتن و زانست و زیرەکی ناوێ بۆیە درۆ بە زیادەڕۆییەوە تەشەنە دەکا تا ئەوەی هەواڵێکی ڕاست تووشی گۆڕانکاری دەبێ و لە حەقیقەتی خۆی لادەدا و دوور نییە پێچەوانەش بکرێتەوە، جا بە ئانقەست بێ یا بە ڕێکەوت.

پەتای درۆ ناوچەیەکی ترسناک لە ڕووبەری کۆمەڵگەی مرۆڤ داگیر دەکا و هیچ هەواڵێک باس ناکرێ ئەگەر لە زارێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی نەبێ و دەتوانی لە شێوەی گۆڕانەکەوە ویژدانی ئەو کەسە بخوێنیتەوە کە دەیگێڕێتەوە: ئایە دەیەوێ خاوەنهەواڵەکە عەیبدار بکا یا لە زیادەڕۆیی بێبەریی بکا و ڕێشی تێدەچێ لە ناوەڕۆکی گێڕانەوەکەدا گلەیی یا سووککردن هەبێ و لە ڕاستیدا لەوەش وەڕس دەبێ قسەیەکی بوێرانە بدرێتە پاڵ کەسێک کە خۆشیناوێ. نەفسییەتی سووک پێی خۆشە هەرچی سەرنجڕاکێش بێ لە باسەکەی لابەرێ و ئەوە ئەوپەڕی پلەوپایەیە کە پێی دەگا. هەندێ جار ئەو هەواڵانەی بە سەر زارانەوە دەگوازرێنەوە، بە بێ مەبەست گۆڕانکارییان بە سەردا دێ. ئەگەر بە دوای ئەو قسانەدا بگەڕێی کە لە بارەی کۆکردنەوەی قورئان و حەدیسەوە گوتراون سەرسام دەبیت، جا قسەیەکی ئاسایی چۆن کە نە پیرۆزیی تێدایە نە گرنگیی. من بەش بە حاڵی خۆم لەوە سەرسامم چۆن مێژوونووسە موسوڵمانە کۆنەکان توانیویانە بە دەقێ زۆر لە یەکچووەوە هەواڵەکانیان دەست بکەوێ و لەوەش سەیرتر ئەوەیە کەموکورتی مێژووی ئیسلام و لادانی قارەمانەکانی چی تر شاردراوە نین، هەر دەڵێی ئەو جۆرە دەقانە بۆ تاقیکردنەوەی شێوازی ئەم سەردەمە داڕێژراوون ئەگەرچی مێژوونووسانی ئەو سەردەمە نە لە یەک وڵاتدا بوون نە لە یەک سەردەمدا ژیاون و سەرچاوەشیان هەمەجۆر بووە کەچی بۆچوونیان لە یەکترەوە نێزیک بووە بە تایبەتی ئەو لایەنەی لە ڕەوتی موسوڵماناندا گەش نەبووە. خۆزگە کتێبی ئەو مێژوونووسانەت بە درێژایی مێژووی ئیسلام بە هەموو عەیبەکانیەوە، کە لە پەیڕەوانی قورئان چاوەڕوان نەدەکرا، لەگەڵ مێژووی هەر حیزبێکی شۆڕشگێڕدا بەراورد دەکرد کە حیزبەکە خۆی لەم سەردەمەدا نووسیویەتی و دوو عەیبەی گەورە لەخۆ دەگرێ: خۆپاکڕاگرتن تا ئاستی مەلایەکەت و دووەمیان

ناشرینکردنی ناحەز بە خراپترین شتێ کە بکرێ بدرێتە پاڵ بەشەرێکی ڕەها لەهەموو شەرەفێک. وەختە بە سووربوونەوە بڵێم مێژوونووسانی ئیسلام بە قەدەر ئەو ئیمامانەی شەریعەت کە بە دوای حەقیقەت و دەقی ئایەت و حەدیس و سەرچاوەکانیاندا گەڕاون، ئەوانیش بە دوای ڕاستیدا گەڕاون. تەنانەت لەوەش سەیرتر زاناکانی زمانی عارەبی (نەحو و سەرف) و دارشتن خۆیان بۆ ئەوە فەوتاند ڕێزمانێکی ورد بە دەست بێنن... قسەکردنیش لە سەر ئەو بابەتانە دوور و درێژە..

درۆ یەکێکە لە ستوونە بەرزەکانی نەخۆشخانەی شێتان ئەوەش لە بەر ئاسانیی گۆڕینی قسەی ڕاست بە درۆ و شتێکی لە هەموو ئەوانە گرنگتریشی دێتە سەر ئەویش پێکهاتەی مرۆڤ بە گشتی، کە تێکهەڵکێش و لیکدوور و لێکنێزیک و ئەرێنی و نەرێنی قەبوولکەر قەبووڵنەکەرە... هتد. عەقڵیش، لە پلەی یەکەمدا لە پشت هەموو ئەوانەوەیە و دەروونیش لە پلەی دووەمدا. پێکهاتە، عەقڵ و نەفس نییە چونکە شتە کاریگەرەکان، بیستراو و هەستپێکراو و بیندراو و مەزەندە و جێی گومان و خەیاڵکرد و شاراوە (ئەمەیان ڕەنگە لە دەرفەتێکدا دەرکەوێ) نەخشەی شتە مەعقوولەکانی مرۆڤ پڕ دەکەنەوە و بەر یەکتریش دەکەون بۆیە لە باسکردندا زەحمەتە داوێک بگریت کەمەبەستە و دەستبەرداری داوەکانی تر بیت بەڵام لە داوەکانی ترەوە خەیاڵ دەپەڕێتە ناویەوە ئەگەرچی کەمیش بێ. ئەگەر داوەکە لە قسەکەرێکی ترەوە گوازرابێتەوە، دڵنیابە داوەکە بۆ داوێکی تری وا دەگۆڕێ کە پێناسەی دیار نییە. وا بوو ساڵی 1987 عیراقم بەجێ هێشت و چوومە ئەردەن کەچی هێشتا لە ئوتێل پشووم نەدابوو هەواڵم لە عیراقەوە پێ گەیشت کە مەسعوود محەمەد لە بناری قەندیل چاوی بە کەسایەتی کورد (س) کەوتووە. چیرۆکیشیان بۆ ئەو قسە و باسانەی نێوانمان هۆنیبۆوە لە بارەی شتی زۆر گەورەوە!! من تویژینەوەم لە سەر پێکهاتەی ماددی یا ویژدانی مرۆڤ نەکردووە ئەگەرچی شتێک (کەم نا) لەبارەی خەسڵەتەکانیەوە دەزانم و ئارەزووی جنسی لە سەرەتاکانی تەمەنەوە دەزانم هەتا کۆتاییەکانی تەمەن (هەندێ جار تا توانای خواردن و خواردنەوەی هەبێ)دیاردەی درۆ بە جۆرەکانیەوە بە لامەوە سەیر نییە و تا ئاستی یەقین دیومە بە هۆ یا بە بێ هۆ مرۆ بە لای درۆدا چوونە چونکە درۆ ئاسانە و لە خوڵ هەرزانتریشە و لە سەر هەزار نۆتە، یا نۆتەی لە ژماردننەهاتوو سەما دەکا و چەکی هەمەجۆری زامدارکەر و ڕووخێنەر و تەقێنەر و سووتێنەری هەیە.. ئەوانە بە تەنیشت ئەو کەرەسانەوەن کە لەبەر ئەو گوێیانە خۆشن کە حەزیان لێیانە. بەڵام سەرچاوەکەی کوێیە؟ ئەوە پرسیارە ئاڵۆزەکەیە!! کتێبێکم نییە بە جۆرێ شەرحی مرۆڤ بکا بوونەوەرێکی سروشتی وەک هەموو گیانەوەرەکانی تر بێ، بەڵام (قسە) لە حەیوانەکان نەکەوتۆتەوە و ئەوانە درۆ نازانن و لەمەوە دەردەکوێ درۆ و ئەوەی وەک درۆیە تەنها تایبەتمەندی بەشەرن ئیتر بەڵگەنەویستە بڵێین بەشداران لە چنینی درۆدا، بە پلەی یەکەم عەقڵە و بە پلەی دووەم دەروونە و ڕوون و ئاشکراشە کە ڕۆڵی دەروون لە

داهێنانی درۆی ئازاربەخشدا لە یەکەمدا و بە گوێرەی ویستی ئازاردان دێ کە داتاشین ئەنجامی زۆر خراپی دەبێ. ئەوەی لای من ڕوونە ڕۆڵی عەقڵ لە درۆکردندا زیاتر بێلایەنانەیە ئەگر نەڵێم لەگەڵ ڕاستیدایە بە مەرجێک هۆکاریکی وا نەبێ ئەم هاوکێشەیە بشێوێنێ.

بەڵگەی ڕاستی ئەوەی گوتم ئەوەیە کە منداڵ لە سەردەمی سەرەتادا قسەی ڕاستە و پێم وا نییە بیر لە درۆکردن بکاتەوە، بەڵکە ناشتوانێ دروستی بکا. لەم سەرنجەوە، ئەگەر لەگەڵ واقیعدا یەک بێتەوە، عەقڵ لە سروشتیدایە لەگەڵ حەقیقەتدا بڕوا، چونکە دەبینین و دەزانین درۆ لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەکو سوید و دانمارکدا تا ڕادەیەکی زۆر ڕەواجی کەمترە بە پێوانە لەگەڵ دەوڵەتە دواکەوتووەکاندا. مرۆڤی شارستانی بە دەگمەن لە کاتی قسەکردندا پەنا بۆ سوێند دەبا کەچی لە وڵاتی دواکەوتوودا، لە باسێکی ساکار، لە بازاڕەوە بۆماڵەوە، باسەکەی بە قورسترین سوێند دەڕازێنێتەوە و هەر دەڵێی تۆمەتی دزیکردن یا کوشتن لە سەر خۆی لادەبا و سوێندی باوی کورد (شای نەقشبەند) و (غەوسی گەیلانی)یە بەڵام دەروێش و سۆفی پەنا بۆ شێخی تەریقەتی خۆیان دەبەن کە زرپوزندووە. قسەیەک لە سەر جیهان و بەردەوامییەکەی لە ناو خەڵکدا بڵاو ببۆوە، ئاوها بوو: بەتاڵ بێ وەردەگەڕێ، واتە ئەگەر کەون پیاوچاکی تێدا نەمێنێ ڕایگرێ ژێروژوور دەبێ چونکە بۆ پاراستنی سەلامەتی دنیا هەتا ڕۆژی قەیامەت وەکیلی خوایە... لەوەوە پێویست دەکا پیاوچاک لە ماوەی هەزاران ساڵدا نەخەوێ و چاودێری مەلایەکەت دەکا بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی خۆیان بە ڕێکوپێکی. نازانم چۆن خۆی لە فێڵی شەیتان لادەبا کە لەو ڕۆژەوە فەرمانی خوای بەجێ نەگەیاند و کڕنۆشی بۆ ئادەم نەبرد، بەرەڵایە هەتا ڕۆژی قەیامەت. نایشارمەوە من کە دەبینم مرۆڤی سەردەم نهێنییەکانی کەون ئاشکرا دەکا و بە نێوان ئەستێرەکاندا دێت و دەچێ و بە پێی توانا و بە هەوڵدانی زیاتر ڕێگا خۆش دەکا بۆ ئاسانکردنی زەحمەت و تێرکردنی برسی و چاکبوونەوەی نەخۆش و بەربەستدانان لە بەردەم خراپەکاران، ئیمەش لە ژێرقورسایی دوعا و جوینەوەی قسەی بۆش و دۆزینەوەی وەکیلین بۆ خوای گەورە تا ڕێ بۆ ئینس و جن خۆش بکا کەچی ئەگەر کونێ کەوتە تایەی ئۆتۆمبیلێکەوە بە هەموویان ناتوانن ئۆتۆمبیلەکە ببزوێنن، هەست بە کارەسات دەکەم. ئەگەر لێشیان بپرسیت چییە وا ئەو کێشە بچووکەتان پێ چار ناکرێ و گوایە زانستی ئاسمانەکانیشتان هەیە، وەڵامی ئاڵۆزی وات دەدەنەوە هەر بەشی قایلکردنی خۆیان و ئەوانە دەکا کە دوایان دەکەون... وڕینەی نیمچە بەشەرە مەستەکان کە بۆ دڕپێدانی عیفریتی دەوری مانگی گیراو و خۆری گیراو تەپڵ لێدەدەن بەردەوام دەبێ.

گوتم عەقڵ لەگەڵ ڕاستیدایە ئەگەر هۆکارێکی پێچەوانە نەبێ، ئەوجا بۆ ئەمە ئامادە بە:

ئەگەر دینەکان و مەزەبەکانیان و قوتابخانە سیاسییە هەمەجۆرەکان و ئایدۆلۆژیا جیاوازەکانی لایەنە هەمەڕەنگەکانی ژیان و خاوەن بۆچوونە تایبەتییەکان بژمێریت، ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەر کۆ دەکەیتەوە کە لە هەزاران هەزار تێپەڕ دەکا و هەر یەکە لەو سەرچاوانە هەموو سەرچاوەکانی تر بە درۆ دەخاتەوە و زۆریشیان شەڕی یەکتر دەکەن و کۆمەڵگەیەکی مرۆڤ دەبینی لە ڕێی کاری ڕۆژانەی ژیانەوە درۆ بە خوێنەکەیدا دەسووڕێتەوە و قەت زەنگ لێنەداوە ئەگەر هەندێ گوێ ناڕازی نەبووبن یا لە هیتافی سیاسیدا گوترابێ (بژی...) دەنگی تر بەرز بوونەتەوە و گوتوویانە (بمرێ...) و نەشرە و نووسینی ڕۆژنامەوانی و کتێبی دژ بە یەک تێکئاڵاون و جەنگی سەر کاغەزیان بەرپا کردووە و بایی ئەوە بوونە ببنە پروشک و ئاگر و لە زۆر شوێنی جیهان دەسووتێنێ و دەڕووخێنێ و دەکوژێ و هەزاران کاغەزی شکات لە دژی ئەم و ئەو کە سیما و خەسڵەتیانی بە دڵ نییە دەکرێنەوە و ئەوانەش هەربۆ ئەوانە دەگونجێن کە خەریکی بوخوڕکارین... چمک و پەراوێزی شۆڕشی تەمووزم لەبیرن خەڵکانێکی زۆر چوونە ئەوروپا و کە گەڕانەوە ئەو سەرنجەیان لە سەر ئەوروپاییەکان هەبوو کە هیچ لە سیاسەت نازانن، هۆی ئەو بۆچوونەشیان ئەوە بوو سیاسەت لای ئەوان لە نەشرەی نهێنی و خۆپیشاندانی بێ ڕوخسەت و هێرشکردنە سەر ئیستیعمار و پێداهەڵدانی مارکس پێکدەهات و خەیاڵیان بە لای ئەوەدا نەدەچوو سیاسەت لە ئەوروپا مومارەسەی ڕۆژانەیە بەڵام بە بێ عەنتەریاتی پێکەنین هینەر، چونکە سیاسەت و ئابووری لای نەتەوە پێشکەوتووەکان دوو ڕووی دراویکن... پێویست بە درێژکردنەوەش ناکا. درۆ خۆی لە خۆیدا ئافاتێکی گەورەیە و خەسڵەتی درۆزنی شەرمەزاری و تاوانە لە دژی مرۆڤایەتی.

بەڵام درۆهەڵبەستن جیاوازی لەگەڵ درۆی ڕەهادا هەیە چونکە ئەمەیان پارچەی سەربەخۆی شێواز کۆ دەکاتەوە تا قسەیەکیان لێ پێکبهێنێ واتای هەبێ و ورووژێنەر و هاندەر بێ و لە لایەن هەموو ئەوانەوە کە حەزیان لە حەکایەتی هەزار و یەک شەوە و (قەمەری زەمان) و (مۆمدانی جێگا)یە پێشوازیشی لێ بکرێ. نوکتەیەکی کۆن دەڵێ پیاوێک ویستی ژنەکەی لەنهێنی پارێزیدا تاقی بکاتەوە و پێی گوت لە ئاودەست قەلەڕەشێک لە پاشەڵیەوە دەرچووە... دەنکی تەزبیج وەرسووڕان تا هەواڵەکە گەیشتە پاشای شار و ئەویش بە دوای کابرای دیاریکراویدا نارد و لێی پرسی ئاخۆ ڕاستە چل قەلەڕەش لە پاشەڵتەوە دەرچوونە؟ ئەویش گوتی: گەورەم من ویستم ژنەکەم تاقی بکەمەوە ئاخۆ نهێنیپارێزی چۆنە و ژمارەی قەلەڕەش یەک بوو و تا گەیشتە ئێرە.. پاشا قسەکەی پێ بڕی و گوتی: وەڵڵاهی ڕاست دەڵێی، من بە ڕەقەم 39 بیستم و یەکێکم بۆی زیاد کرد و بوو بە چل!

خەڵکی گەلە دواکەوتووەکان زوو باوەڕ بە مەحاڵ دەکەن و خوای گەورەش لای ئەوان لەسەرووی مەحاڵی خاوەن شکۆوەیەو وەک ئەوەی خودا منداڵێک بێ وبە بەرخێکەوە خۆی هەڵدەکێشێ دوو سەری هەیە و چاوی بە تەویڵیەوەیەتی و بە زمانی چۆلەکە دەدوێ و لە ڕۆژگاری دوای ڕەمەزان و لە سەحەردا قەتار و ئەڵڵاوەیسی دەچڕێ.

قسەهەڵبەستە بەتواناکان بە شێوەیەک کاری خۆیان دەکەن کە لە پێکەوەنانی بەشەکانی قسە بە یەکەوە گرێ بدەن بەڵکو بۆ فیتنەییەکی گەورەتر، بەشەکانی باسی دووردرێژی جیا جیای تر بەیەکەوە دەلکێنن بۆ ناحەزی نێوان دوو یا سێ یا دە کەس. جگە لەوەش، درۆزن وەک پیشە (درۆ) ئەنجام نادا بەڵام قسەهەڵبەست خۆی بۆ دەرفەت مەلاس دەدا تا ئەگەر بتوانێ شتێکی گرنگ و گرنگتر هەڵبەستێ… نەفرەتی خوا و نەفرەتکەرانی لێ بێ. قسەیەک لە هەزار ساڵ زیاتر بەر لە ئێستا ماوەتەوە دەڵێ: کە ناوی پیاوچاکان دینی ڕەحمەت دەبارێ.

جگە لەوەش، هەڵبەستن هەر بە قسە و (قسەی نووسراو)ەوە ناوەستێ، خەڵکی لێهاتوو لە بواری فێڵکردندا دەتوانێ بەڵگە بهێنێتەوە قسەشی تێدا نەبێ بەڵکو شوێنەواری دروستکراو و شتی خەڵکی دیاریکراوی تر و شوێنپێلاوی فلانەکەس لە بەر دەرگای فلان کۆ دەبنەوە تا ببنە بەڵگەی تاوان کە خاوەنی پیلانەکە ئەنجامی داوە بەڵام لە ڕێگای هەڵبەستنەوە دەکەوێتە ئەستۆی بێتاوانێک…

باسی تەزویر و فێڵ و بەهەڵەبردن و گۆڕین و شتی لەو بابەتانەی کە لەهونەرەکانی شەیتانن هەموویان دەستەخوشکی درۆ و هەڵبەستنن و بەشدارن لە بیناکردنی نەخۆشخانەی شێتان کە پڕە لە دانیشتوانی خۆی. بەڵام لایەنی ڕەوایەتی ئەو دەستە نەفرەتییە ئەوەیە هەموو درۆیەک و هەڵبەستنێک و شتەکانی تر ژیانی بێتاوانێک پاشەکەوت بکا و پیلانی خراپەکاران ئاشکرا بکا و پێش بە زۆرداری زۆردار بگرێ و ماف بۆ خاوەنماف بگێڕێتەوە و تاوانبار بە سزا بگەیەنێ (ئەگەر تاوانەکە سەلمێندرا). ئەم لایەنەی وەک بەرژەوەندی حیسابی بۆ کراوە وەک داهێنانی تەڵە و پاچ و شەنە و شتی لەو بابەتانەیە بەو حیسابەی ئاسانکاری دەکەن (تەور و چەقۆ و مشاریش لەو بابەتەن…) بەڵام مەرج ئەوەیە لە بابەتی قەدەغە بەکار نەهێندرێن بەڵام بۆ نموونە، ڕاو ناگرێتەوە، مادام قەڵەوکردنی مەڕ و بزن و مانگا و عەلەشیشمان حەڵاڵ کردووە دەچێتە خانەی دەستدرێژییەوە… ماسی و ئاسک و بزنەکێوی و کەروێشک بە ڕاو و بەکارهێنانی فێڵ دەخۆین… ئەوەی سەیرە بەراز بە گیاندارە گڵاوەکان داندراوە و گۆشتەکەی لە ئیسلامدا حەرام کراوە بۆیە بە سەلامەتی ماوەتەوە، مەگەر ڕاو بکرێ ئەوەش بە دەگمەن. لە بیرمە (لە هەموو تەمەنمدا) شەوێکیان لە سەفارەتخانەیەکی موسوڵماندا یەک پارچەگۆشتی ناو زۆر پارچەگۆشتی تر نایە دەمم

و که جاییم زانیم گۆستی بەرازە و لە بەر چاوی ئەو خەڵکە پێم نەتفێندرایەوە. هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ، ئێستاش کە ئێستایە کە ئەو ڕێکەوتەم بیر دێتەوە قێزم دێتەوە. شتێکیش کە بەوە دەچێ ئەوەیە ئەگەر مریشک ملی لە جێی دیاریکراو و شەرعی خۆیەوە نەبڕدرێ، بە دەگمەن نەبێ کەس توخنی ناکەوێ. ئیدی لەو نموونە ساکارانەوە بپێوە بزانە گۆرینی دین و مەزەب یا سەنگەری سیاسی چەند زەحمەتە... تەنانەت پەیوەندیت بە گەڕەک و ناوچە و شەقامکەت و کۆلانی دەوروبەرەوە تا کۆتاییەکانی ژیان لەگەڵتدا دێن و تەنانەت خەڵک کە دەمرێ تەنها لە گۆڕستانی خۆیاندا دەینێژن و ئیدی بەو شێوەیە.. ئەو ئولفەتگرتنە لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە سوودبەخشە بەڵام بەربەستیشە لە نێوان تاک و (کۆمەڵ) و نێوان تاک و دەستەکاندا، وەک دوو دراوسێ ئەگەر پەیوەندی ڕۆژانەیان نەبێ بە بێ مەبەست دەبێتە ڕێگر لە دروستبوونی ئولفەت کە بنەمای هاوبەشی ڕۆحییە. لە ڕاستیدا زندەوەر بۆ مسۆگەرکردنی ئاسایشی خۆی، خۆی دەبێتە چەقی مسۆگەرکردنی ئاسایشی خۆی (هەندێ بارودۆخ، وەک بەرگریکردن لە منداڵ و کەسە نێزیکەکان، وەک هەمووومان دەزانین پلەیەکی بەرزی هەیە) و لەم سەرنجەوە دوژمن دەبێتە تەوەری گرنگیپێدان ئەوەش بە لابردنی هەڕەشەکانی و لە زۆر کاتیشدا مردنی. لە فیلمیکدا بە ناوی (ڤیکئنگەکان) شەڕێک لە نێوان دوو کەسدا دەقەومێ یەکێکیان کوری ڤیکنگە و ئەوی تریان کوڕی هەمان پیاوە بەڵام لە ژنێکە هاوسەری پاشای بەریتانیایە بە بێ ئەوەی خۆی پێی بزانێ. وا ڕوو دەدا کە دەمی شمشێری ئەم کوڕە دووەمە دەشکێ و براکەی تر لە کوشتنی دوودڵ دەبێ (ئەمیان بە برایەتییەکە دەزانێ) دڵی ڕێی نادا بیکوژێ کەچی ئەمیان بە کەرتی شمشێرە شکاوەکەی لێی دەدا و دەیکوژێ و لە بەر خۆیەوە دەڵێ: بۆچی نەیکوشتم؟ ئەو پرسیارە هەر بە سەرسوڕماوی مایەوە.

خەسڵەتی بەزەیی لەو کاتەدا چەند جوانە کەسێ لەو کاتەدا هەیبێ کە بتوانێ نەیبێ!! لە ناوجەرگەی جەنگیشدا!!!

سەڵاحەددینی ئەیووبی شاسوار و سەرچاوەی دڵگەورەیی بوو و لە جەنگی دژی بەرهەڵستکارە خاچهەڵگرەکانیشدا دڵگەورەیی زیادتر بوو، بەڵام دەبێ بڵێین زیادەڕۆیی لە دڵگەورەییدا تا ئەو ئاستەی نەیار بۆ ئەوە هان بدا بەرانبەری جورئەت بکا، بە پێوانەی بەرژەوەندییە دنیاییە ناسراوەکان دەبێتە شتێک کە لە سنووری دڵگەورەیی دەردەچێ و بۆ گەورەیی ئەوندە بەسە خۆ لە فرتوفێڵی نامەردانە لابدەیت.

یـەکێ لـە ئافەتـەکانی نەخۆشـخانە ناوبراوەکـەمان ئەوەیـە زۆرینـەی هـەرە زۆری دانیشـتوانی پاشکەوتووی گوێ زەوی سـەرکردایەتی خستۆتە ئەستۆی کەسێک یا لایـەنێک یا حیزبێـک یا دینێک و خۆی ئاسوودەکردووە و نەفسی کوژاوەی خۆی لە سەرهێشەی دەمەتەقێ و دژبەرەکان و هەڵسـەنگاندن و یەکەمایـەتی لـە هـەموو بەرژەوەنـدی و بەرنامەیـەک ململانێی بـە دەورەدا بـەرپا دەبێ یا بۆچوونی هـەڵبژێردراوانی بـەڕێوەبردن لـە بارەیـەوە جیاواز دەبێ، بە دوور گرتووە، جا لـە سەر نەرمونیانی یا توندوتیژی بی، یا بە تێگەیشتن و نیوەتێگەیشتن بێ یا بە ئەمانەتەوە بێ یا بێ ئەمانـەت چونکـە لـەو بوارەدا مـەرجی زانسـت و ئاگاداری و لێهاتوویی و تاقیکردنـەوە بـە مـەرج داناندرێن و ئەوەی ئەو مافە دەدا بەرگری لێ بکا (لە وڵاتە دیموکراتییەکانـدا) هێـزی باوەڕهێنـانی نییە.

لایەنـە ناشرینەکانی شارستانێتی تێکـەڵ بـەو بیـرە کۆنانـە دەبـن کـە هـەزاران ساڵ ژیاون لەگەڵ داهێنانی زانستانە تا دەگاتە نوسخەگرتنەوە لە سەر بەشەر، کە پێش بینینی کۆرپەڵەی ناو زگی دایـک کەوتۆتـەوە و بـە بـەر چاوتەوەیـە، ناڵێم لـە سنووری بیستنتدایە چونکـە منداڵ لـە ڕەحمـی دایکیـدا نـاگریێ و پێناکـەنێ و قسـەش ناکا تـا بیبیستی و هـەموو ئەوانـە لـە سـەرەتاکانی چالاکی زانستیدان. ئەگـەر مرۆ مـەودای هـەبێ خـۆی لـە بـەڵای خۆفەوتانـدن بـە وزەی ئـەتۆم و شـتی تـر بپـارێزێ، دوای هـەزار سـاڵی تـر یـا کـەمتر نهێنییـەکانی ئـەمرۆ کـە لـە ئاشکراکردن یـاخین وەک بزواندنی داشی دامە ئاسان دەبن و هیوای ئەوەم بە دڵدا دێ کە بۆ مەودایەک کە عەقڵی جێگیـر گەرەکی بێ خێرایی تیشـک تێپـەڕێنێ و ئـەوجا ببێتـە گەمـەی منـداڵان و جێی سەرسوڕمانم نـابێ ئەگەر شتی ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو بە شێوەی زانستی تێکەڵ یـەکتر بـن تـا ئـەوەی وێنـەی بێ کۆتایی بەشەری داهاتوو لە شێوەی بیستراو یـا ئامـاژەدا، کـە بـە خـەیاڵی خـەڵکی ئـەم سـەردەمەدا نایێ ئاماد ەبکەن: چووزانین، لەوەیە توانای زانستی نێزیک لە کامڵبوون دیمـەنی نیـو ملیـۆن ساڵی پێش ئێستای سەر زەمینە بە پیتەکەمان بە زندوویی پیشان بدا، وەک چـۆن شاشـەکان بـارودۆخی نەتەوەکانی ئەمرۆ پیشان دەدەن و شتی ئەوروپا و ئەمەریکا و تەقتەق بە بەر چاوەوە ببینی. کەچی ناتوانی ماڵی دراوسێکەت ببینی. لەو رووەوە ناڵێم بابەتەکە لـە زەینـی ئەوانـە نێزیـک بکەمـەوە کـە بایەخ بە گریمانەکانی پاشەڕۆژی بواری زانست دەدەن، بەڵام لە قامووسی زمانـەکانی دنیـادا وشـە دەبینی لە چەند پیتێک پێکهاتووە و ژمارەیان لـەملیۆن لایـداوە و دەشکرێ لـەو حەرفانـە وشـەی لەژمارەنەهاتوو پێکبهێنن: ئەو وشانەی لە دوو پیت پێک دێن ژمارەیان کەمن، بەڵام کە بـوون بـە سێ لـە هـەزاران تێدەپـەڕن ئـەوجا ملیـۆن و ملیـارد و ئەگـەر ژمـارەی پیتـەکان بکەیتـە بیسـت

(ڕێگەیەک بۆ دۆزینەوەی ئەو ژمارەیە هەیە بەڵام نایزانم)[*]. جا ئەگەر ژمارەیەک کە خۆمان دروستی دەکەین لە سنووری تێگەیشتنمان دەرچێ ڕات بەو کەونە بێسەرەتا و بێکۆتاییە چییە کە پڕە لە ڕاستی و نهێنی و غەیبیات و بەڵگە و ڕەنگە شتی دژ بە یەک ببینین کە تێکئاڵاون و جیادەبنەوە و چوونەتە ناو یەکەوە و پێکەوە لکاون و چین لە سەر چین و جۆر و بۆشایی و ماددەگەلێک کە لەو بابەتانە نین کە لەگەڵیاندا ڕاهاتوین و لەوەیە بۆ تێگەیشتنمان مەتەڵ بن و هەستمان سڕ بکەن و عەقڵمان ڕاگرن و کەمیکیش پێش بەئاگاهاتنمان سەرمان لەو جۆر و بابەتانەی دەوروبەرمان سوڕمابوو کە لەگەڵیاندا ڕانەهاتبووین و بە خەیاڵماندا نەدەهاتن و لە جۆری سروشتیان تێناگەین و نە شلە و نە غازە و نە وشکە و نە وزەی ڕەهایە و قورسایی و ڕاکێشان و توانای پێکەوەنانی ئەو وێنەیەی کە بەشەر یا خەلقەندەیەکی باڵاتر لە بەشەر تیادا نییە. جا خوێنەری هێژا ئەگەر لە خوێندنەوەی ئەم دێڕانە تێر بوویت جێی کەمترین سەرسوڕمانی ئەم کەونەیە کە من بیری لێدەکەمەوە و لە سەر (چۆن؟) و (بۆچی؟) و کەی؟ و لەکوێ؟ و لە چیدا؟ و ئایە؟ و یان؟ دەمەتەقێم لەگەڵدا مەکە چونکە بە قەدەر کونی دەرزییەکی ئەم کەونە پڕ لە نهێنی ڕەهایەت بۆ ناکرێتەوە... مەبەستم ئەو کەونەیە کە دەکەوێتە بەر مەودای تێگەیشتنی مرۆڤەوە دوای تێپەڕینی زانیارییەکانی لەخێرایی تیشک و دەکەوێتە بزاوتنێک کە بە لاتەوە نائاشنایە، چونکە لە ئێستا دەردەچیت و دەچیتە ڕابردووەوە و دایدەخەیتەوە و کات بە گوێرەی تۆ دەگەڕێتە دواوە و تۆش پێش خێرایی تیشک دەکەویتەوە و کات بەجێدێڵی و ئەوجا کات خۆی دوات دەکەوێ و پێتڕاناگات. دەبینی ڕۆژی دوێنێ بۆت گەڕاوەتەوە و پێیدا تێدەپەڕیت و دەبینی لەبزاوتندا خاوە و ئەگەر خێرایی خۆت خاو بکەیتەوە تا ئاستی خێرایی ئاسایی ماددی هەست بەو خاوییەی دەکەیت دەنا تێپەڕبوونت بە خێرایی تیشک یا زیاتر دەبێتە هۆکار بۆ گەڕانەوەی ڕابردوو بە خێرایی تیشک، ئەو خێراییە ئاساییەی کەونی لێدەرکرێ کە لەگەڵیدا ڕاهاتووین و (لە

[*] ئەو یاسایەی مامۆستا ئاماژەی پێ دەدا، لە بیرکاریدا پێی دەگوترێ یاسای گۆڕین (Permutation). بە پێی ئەو یاسایە، لە زمانێکدا کە ژمارەی پیتەکانی (24) بێ، ژمارەی ئەو وشانەی لە دوو پیت پێکدێن، (600)ە جا واتای هەبێ یا نەبێ:

!/(25-2)! = (25x24x23x22...) / (23x22x21...)=60025

خۆ ئەگەر وشەکان لە 3 پیت پێکهاتبن کۆیان دەبێتە: 13800 وشە... 4 وشەیی دەبێتە 303600 و 5 وشەیی دەبێتە 6375600 وشە.. ئیدی بەو شێوەیە. یاساکەش ئاوهایە:

$${}_nP_k = \frac{n!}{(n-k)!}$$

لە کاتێکدا (n) ژمارەی گشت پیتەکانە و (k) ژمارەی ئەو پیتانەیە کە وشەکان پێکدەهێنن. (ح.ک)

خێرایی تیشک زیاتر ئەو خێرایییەی لێ دەرکەی کە لە جیهانی فیزیادا دەیزانین). ئەوجا ماوەتەوە ئەوەی گریمانەیەک لە سایەی خێرایی تیشک و زیاتریشدا وەدۆزین تا بزانین چۆن بوون و ژیان دەگوزەرێنین چونکە ئەگەر لە سەر ئەو شێوازەی پێش سواربوونی خێرایی تیشک و زیاتر بمێنینەوە کە لە خێرایی ئاساییدا دەمانگوزەراند، دەبێ بزانین جاینی لوقمەیەک 9300 سەعات دەخایەنێ ئەگەر بە خێرایی 10000 میل لە سەعاتێکدا کە مەودای نێوان خۆر و زەوییە، بفرین[19].
لە کاتێکدا ئەگەر بە پێی خێرایی تیشک یا زیاتر ڕەفتار بکەین و کۆئەندامی هەرسکردن لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو خێرایییەدا بگونجێنین نازانم هەرسکردن کاتە ئاساییەکەی خۆی دەوێ یا مەودایەکی فەلەکی وا دەبڕین کە سەرسامامان دەکا یا لەو خێرایییەدا تێکدەچێ و لە (ناکات)دا هەرس ئەنجام دەدرێ!! ڕەنگە ئەم قسەیە ڕێی تێ بچێ و ڕەنگیشە لە خورفبوونی بزربوونی نێوان ئەو واقیعەی تیایدا دەژین و ئەو واقیعەی لەخێرایی تیشکدا بیری لێدەکەینەوە، پەیدا بووبێ. شارەزاییم لە بیرکاری و بیرکاری فەلەکناسیدا نییە تا بە یەقینەوە یا ئەو ڕێیانەوە حوکم بە سەر مەسەلەکاندا بدەم کە دەچنەوە سەر یەقین یا ڕێتێچوون. ڕێم بە خۆم دا لە ڕۆحی بابەتەکە دوور بکەومەوە تا ڕوانگەیەک بۆ بەرچاوی خوێنەر بکەمەوە کە تەمەنی لەگەڵ بەڵگەنەویستی وادا بردۆتە سەر کە لە حەق و واقیع و یەقین دوور کەوتۆتەوە و تەنانەت بەو کۆمپایەشڕا نەگەیشتووە کە نانی خێزانی بۆ دابین دەکا و وەک زندوەرێک لە سەر بەردەوامی ژیان سوورە لە کاتێکدا ڕۆشنبیر بە باری گرانی ماددییات و شۆڕشیات و عەنتەریاتەوە بە خەیاڵ بە ناو پاشەڕۆژدێکدا دەفڕێ بە وەهمی خۆی دایمەزراندووە هەڵپەکانی ڕێیان بۆی خۆش کردووە و (مەهدی)ی هادی، کە کلیلی بەهەشتی پێیە، مزگێنی بۆ داوە. لە ناوەڕاستی ڕێگایەکی نیوەچۆڵدا خەڵکی نیوەبرسی وەهای پێیدا دەڕۆن کە شوێنپێی خۆیان بە تەواوی فەرق ناکەن و شیعری شاعیرێکی بەڵێندەری شتێکی وەک بەهەشت دەڵێنەوە: (لە سەریاندە کەریم لە سەریاندە ـ گەل و سوپای مەزن لەخائینان دەپارێزێ) مەبەست لە کەریمیش عەبدولکەریم قاسمە و زەمان سووڕایەوە و ساڵی 1959 لە کوشتارەکەی کەرکووک حوکمی ئیعدام بە سەر پتر لە بیست تێکۆشەری چەپدا درا ـ ساڵی 1963 دوای هاتنی بەعس بۆ سەر دەسەڵات ئیعدام کران. ئەوجا ئەو چەپڕەوە توندڕەوانە لە هەموو عیراقدا پەنایەکیان نەبوو خۆیانی لێ چەپارە بدەن هەریمی کوردستان و دەستەی پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان نەبێ و مەبەستیش لە داوای سەرپەڕاندنەکە هەر ئەوانیش بوون. ئەمە لە بارەی ئەو وڕێنانەوە باس دەکەم کە کەللەی بۆش و دڵی دژە ویژدان و بەزەیی پڕ کردبۆوە و ئەو ڕۆژە نەیاندەزانی و ئەمڕۆش نایزانن کە لەگەڵ مەحاڵدا سەرقاڵن و یەکێ لەو مەحاڵانە لەناوبردنی دوژمنانی لایەنەکانی خەباتی کوردە، ئەگەر چارەنووس یارمەتیدەری بێ.

پێویست ناکا بڵێین چەپی توندڕەو لەکوردستانی ئێمەدا حاڵەتێکی بە سەردا دێ کە بە سەر سەگێکدادێ، سەگی هار گرتبێتی و ئەگەر زێڕ بخەیتە پێش چاوی دەچێتە سەرەمەرگ و بەڵکو دەشمرێ، بەڵام کە کوردێک دەبینێ وەک تاوس ناز دەکا و تفەنگەکەی یا ڕەشاشەکەی دەردەخا... من ئەوە دەڵێم و لە هەموو کەس زیاتر دژی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی پێشمەرگەم و هەر بیانوویەک بهیننەوە سووربوونی زیاتر دەگەیەنێ لە سەر چەواشەکاری و کوفر و لەدەستدانی ئاواتی مێژوویی نەتەوەیی... بە پیرۆزترین پیرۆزەکان سوێند دەخۆم کە من لە هەموو کوردێکی تر، هەرچییەک بێ، بۆ دەستبەتاڵی چەپی توندڕەوی کورد بە پەرۆشترم چونکە من بە فکر دەژێم و سەرقاڵی کێشە کۆمەڵایەتییەکانم و جێی ئەوەم نییە گرنگی بە ماددیات و شەڕی سیاسی بۆ دەستکەوتی دنیایی بدەم. چەند ڕووی نەریتی عەقڵم بۆ دەردەکەوێ و دەبینم قازانج خولقێنەری شارستانەتییە و کە واتاکان لە شیعرەکانی نالی دەدۆزمەوە کە بۆ خەڵکی تر ئاسان نین و ئەوەش لەو شۆڕبوونەوەمەوە هاتووە بەرەو ناوبوون، بە مرۆڤ و حەیوان و ئاو و ئاسمان و جمەی مێروولەی بەر دەرگای ژوورەکەمەوە، ئیدی بەڵگەنەویستە خەمم بۆ لە دەستدانی چالاکترین کوڕانی و ئاراستەیان بەرەو مەرامی مەحاڵ دووقات بێ ئەگەرچی هەموو تەمەنەکان و سەردەمەکان بکوتنەوە و چیا بڕووخێنن و زەریا وشک بکەن و هەرگیز پراکتیزەکردنی کۆمۆنیزم بەدی نایێ، تەنانەت دادی کۆمەڵایەتی و تەنانەت ڕەفتاری شارستانەتیش بەدی نایێ و بگرە دیموکراتیش کە خەڵک بە کەرەسەی بەر دەستی دەزانن نایەتە دی و ئەوەندەش بەسە کە کوردستان ئەو شتەی تێدا نییە کە پێی دەڵێن بۆرژوا. نە بانکی کوردیمان هەیە و نە دراوی کوردی نە کارگە و ڕێگاوبان و تەکنیک و پاشخانی چەند سەدەیەکی کوردیمان هەیە. کۆمۆنیزم(*) سستەمێکی ئەرۆستۆکراتییە و لووتی لە ئاسمانە و زانست و تێگەیشتن و تەکنیک و فەلسەفە و شارستانەتی و لێهاتوویی و ڕێزی ڕای بەرانبەری دەوێ و یەکەم شت لە دژی خوێنڕشتن و کاولکردن و درۆهەڵبەستنە: قسەیەک لە دیموکراتێکی سەدەیەک لەمەوبەر دەگێڕنەوە گوتوویەتی: ڕەنگە لەگەڵتدا هاوڕا نەبم، بەڵام ئامادەم خوێنی خۆم بڕێژم بۆ ئەوەی تۆ ڕای خۆت دەرببڕیت... و ئەوەش قسەیەکە مەلایەکەت پێی ناگوترێ، چونکە مەلایەکەت شەڕ ناکەن!! ئەوەشمان زانی کۆمۆنیزمی ئەوروپا بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەستبەرداری شۆڕش بوون و باوەڕیان بە دەنگدان هێنا. نەک بە مووشەک و بۆمبا ئەگەرچی دەیان ساڵ لە دوورترین مێژووی مەیلەو قەبووڵکراوی دەستبەردان لە شۆڕش دواشکەوتن.. لە ڕاستیدا ئەگەر چینی سێیەم زۆرینەی دانیشتوان بن و کۆمۆنیزم تەعبیر لە بەرژەوەندییان بکا و هەڵبژاردن بۆ زۆرینە مسۆگەر بێ، ئیتر بۆچی پەنا بۆ ڕێگەی دژوار بەرن؟ من بۆ گەیشتن بەو ڕاستییە بیست ساڵ پێش هەموو

(*) پێم وایە مامۆستا مەبەستی بۆرژوازییەتە نەک کۆمۆنیزم. (ح، ک)

کۆمۆنستکان و ناکۆمۆنستەکان کەوتمەوە جگە لە تاوانبارکردنی ستالین ئەوەش کە لە لایەن جیهانی چەپەوە دەپەرسترا و جێی سەرنجی زۆرینەی خەڵک و تەنانەت ڕۆشنبیرانیش بوو: کە دەبینم ڕۆشنبیری دەرەوەی کۆمۆنیزم بە ستالین سەرسام بوون، برینم دەکولێنەوە و دەپرسم ئاخۆ ئەگەر دۆستێکیانی ئیعدام بکردایە لە سەر هەمان هەڵوێست دەمانەوە؟ خەمەکە قورسە هاوڕێم! ڕێگاش دوور و دژوارە عەزیزم! تێگەیشتنیش لە زۆربەی وڵاتانی جیهان لە ئاستی منداڵێکی دە ساڵیدایە.. ئەوەشی لێرەی دەخوێنیتەوە، وێنەیەکە لە نەخۆشخانەی شێتان بە بێ زیادی و بە نەختێ کەمیشەوە لە چەندین و چەندین وڵاتی وەک وڵاتی ئێمەدا!

وای لەو دەستخەڕۆیی و بەدبەختییە! هیچ قسە و ئامانجێکی چەپی توندڕەوی کورد لە چلەکانەوە نەهاتۆتە دی ئەوە نەبێ کە لە نامیلکە بەدناوەکەیاندا هاتبوو و خۆی بەوەوە هەڵکێشابوو کە کورد نەتەوە نییە!! نازانم بۆچی پەرەیان بەو بابەتە نەدا تا ئەوەی بە عارەب بڵێن: ئێوە ئوممە نین چونکە دابڕاون و لە زیاتر لە بیست دەوڵەتدا دەژین و خاکتان یەک پارچە نییە و خۆتان کۆیلە کراون و تورکیش نەختێ لەو نەخۆشییەی بەرکەوتووە چونکە لە یەک دەوڵەتی تورکی زیاتر هەیە و دوو ـ سێ نیشتمان زیاتریان هەیە و فارسیش درێژەیان لە دەرەوەی نیشتمانی خۆیاندا هەیە کە دەوڵەتیان نییە.. بلوجیش لە ڕاستیدا وەک جمکی کورد وان بەڵام کۆمۆنستی کورد زامداری نەکردوون...

دەبێ بۆ ڕاستی ئەوە بگوترێ کە تێکۆشەرە شۆڕشگێڕەکان لە ئاستی جیهاندا بەوە ناسراون کە خەڵکی ناواقعین و لە سروشتی کۆمەڵگاو و خەڵکی ئاساییەوە دوورن: لە قسەدا زیرەکن و لە سەر ئاشکراکردنی کەموکوڕی خەڵکی تر سوورن و لە دەربڕین و ڕەفتاردا نەترسن، بەڵام بە کەڵکی بیناسازی نایەن و باوەڕ ناکەم وەک خەڵکی ئاسایی تر بەرگەی ڕۆژێکی ئاسایی بگرن. لەگەڵ ڕێزمدا بۆ هونەرمەندە تەشکیلییەکان بە قوتابخانە جیاوازەکانیانەوە (لەم ڕووەوە پسپۆڕیش نیم بەڵام بە لای بەرهەمەکانیاندا ڕادەکێشرێم و درک بە شوێنی داهێنان لە لەوحەکانیاندا دەکەم و بەو توانایەیان سەرسامم کە زەینم بەرەو پشت خەتەکانیان و جێی فرشەکانیان ڕادەکێشن و هەر دەڵێی بە دەوری ستوونێکدا دەمسوڕێننەوە و پشتەوەی نابینم...) و ئەوان لە ڕەهایی (تەجرید)دا کە لە توانایدا نییە نانێک بۆ برسییەک پەیدا بکا، لە لووتکەی داهێناندان. ئەوەشی لە سەر شێوەی ژیان و ڕەفتاریان بڵاو دەکرێتەوە، لەگەڵ دوورکەوتنەوەی داهێنانەکانیان لە داهێنانی فڕۆکە و دۆزینەوەی نهێنییەکانی کەون و کۆپیکردنەوەی بەشەردا یەک دێتەوە. بوونیان وەک توحفەی گرانبەها لە کۆشکێکی مەزندا پێویستە چونکە هونەرمەند وەک پەردەی تەنک و کۆڵکەزێڕینەی ئاسۆی مرۆڤە... وەک نووکی پەنجەی جادووییە بۆ چاکبوونەوە... ئەوان، ئەوانن و کەسی تر نین.

شرِ دەپۆشن و لە پەنا دەخەون و ڕەنگە بە تاوانی سەرگەردانی ببرێنە بەندیخانە و کە دەریش دەچن، شوێنەواری خوێنی دڵیان لە سەر شێوەی خەتخەتۆکێ بە دیوارەکانیەوە جێدەهێڵن و ڕەنگە شێوەی گیتارێ یا چەقێکی ڕوون لە ئاسمان دەربخا. ئەوان و سۆفیەکان لە ڕووی ڕەهاییەوە لە یەک قورِن: مەبەستم ئەوەیە لەو دەستەیەدا لووتکە هەیە لەگەڵ ئەو سەرنجەدا کە ژمارەی لووتکەکانی هونەرمەندان زیاترن چونکە سۆفی پێشرِەوی سەردەمی خۆی ئیمامی سۆفیەکانە و یەک کەس یا سێ یا دە کەسن و ئەو هونەرمەندانەی ئاماژەیان بۆ دەکرێ لە ژماردن نایەن. هۆیەکەش ئەوەیە مەیدانی هونەر بەربەرین و بێسنووره و ڕەنگە مێرووڵەیەک بکاتە چەقی و بە گوێرەی توانای هونەرمەند واتا و بۆچوون بە دەوریدا هەڵرژێ. مەیدانی شاعر لە مەیدانی نووسەری کتێب بەرینترە چونکە کەرەسەی وەزن و قافیە، قەریحەی شاعیریشی بخەرە سەر کە کۆتایی نییە، دەتوانێ چەندین دیوان، یەک بە دوای یەکدا دەربکا تا دەگاتە سنووری بێزارکردن. جگە لەوەش، ناوەرۆکی دیوان بە بۆچوون دادەندرێ و لەوەیە لە قاڵبێکی شیعریدا نەفرەت لە دیموکراتی بکا و زەنگی جنێودان لە گوێی بیسەردا خۆش بکا. جەواهیری دوای تێکشکانی ڕاپەڕین بە شۆڕشگێڕانی ڕاپەڕینەکەدا هەڵدەڵێ و دەڵێ:

(تفحم، لعنت، ازیز الرصاص وجرب من الامرمایقسم)
بە قوربان گوێ بە گیزەی گوللە مەدە
لە شتەکاندا، چارەنووس تاقیکەوە

وشەی (لعنت) لێرەدا 'خۆم بە قوربانت کەم' دەگەیەنێ... چ قەیدیشی نییە لێرەدا باسی پەراوێزێکی ژیانی هونەرمەند بکەم و سواڵکەر و حەماڵ و پاڵە و هەموو هەژاران و قوڕبەسەرانی گوند و شار زۆر لە پێشبینی هونەرمەندانەوە دوورن و تەنانەت برسییان بەهایەکی ئەوتۆ بۆ بوونیان دانانێن و ئاوەڕ لە داهێنانیان نادەنەوە و تێشیناگەن. ئەگەر وێنە ڕەسەنەکەی جیوکۆندا بە پاڵەیەکی دەوروبەری ئامێدی بفرۆشیت بە یەک فلس نایکرێت و ئەو و خەڵکی وەک ئەو ڕقێکی ئاشکرایان لە شتی وایە.. لەم لایەنەوە بە بیرم دێتەوە بازرگانێکی دەوڵەمەندی بەغدا کە لە بنەچەدا خەڵکی کەرکووکە لە مەزاد قامووسێکی کڕی (نەخوێندەواریش بوو) و چووە لای خوشکەزا پزیشکەکەی و پێی گوت: 'فڵانی قامووسێکم بۆ هێناوی!!' دەشمەوێ وێنەیەکی خەیاڵاوی واقیعت پێ بڵێم تا زیاتر ئاگاداری کۆمەڵگە بیت، ئەگەر تاکەتاکەی هەر جۆرێک و هەر پیشەیەک و هەر چینێک و هەر زانست و هونەر و سیاسەت و دینی جیاواز و کەلەپووری جیاوازت گرد کردەوە و فەیلەسووفی خواناس و خوانەناس و زانای هەموو بوارەکان و شێخی تەریقەت و خەتیبی مەزهەب جۆربەجۆرەکانی جومعە و بازرگان و دارکەر و بەقاڵ و زبڵڕێژ و

وەرزێر و کاروانچی و شوفێری تاکسی و و سەرەکوەزیران و سەرۆکی زانکۆ و ئەهلی ڕۆژنامە و چاپخانە و ئەفسەری سوپای پلەباڵا تا خوارەوە تا سەرباز و فەڕاشت هێنا و تێکەڵت کردن، چۆن بیر لە ئەنجامی ئەم کۆمەڵە دەکەیتەوە؟ ڕێت هەیە گەورەترین سوێند بخۆی کە کۆمەڵێکی ئاوها یەک سەعات دەوام ناکات و یەک ڕستەی واتابەخشی پێ ناگوترێ و لە ناخی هەر یەکێکیاندا هەزار نەفرەت لە ڕۆحی ئەو کۆمەڵگەیە و دامەزرێنەری ئەوانەش دەکرێ کە بە پیریەوە دەچن... خەڵکی هەمەجۆر لە یەکتری غەوارەن و لە شتی نائاشنا دوور دەکەونەوە. باوەڕت هەبێ فەرمانبەرێکی بەرتیلخۆر زۆر لەو کەسانە بێزار دەبێ کە کاریان دەکەوێتە لای و ناچار نابن بەرتیل بدەن.

لەم کورتەیەدا باسی ژنم نەکرد ئەگەر تاکە جیاوازەکانی کۆ بکرێنەوە چ دەبێ بەڵام دەشێ حاڵوبار و ڕەفتاری بە پێوانە لەگەڵ پیاودا کورت بکرێتەوە وەک ڕەفتاری هەردوو ڕەگەز لە گەرماوی گشتی هەردووکیاندا و بە دڵنیاییەوە شەڕ لەنێوان ژناندا زیاتر و توندوتیژترە. لە وڵاتە موسوڵمانەکەی ئێمەشدا بە دیاریکردنی دوو هۆکار کۆتایی دێنین: یەکەمیان بارگرانی منداڵبوون و زەحمەتی شیردان و شەونخوونی و خەمی کاتی نەخۆشی منداڵ و پاککردنەوەی کۆرپە و مەودای بێزاری فراوانە، بۆ نموونە شوشتنی کۆرپە و دایکان لە گەرماودا دەرفەتی پاککردنەوە دەبینن کە لە ماڵدا ئەو دەفەتە نییە و ئەگەر منداڵی پەنجا ژن کۆ ببنەوە دەبێتە هەرا و شەڕ دەقەومێ... هۆی دووەم غیرەی مێینەیە لە مێینەی تر بۆ ئەو ڕێتێچوونەی ببێتە هەوێی و مەودای خۆشەویستی بەو هۆیەوە بەرتەسک دەبێ.. هۆی لاوەکی تریش هەن وەک جلی گرانبەها و بوونی خشڵی زۆر بە باڵای یەکێکی خواپێداوەوە.. جگە لەوانەش مەودای هەناسەدانی ژن لە هی پیاو تەنگترە.. قسەش هەموو لە سەر ژنی وڵاتی ئێمە و وڵاتە هاوشێوەکانێتی لەڕووی هەژاری و دواکەوتووییەوە..

وەک دەبینیت، گونجان هەمیشە کارێکی ئاسان نییە و چەند ژمارەی خەڵکەکە کەمتر بێ گونجان بواری زیاتر دەبێ و شێوازی کاریش چەند لە یەکترەوە نێزیک بێ گونجانیش زیاتر دەبێ چونکە کار هۆکارێکی بەهێزە بۆ نێزیکبوونەوەی تاک و کۆمەڵ و کۆششیش بۆ ژیان لە جێی خۆیدا بە گرنگی لە نێوان تاکەکان و کۆدا دەمێنێ بە تایبەتی لە کاتی نەهاتیی بازاڕدا.. لێرەدا نە خۆم دەگرم و نە فرمێسکی چاووم کاتێ کارەساتی خێزانێکم لە گرانییەکەی 1917دا بیر دێتەوە، باوکم بۆی گێڕامەوە یەکێ لە دانیشتوانی گەڕەکەکە کە دوالوقمەی خێزانەکەی تەواو بوو، ڕایگەیاند مردنی پێ باشترە لە دەرۆزەکردن و دەرگای ماڵەکەی لە سەر خۆی و خێزانی هەڵچنی وهەموویان مردن.. ئای لە دڵڕەقی کارەسات.. هۆکاری هەرە سەرەکی گرانیش زوڵمی حکوومەتی

عوسمانی بوو چونکە سەرانی پۆلیس و سوپا لە کاتی پێویستیدا دەبنە ڕێگر و جەللاد و ڕێی تێدەچێ بە بەرتیل بێتاوان لە جێی تاوانباردا ئیعدام بکەن. دەزانم کەسێک بە ناوی (تاها..) حوکمی ئیعدامدرابوو، بەڵام ڕێککەوتن لەگەڵ قائیمقام و دارودەستەکەیدا کرا تا کەسێکی تر کە ئەویش ناوی (تاها) بوو ئیعدام بکرێ و ئەم کلۆڵە لە گوندی پیبازۆک لای بزنگەل بوو و لە کۆیە ئیعدام کرا و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش وەک نیشانەی دواکەوتنی گەلێک شتی ئاوها ڕوو دەدا.

ئەوەی لەو چەند دێڕەدا باس کرا هەندێ لە ناوەڕۆکی شێتخانەکەمان و وێنەی کۆمەڵگەکەمانە و کەس بە هەڵەدا نەچێ دەرمان لە عیراق یا واقی واقەوە بێ و چارەسەری بکا چونکە ڕێگای چارەسەر دوور و درێژ و سەخت و بەپێچە و دامەزراندنی حیزب بۆ دین و دنیا ناخۆشتری کرد کە بە خۆیان نەبێ بە کەس باوەڕ ناکەن (بەو مەرجەی خۆی لە بەختەوەری هەموواندا، نیەتی پاک بێ) و لە دنیا دواکەوتووەکەی ئێمەدا ژیانی حیزبایەتی بە هەوێنی سیاسی دینی و چەپایەتی و ڕاستایەتی، یا بە بێ هیچ هەوێنێک دەستی پێ کردووە و هەمووشیان خۆیان بە دیموکراسی دەزانن و لە لوولەی دەمانچەوە جێبەجێی دەکەن و لەگەڵ کەشوهەوایەکدا ڕانەهاتوون بیر تیایدا بە ئارامی بەردەوام بێ لە وڵاتەکانیاندا شارستانەتییەک نەبووە چەند سەدەیەک دەوامی بووبێ و هەموویان لە قسەدا دیموکراتین و لە کردەوەدا ئیرهابین و دیموکراسی ناچێتە ژێر بارێکەوە شارستانی و ڕۆشنبیری و هونەر و سامان و دادپەروەری نەبێ و لە بۆشایی دروست نابێ و تەنانەت لە کەشوهەوایەکی بێلایەنیشدا سوود لە زانست و هونەر و تەکنیک و ڕەفتاری شارستانی نابینێ. نەتەوە هەیە لە وڵاتی خۆیدا هەوڵی بەدەستهێنانی ئۆتۆمبیل و قەتار دەدا و بە فڕۆکە بۆ وڵاتانی تر سەفەر دەکا و لە ڕۆیشتن و پشوودا بە ئامێری زانستی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی ئەودیوی زەویدا دەکا و پەیماننامەی بازرگانی دەبەستێ و هەر دەڵێی ڕێکەوتنەکە لە ماڵی خۆیدا ئەنجام دەدرێ. کوردێکی عیراقی بۆی گێڕامەوە لە ئەمەریکاوە سەفەری بەریتانیای کردووە و ئۆتۆمبیلێکی هەرزانی بۆ پێداویستی خۆی کڕیوە و دوایی ئۆتۆمبیلەکەی لە جێیەک جێهێشتووە و چاوەڕوان نەبووە بیفرۆشێ. کە گەیشتۆتەوە ئەمەریکا، دوای چەند ڕۆژێک نامەیەکی لە شارەوانی لەندەنەوە پێ گەیشتووە و پێیان ڕاگەیاندووە کە ئۆتۆمبیلەکەی لە جێیەک ڕاگرتووە بۆ وەستانی ئۆتۆمبیل تەرخان نەکراوە و سزای ئەوەش ئەوەندە فلووسە. هیچ چارەیەکمان بۆ ئۆتۆمبیلەکە نەدۆزییەوە ئەوە نەبێ بیفرۆشین و پارەی سزاکەی لێ دەرکەین و چی ماوەتەوە بۆتی دەنێرینەوە. ئەو کوردە گوتی ئەو مەبلەغەی کە ناردبوویان لەو پارەیە زیاتر بوو کە ئۆتۆمبیلەکەی پێ کڕیبوو.

من ناڵێم ئەو وڵاتانەی پێیان دەڵێن پێشکەوتوو، لە ڕاستیدا پێشکەوتوون و بەهەشتی خودان لە سەر زەوی، بەڵام بە عەیبەکانیان و گوناحەکانیشیانەوە، لە وڵاتە شین و مۆر هەڵگەڕاوەکەی ئێمەدا، وەک زندەخەو دێنە بەر چاو، بە تایبەتی دەوڵەتە سکەندیناڤیەکان و فینلەندا.

ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە لەو پلە کۆمەڵایەتییانە بەجێ ماوون کە نەختێ پێشتر باسمان کرد، دەبینین لە هیچ شتێکدا یەکرا نین و وەختە مەحاڵ بێ دەنگدان لە نێوانیاندا بۆ هیچ بەرژەوەندییەک یا لایەنێک کە جێی گرنگیپێدانیان بێ بکرێ. ئەو کۆمەڵە خەڵکە کە زمانی هاوبەش لە نێوانیاندا نییە، خۆیان زمانی هاوبەشیان تەنانەت لەگەڵ نەتەوە پێشکەوتووەکانیشدا نییە و قسەی زانایەکی ئەتۆم لەگەڵ بۆچوونی بازرگانێکی کۆمپیوتەر یا دەرهێنەری فیلم یا وەعزدەری جێی عیبادەت یا ئەوانەدا یەک ناگرێتەوە کە بە چیاکانی کلیمانجارۆدا هەڵدەگەڕێن. بەڵام لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا دەنگی هەڵبژاردنی گشتی و هەستکردن بە هەڵە و ڕاستی لە ڕەفتاری سیاسی یا موعامەلەی ئابووری دا کۆیان دەکاتەوە، کەچی لە وڵاتێکی وەک وڵاتی ئێمەدا بە هیچ شێوەیەک پەیوەندییەک لە نێوان ئەو تێکەڵەیەدا نییە.. بۆ نموونە دەڵێم ئەو هەڵبژاردنەی چەند ساڵێک پێش ئێستا لە هەرێمدا ئەنجام درا قاڵبێکی بێ گیان بوو چونکە بانگی خەڵکی بۆ دەنگدان کرا و دەنگیان دا بەڵام وەزیری بەرگری دەمانچەیەکی نەبوو لە کاتێکدا پێشمەرگەی هەردوو حیزبەکە هەموو سوپا بوون نەک بۆ بەرگریکردن لە کوردستان بەڵکو بۆ ئەوەی دەست بە سەر واقیعەکەدا بگرن... پەرلەمانیش ئەگەر ناوی (ڕەپلەمان یا مەپلەران) یا هەر ناوێکی تری وەک (فسنستنبکتکنفتموها) یا (دال دو ژێر دین إذا قوقب)[20] بوایە هیچ نەدەگۆڕا... دوای ئەوە بێبەهایی ناوەڕۆکی دەنگدان و پەرلەمان لەوەدا هات زمانی واقیعی گشتگر جارێک و دوو و سێ لە شەڕی براکوژیدا دەرکەوت..

تا خوێنەر نەخەمە بەردەم بیانووی سیاسی بە ئەرکی خۆمی دەزانم ڕای خۆم لە بارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی دەنگدان دەربڕم. ئەوەی لە ئیفلاسی دەنگدان و مردنی پەرلەمان کەوتەوە، نە بە ڕێکەوت بوو نە لە بۆشاییەوە هاتووە، بەڵکو حوکمی واقعێکی دواکەوتووی وێرانە و هیچی پێ نییە ئەوە نەبێ ڕەفتاری شیاوی میللەتی وەک میللەتی ئێمە بسەپێنێ و چۆن پاڵە سمۆکن لە بەر ناکا و باجی ئایشۆک لە زۆرانبازێی گادا دەرنابا و نەخوێندەوارێک ناتوانێ ڕەگی سێجای (85936754) دەربکا یا قوتابییەکی سێی سەرەتایی سەری لە کونە ڕەشەکانی کەون سوڕدەمینێ، بە هەمان شێوە:

1. دەنگدەری کورد بە جۆرێ دەنگ دەدا کە واقیع بە سەریدا سەپاندووە و وەک ئەوەیە نویژی نیوەڕۆی کردبێ و ڕۆیشتبێ... ئەو دەنگدەرە خۆی یەکێکە لەوانەی خۆی بە مەخزەنەکانی حکوومەتدا کردووە و لەگەڵ گوللەی چەکداراندا بۆ تاڵان کێبڕکێی کردووە..

2ـ چەکدارانی ئەو دوو حیزبە بۆ وێرانکردنی حیزبی بەرانبەر بێ وچان کار دەکەن و پێشتر یەکتریان بە خائین زانیوە...

3. ناشێ حیزبی دۆڕاو مل بۆ ئەنجامی هەڵبژاردن بدا و ئەوەی پێم گەیشت ئەوە بوو ئەو حیزبەی بە یەک دەنگ دۆڕا خۆی پێچایەوە و چەکدارەکانی ئامدە کرد و دۆڕاندنەکەی بە زیادەوە پڕ کردەوە.

4ـ شێوازی دروستبوونی حیزبی وەک ئەو دوو حیزبە کوردییە و ڕێبازی خەباتیان وا دەکا دیکتاتۆریەتی سەرکردەیان شتێ بێ قسە هەڵنەگرێ یا بچێتە قوژبنێکەوە تا سەرکردایەتییەک هەڵدەکەوێ و جێی ئەوەیان دەگرێتەوە.. کیم ئیل سۆنگ کوڕەکەی خۆی سەپاند تا لە دوای مردنیدا ببێتە سەرکردە و ئاواتی باوکی بەجێگەیاند و خوا عەمری درێژ بکا گەیشتە پلەی ڕەبولعالەمین ئەگەرچی گەلە پشوودرێژە دڵسۆزەکەشی بە نەبوونیی دەژیا. ئەو دوو حیزبە کوردییانە داهێنان نین و ئەوەندەیان بەسە تاقیکردنەوەیەکی گەورەی وەک شۆڕشی 1917ی ڕووسیا وەک کۆیلەی زەلیل لە بەر ستالین داچەمی و ڕووسیا بە ئاسانیی ڕاست نەبووەوە و کۆمۆنستەکانی تریش ئەگەر لە سەر کورسی دەسەڵاتدا بمینن دووبارەی دەکەنەوە. ماو و حیزبی کۆمۆنستی چین، دوای ماوەیەکی کەم لە بەدەستهێنانی دەسەڵات ڕەفتارەکانی جەنگیزخانیان دووبارە کردەوە.. بە دڵنیاییەوە ماو دووچاری نەخۆشی دەروونی بوو (ناتوانم ناوی لێ بنێم) و لە ڕابردووی مرۆڤانەی خۆی هەڵگەڕایەوە و گەورەترین خائینی لە کەسێتی سەرۆکی کۆماردا دۆزییەوە کە هاوڕێی ژیانی سیاسی خۆی بوو. هیچ شۆڕشیک لە جیهاندا نەبووە ئەگەر سەرەتای بە بەڵێنی ئازادی و یەکسانی نەبووبێ و تاکە یەکێکیان لەو بەڵێنانەدا ڕاستگۆ نەبوونە مەگەر واقعێک سەپاندبێتی ڕەتکەردنەوەی نەبووبێ و لەوەشدا بە پێی بەرژەوەندی و ئارەزووی لووتکەی بزووتنەوەکە بووە..

کاتێ خەلافەتی موسوڵمانان درایە عوسمانی کوڕی عەفان ئەبوو سوفیان، کە خزمی عوسمان بوو گوتی: وەک تۆپ بیقۆزنەوە، بەو خوایە نە دەزانم بەهەشت چییە نە دۆزەخ... خەلیفە دەریکرد بەڵام بە پێی بۆچوونەکانیشی کرد. عوسمان بە شێوەیەک ڕەفتاری بە بەیتولمال کرد وەک ئەوەی ماڵی خۆی بێ بەڵام دزی نەکرد و خیانەتی نەکرد، ئەوجا واقعی ئەو سەردەمە کاری خۆی کرد.

یاخییەکانی عیراق تەگبیریان لێی کرد و لە کاتی قورئانخوێندندا کوشتیان. سەیدە عائشەی داکی ئیمانداران لێی ڕازی نەبوو و بۆ سووکایەتی بە (عیثلة) ناوی دەبر. کاتێکیش عەلی کوری ئەبو تالیب بووە خەلیفە و عائیشە زۆری ڕق لێی بوو، کراسەکەی عوسمانی بەرز کردەوە و لە ناو خەڵکدا هاواری کرد: بە غەدر کوژرا. ئەوجا شەڕی جەمەل لە بەسرا قەوما و لەشکری عەلی سەرکەوت. ئەوەی لە هەندێ کتیبم خوێندۆتەوە تەڵحە و زوبێر لایەنگری عەلی بوون بەڵام دوایی لایەنگریی عەلییان هەڵوەشاندەوە و بە تەمای وەرگرتنی خەلافەت دایانە پاڵ عائیشە و هەردووکیشیان کوژران... وەک لە بیریشمە هەردووکیان لەو دە کەسەن کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە. ئیدی چ نموونەیەکیان بۆ (باپیر)ی پاڵە و (پیرۆت)ی باغەوان هێشتۆتەوە تا لە سەر ڕاستگۆیی بەردەوام بن؟ کۆمەڵگەی ئیسلامی لە دوای وەفاتی پێغەمبەر و لەسەردەمی خەلیفایەتی ئەبوو بەکر و عومەردا ماوەیەکی وایان بڕی بە پێوانەی ئیسلام لە مەیلەو کەماڵدا بوو، بەڵام سیان لە چوار خەلیفەکە، کە عومەر و عوسمان و عەلی بوون، بە دەستی موسوڵمان کوژران.. کۆمەڵگەیەک زۆرینەی شەو و ڕۆژی لەگەڵ پیغەمبەردا بە سەر بردبێ و نوێژیان بۆ خوا کردبێ و سەڵاواتیان لە پێغەمبەرەکەی دابێ و بۆ حەج و ڕۆژوو و زەکات و جیهاد دەستپێشخەر بووبن.. سوپایان نیوە پێخاوس و نیوە ڕووت یەکێ لە گەورەترین دوو ئیمپراتۆری جیهان تێکبشکێنێ دەست بە سەر وڵاتیاندا بگرێ و دوایی کتێبە گرێکییەکان تەرجەمە بکا و بە سەر ئایەتی قورئاندا فەرز بکا کەخۆی لەگەڵ فەلەکیاتی بەتلیمۆسو حەوت ئاسمانەکەیدا بگونجێنێ لە کاتێکدا دەبینین ئاسمانەکانی قورئان حەوتن و بۆ گونجاندن (عەرش و کورسی)یان بە دوو ئاسمان دانا... هەموو ئەوانە کە لەسەرەتاکانی ئیسلامدا ڕوویان دا، بوونە کەلەپوور و ئەو جەماوەرەی گرنگی بە دین دەدەن بە دەستیەوە زەلالەتیانە و دەمەتەقێش لە ئاستی ڕەشەخەڵکەکە بەرزتر دەبینـدرێ تا بۆ ئاستی زانستکارەکان و زانایانی ئاین بەرز ببنەوە و لێرە وازی لێ دێنین تا بزانین پاشەڕۆژی دەمەتەقێ بە چی دەگا و بە کوێدا دەکەوێتەوە. با ئەوەش بزانین کە ئەو گفتوگۆ و دەمەتەقێیانەی باس کران کەرەسەی ئەوانە نین بەرنامەی شۆڕشگێڕییان هەیە چونکە ئەوان بۆ گەیشتن بە بڕیار لە خۆشیان یاخین.

هەندێ جار ئەوەم بە خەیاڵدا دێ ژن لە بری پیاو کۆمەڵگە بەڕێوە بەرێت و خوێندووشمانەتەوە کە سستەمی دەسەڵاتی دایک لە هەندێ سەردەمی مێژوودا باو بووە و کەس بابی خۆی نەناسیوە و بە ناوی دایکیانەوە ناسراون، چونکە هەموو پیاوان مێردی هەموو ژنان بوونە. شتێکی بلیخانۆفم خوێندەوە خەڵک لە هەندێ شوێنی یەکێتی سۆڤیەتدا (ڕەنگە قەفقاس بووبێ) شوێنەواری ئەو سەردەمەیان لە لا ماوە، ژن بۆ مەرگی نەجیبترین برای قژی خۆی بڕیوە و مێردی خۆی نەناسیوە چونکە وەک گوتمان، هەموو پیاوان مێردی هەموو ژنان بوونە. چەند بە چڕیی بیر لە

کۆمەڵگەیەک بکەینەوە کە ژن بەڕێوەی ببا و کاروباری دەوڵەت و پۆلیس و سوپا و لایەنەکانی تری لە دەستدا بووبێ، نازانین پیاو چکارە بووە و ئەدی بەشی ژن لە کاری قورسی وەک دروێنە و جووت و بەخێوکردنی مەڕ و مانگا چی بووە؟ ئەدی ڕێ بە پیاو دراوە هەندێ لەو بەلایانە بخاتە ئەستۆی خۆی یا بەشی چێشتلێنان و گسکدان و بەخێوکردنی منداڵ بووە و ئەدی ڕای لە کاری جنسی و منداڵبووندا چۆن بووە؟ بە کورتییەکەی، مەسەلەکە بە پێوانەی ئەم ڕۆژگارە ئاڵۆزە ئەگەرچی دەزانین ژن لە زەمانی زوودا دەسەلاتیشیان بووە بەلام نازانین، یا من نازانم چۆن پیاو جێی ژنی گرتەوە بێ ئەوەی شیرازەی کۆمەڵگە تێکبچێ. ئەوەی لەم بابەتە بۆ من گرنگە مەسەلەی جەنگی نێوان ئەو کۆمەڵگایانەیە کە ژن بەڕێوەی بردوون و شوێنی پیاو لەوێدا کوێ بووە؟ بە سەربازی ماوەتەوە؟ یا پلەی سەربازی پێ دراوە؟ ئەدی ئەگەر سەرکردایەتی سوپای لە دەستدا بووبێ، کە دەبێ هەمووی یا زۆرینەی پیاو بووبن، چۆن پەلاماری عەرشی ژنی نەداوە؟ عەقڵ نایبڕێ ژن بێشکەی منداڵەکەی هەڵگرتبێ و پەلاماری دراوسێکەی خۆی دابێ. هەتا ڕۆژی ئەمڕۆمان کە پێشکەوتن لە وڵاتە شارستانەکاندا گەیشتۆتە ئاستی سەرسوڕمان، ناگونجێ ژن جێی پیاو بگرێتەوە. تێدەگەم هاوسەنگی لە نێوان چالاکی ژن و پیاودا دێتە ئاراوە بە شێوەیەک منداڵبوون و بەخێوکردنی بە شتێکی نەرێتی ژن داناندرێ (لە ڕاستیدا منداڵبوون و شیرپێدانی لە شانازییەکانی ژنن بەلام ئەو پێوەرەی هەتا ئێستاش گرنگی و کاریگەری پێ دەپێورێ لە کۆمەڵگەی ماسوولکەی بەهێز و ددانی تیژدا ئاستی هێز و توندوتیژییە..). قسەیەکی خۆشی پێشینان هەیە دەڵێ میردێک بە لای جۆگەیەکدا ڕەت بوو هەندێ ئافرەت گەمەیان لە سەری دەکرد، گوتی:

ژن شەیتانن و بۆ ئێمە خولقاون            خوا لە شەڕی شەیتان بمانپارێزێ

یەکێکیان کە توانای شیعردانانی دەمودەستی هەبوو وەلامی دایەوە:

ژن پونگەن و بۆ ئێوە دروست کراون            هەمووشتان حەزتان لە بۆنی پونگەیە

منیش، سوێند بە خوا لەگەڵ بۆچوونی ئەو کیژە شاعیرەدام و پێغەمبەری عارەبی لە سەفەرێکدا کە ژنی لەگەڵدابووە بۆ هاندانی سەرقافلە تا خێرا بێ گوتوویەتی: ئاگاداری شووشەکان بە. جوانترین شتێ کە پێغەمبەر لە بارەی ژنەوە گوتوویەتی ئەوەیە: (حبب الي الطيب والنساء ـ چاکە و ژنم بە لاوە ئازیزن) و ئەوەش قسەیەکی بەجێیە بە تایبەتی بۆ ژن چونکە هیچ شتێک لە جیهانی پیاودا جێگای ژن پڕ ناکاتەوە و ژن ئەوپەڕی خۆشی هەست و سەرسامی پیاوە.

ئەوەی لە بارەی بەشداری ژن و پیاوەوە لە بوارگەلێکی گونجاودا لەگەڵ مێیاتی و توانای ژندا دەیزانین ئەوەیە جێگە و پێگەی ڕێزداریان لە ناو هەموو میللەتێکدا وەرگرتووە کە سەردەمی وەحشیگەرایی کۆمەڵگەی کلۆڵی تێپەڕاندبێ و گەیشتبێتە ئەو ئاستەی ڕێزی خۆی بگرێ. دەکرێ بڵێین ڕێزگرتنی ژن یەکێکە لە نەریتە هەرە بەرزەکانی کۆمەڵگە و پشتگوێخستنیشی مۆریکە بە هەموو کۆمەڵگەیەکەوە کە ئەو حەقارەتە ئەنجام دەدا: ئەو ژنانەی دەوروبەرت دایک و خوشک و کیژتن. بێعەقڵیی سەیر ئەوەیە نەفامەکان قسەی سووک بە ئافرەتانی ناو خێزانی خۆیان بڵێن، کەچی ئەگەر بێگانەیەک شتێ بڵێ ئافرەتیکی خزمیان لەکەدار بکا دەبنە گورگی هار. ئەرێ ئەی کەرە زماندارەکان لێتان دەپرسم: 1ـ سووکایەتی ئەگەر بێگانەیەک بە خوشکتانی بکا یا سووکایەتییەک بە دەستی برا یا ئامۆزا یا هەر کەسێکی تر بینۆشێ جیاوازی چییە؟ 2 ـ بێعەقڵێنە! زمانتان ـ زمانتان بە برین چێ ـ کە بە سووکایەتیکردن بە کەسی نێزیکتان دەگەڕێ، بێگانە بۆ ئەوە هان دەدا سووکایەتی بە خۆتان و بەوانیش بکا. 3ـ بەکارهێنانی جنێو لە بازنەی خێزاندا مجێزەکان لە ڕێزلێگرتنەوە دەگۆڕێ بۆ سووکایەتی و تەنانەت ڕێخۆشکەری بۆ سووکایەتی لە ڕێی جنێوەوە بەشی ئەوە دەکا جنێودەر بەرەو خراپتر بخزێنێ و جنێوپێدراویش لەگەڵ سووکایەتیدا ڕادێ و دوای جنێو شتی وای پێ قەبووڵ دەکرێ کە شەرەف لەکەدار دەکا. من دەزانم جڵەوشلکردن بۆ قسەدەرپەڕاندن لە زۆر وڵاتی دواکەوتوودا باوە و بە دەگمەن جیاوازی لە نێوان باسی شارستانەتی و قسەی بازاڕی و خوارتردا دەکرێ و وەختە قسەگەلێک کە لایەقی مرۆڤی پاکی ئاسایی بن لە نێواندا نەمێنن. ئەوە دەزانم و خەمی لێ دەخۆم و بڕیاری قورسی وای لە سەر دەدەم و شەویلە بۆ دزەنیگا  لە بناگوێوە بۆ بناگوێ دەکشێنێ. لە ماوەی چەندین ساڵدا سەرنجم داوە کە گوندییەک دەچێتە ناو خەڵکی شارستانەوە ئەوپەڕی هەوڵ دەدا ڕوون بێ و زۆربەی جاریش سەرکەوتوو دەبێ، لە بیرمە جارێکیان گەنجێکی گوندی هاتە هاوینەهەواری چنارۆک و سڵاوی لە جەماعەتەکەمان کرد و دەستی خەڵکەکەی ماچ کرد و بە ئەدەبێکی یەکجار جوانەوە دانیشت، گەنجێکی خزمیشمان کە لە تەمەنی ئەودا بوو سەرسام بوو و دەمی کردەوە و گوتی: تەماشای کەن، دەیەوێ فشە بکات (دەربڕینەکەی زۆر بازاڕی بوو). ڕاستە ئەو گەنجە ڕەوشتبەرز بوو بەڵام زیادەڕەوی لە ئەدەب و جوانیی ڕەفتاری سنووری زانراویان بەزاند و جێی سەرسوڕمان نییە هەندێ لەو ئەدەبەی بۆ وریایی بێ تا لە ناو دەستەیەکی شاری نەکەوێتە هەڵەوە (خوێنەر دڵنیا دەکەم کە لە هەموو تەمەنمدا گەنجم نەدیوە لە ئەدەب و جوانیی ڕەفتاردا بەو گەیشتبێ، گەنجێکی هاوتەمەنی ئەو نەبێ کە خەڵکی موسڵ بوو لەگەڵ باوکە پارێزەرەکەیدا هاتبووە هەولێر و لای مەلا ئەفەندی مێوان بوون ـ سوبحانەڵڵا مەودای نێوان خەلقەندەکان لە ڕەوشت و ئەخلاقدا چەند جیاوازە. جیاوازی نوان شێوە و ڕەفتاری دوو ئاژەڵ ناگاتە دەیەکی جیاوازی نێوان دوو

بەشەر. ئەوەندە بەسە کە ئاژەڵ نازانێ درۆ بکا و ناشزانێ بەردێ بخرێتە سەر بەردێک دەبێتە دوو بەرد.

ئەوەی لەو دێڕانەی سەرەوە لە سەر جیاوازی سروشت و ڕەوشت باسم کرد کاریگەری شاراوەی لە کۆمەڵگەی مرۆڤ و دەقگرتنیدا هەیە ئەگەرچی پلەی قاڵبگرتن و ڕاهاتن لە لایەن زۆرینەی هەرە زۆری قاڵببەستووانەوە هەستپێکراویش نەبن.. بڵاوبوونەوەی ئافاتی درۆ لە پلەی یەکەمدا بە زەرەری ڕاستگۆیی دەشکێتەوە و باشترین دەربازبوون لە درۆ بێدەنگییە لە شتی ناپێویست. زۆر ڕاستگۆیی دەبێتە هۆی بریندارکردنی هەندێ خەڵک و درۆکردن لە بارودۆخی وادا ئەنجامی باشتری هەیە بە تایبەتی ئەگەر لایەنی زەرەرکردە لە ڕاستگۆیی بەهێز بێ و توانای تۆڵەکردنەوەی هەبێ. ئەم دوو بەیتە لە قسە نەستەقەکانی سەردەمی پاشایەتین، واتە پێش 1958:

بخەون و بەئاگا مەیەنەوە          کەس براوە نییە نوستوو نەبێ

خەڵکینە قسان مەکەن          قسەکردن حەرامە

بەڵام واقیع شتێکی تر بوو چونکە هەر بڵاوبوونەوەی ئەو قسەیە و بڵاوکردنەوەی لەڕۆژنامە و گۆڤار و دیواندا بەڵگەی ئازادی ڕادەربڕینە، چونکە ئەو دوو بەیتە توانج و نەفرەتن لەو دەسەڵاتەی کە هەبوو. بەیتیکی تری شیعرێکی تر دەڵێ:

موستەشار خواردوویەتیەوە          وەزیر بۆچی هەرایەتی؟

ڕاستە ئینگلیزەکان بە هۆی ڕێکەوتننامەی نێوان خۆیان و عیراقەوە پلەوپایەی بەرزیان هەبوو. ڕێکەوتننامەکە بە دوای جەنگی نێوان ئینگلیز و تورکدا هات و دەستەی گەلان عیراقیان بەو بیانووە خستە ژێر ئینتیدابی بەریتانی، کە ناتوانێ خۆی بەڕێوەببات **(عیراق ئەو توانانەی نەبوو دوو پۆلیس بە نووسراوی ڕەسمییەوە بنێرێتە کەرکووک)** تا ئەوەی بەغدا لە ساڵی 1918دا کە ئینگلیز هاتن پردێکی کەڵەکێشی نەبوو و لە ڕاستیدا عیراق نەیدەتوانی دوو مانگیش بە بێ هێزی پارێزگاری بژێت، چونکە ئێرانیەکان و تورکەکان، جگە لە سعوودییەکان، مرخیان لێی خۆش کردبوو **و لە مێژوودا عیراق ئەو نەخشەیەی نەبووە کە ئینگلیز لە دانانیدا یارمەتیدەر بوو**... شیعەکان، چەندین سەدە بە ژێردەستەیی تورک مانەوە بێ ئەوەی لە جێی خۆیاندا ببزوێن کەچی کە سکەی ئاسن دامەزرا و ڕۆژنامە و کتێب چاپ کران و قوتابخانە کرانەوە و خەڵک لە ساڵانی 1918 تا 1920 چییان بویستبا دەیانگوت، شیعەکان ڕاپەڕینیان لەدژی ئینگلیز کرد و ئازاری

زۆریان بە ئینگلیز گەیاند بەڵام تازە قەتار لەوەدا جێی هێشتبوون ڕۆڵی یەکەمایەتی بۆ چارەنووسی وڵات وەرگرن. سوننەکان بە گوێرەی شیعەکان کەمایەتییک بوون کەچی دەسەڵاتیان وەرگرت و پاشایەکی عارەبیان لە ئەشرافی مەککە لە بری (تاڵب پاشای نەقیب) هێنا و نەقیبیش بۆ ڕوونەدانی یاخیگەرێتی دوور خرایەوە... کارەکان بەو شێوەیە بوون و لایەنی کوردیش بە پلەی یەکەم و قەومەکانی تر بە پلەی دووەم لە ڕووی مەزەبییەوە لایەنگری عارەبە سوننەکان بوون... بە کۆتاییهاتنی بزووتنەوەی شێخ مەحموود و دوورخستنەوەی لە عیراق، دەسەڵات لە دەستی عارەبی سوننە جێگیر بوو و کۆگای کەشتی دەوڵەت لە ئاوێکی مەیلەو ئارامی بێ شەپۆڵدا مایەوە.. ئەوجا ڕۆژگار بە بزووتنەوەی بەکر سدقی پاشای عەسکەری سووڕایەوە و جەعفەر پاشای تێدا کوژرا و دوای چەند مانگێک سەرکردەی ئینقیلابەکەش لە ساڵی 1936دا کوژرا... ساڵی 1941یش بە پشتگیری موفتی فەلەستین و چوار عەقیدەکە فتیلەکە داگیرسایەوە بەڵام دامرکایەوە.. ئیتر بەو شێوەیە! بۆ ئەوەی بەجێیی و بێجێیی ڕەفتاری سیاسی خۆمان لە یاد نەکەین (وای لە ڕەفتارمان) ئەم ڕاستییەت بۆ باس دەکەم: هەموو ئیعدامەکانی سەردەمی ئینگلیز لەعیراقدا، لە ساڵی 1918ەوە تا ساڵی 1958 لە بیست ئیعدام تێپەڕی نەکرد، واتە نیو ئیعدام لە ساڵێکدا و ماوەی دەسەڵاتیان چل ساڵ بوو. کەچی دوای 1958 لستەی ئیعدامکراوان گەورە بوو و لە ئەنفال و تەمێکردن و نازانم چی تردا گەیشتە دووسەد هەزار کوژراو... چوار هەزار گوندی کورد بە سەر دانیشتوانیاندا وێران کران... ئەوانەی بە غازی ژەهراوی لێیان درا، ئەوانەی نەمردن چارەسەرکردنیان لە لایەن پزیشکەوە قەدەغە کرا ـ ئەو ژمارانەشیان بخەرە سەر کە لە شەڕی عیراق و ئێراندا، کە نزیکەی هەشت ساڵی خایاند، کوژران و لە هەردوو لا لە ملیۆنێکی تێپەڕاند ـ جەنگی کەنداو... لەناوبردن و شتی تر. هیچ پێوانەیەک بۆ ئەوە نییە حاڵەتی پێش 1958 و دوای ئەوە بپێویت. دەبێ بە ناچاری خۆ بەدەست ئەم ڕاستییە تاڵەوە بدەین: شۆڕش لە هەر شوێنێک بێ دەدووریتەوە و دەکوژێ و دەسووتێنێ و سروود دەڵێ هەتا خۆی دەفەوتێنێ یا هەموو خەڵک دەفەوتێنێ. قسەی سەرکردەیەکمان پێگەیشتووە گوتوویەتی: یەک ملیۆن عیراقی ڕەسەنمان بەسە و جێی بیست ملیۆنەکەمان بۆ دەگریتەوە. با بۆ خوا دەست بەدوعا بین تا سەرقاڵی لە سەربڕینی مەڕ و بزن و گوێرەکە و حوشتر و گیاندارانی تری لا بدا چونکە ئەو گیاندارانە لە فەرمان لانادەن و لە شوانێک یاخی نابن خۆی بە سەر گۆچانەکەیدا داوە و وەک مووسای پێغەمبەر دەنگیان لێ دەکا. ئەوەی دڵنیایی بە دڵان دەبەخشێ ئەوەیە ئەو سەرکردەیە لە ڕووی ڕاستییەوە خۆی لە سەرووی گومانەوە دادەنێ... کارە نەمرەکانی بەردەوام بێ و یەک ملیۆنەکەش با بۆ نیو ملیۆن کورت بکاتەوە.. ئەم لاپەڕانەی دوایی هەموویان لە ناوەڕۆکی شێتخانەکەمانن و بە پێی توانا ڕادانی بەشەرە بەرەو شتێ کە حەزی پێی نییە. بەرپرسیارەتی بەرپرسێکی دەستڕۆیشتوو بە قەدەر فراوانی ئەو شێتخانەیەیە و دەستکەوتی خەڵک شەهادەی ڕاستگۆیی و نیەتپاکی و توانایەتی لە پێکهێنانی

درۆ و فێڵ و دەست بە سەرداگرتن و خوا نەکا جگە لە لادان و ناهەقی و کارەسات شتێکی تر مجێزی تێکبدا. مەسەلەیەکی فارسی لە سەر شێوەی شیعر دەڵێ: "طبع ناساز جعل را بوی گل درد سراست"، واتە: قالۆنچە بە هۆی تەبیعەتی نالەباریەوە بۆنی گوڵی بۆ دەبێتە ژانەسەر. ئەم بۆنەیەش بە سەرمدا فەرزی دەکا بڵێم: هەڵاوسانی دەماری مل و شانازیکردن بە پلەوپایەوە و ئازاردانی هەژاران، بە قەدەر سووکیی کەسێتی و چرووکیی ڕابردوو و نزمی ڕەوشت دەبن و دوایی ئەگەر گۆزەکەی لە دەستدا بشکێ فس دەبێتەوە... بە گوێرەی ڕقبوونەوەی چەپی توندڕەو لە دەوڵەمەند، هێرشکردنە سەر هاوڵاتییەک کە بە ماندووبوونی خۆی پارەی پێکەوە نابێ ئەو کەسە مافی خۆیەتی شانازی بکا کە بە هەوڵی خۆی ماڵ و حورمەتی بە دەست هێناوە و لێدانی کەسێکی وا لە لایەن بێدەسەڵاتێکی بێتواناوە شەهادەی ڕەوشتنزمی و نیشانەی بەخیلی و بەڵگەی بێهیممەتییە[21].

ئەگەر گوێ لە قسەی خەڵکە ڕەشۆکییەکە بگریت کە شەوان گرد دەبنەوە، وا چاوەڕوان دەکرێ کە باسەکانیان پەیوەندی بە کەسەوە نەبێ. ئەوەش لایەنیکی چاکە لەسەرگەرمییان چونکە پەلار و پەراوێزخستن و سووکایەتی بەم و بەو کە لەوێ نین دەبێتە کرۆکی باسیان مەگەر بە شتێکەوە سەرقاڵ بن لەوە هیجتر بێ بۆ نموونە باسی چالاکی کەرە شین یا سەگەکەی فڵان یا کە بۆڕییەکە گیرا چ قەوما و جۆن ئاوی پیس بڵاو بووەوە و چۆنی شێلا و جۆن دەستودامێنی ڕەحمەتی خوا و پیاوچاکان و پێغەمبەران بوونەتەوە تا لە باڵای ئاوهایان بپارێزێ. ڕەنگە لە یەکێکی زیرەکیان ببیستی کە ڕوبولعالەمین بە گرتنی بۆڕییە ئاوە پیسەکە تۆڵەی لەفڵانە کەس کردۆتەوە لەبەر ئەوەی لە کۆتایی حەکایەتێکی ناخۆشدا لە بارەی کەسێکی سێیەمەوە لاحەولەوەلا قوەتە ئیللا بیللای لە بیر چووە. چەندین مانگ و ساڵ بە یەک شێوازی تورەهات بەردەوام دەبێ تا هەڵجوونێکی سیاسی وا پەیدا دەبێ کە (بژێ و بڕووخێ و داڕزێ..)ی تیادا دەگوترێنەوە. لە بیرمە دەستەیەک لە منداڵانی گەڕەک دوای ڕاپەڕینی 1948 خۆپیشاندانێکیان سازدا و دەیانگوت: فڵان بمرێ و گۆڕبەگۆڕ چێ. ئەو فڵانەش دوکانداریکی هەرە هەژار بوو.کاتێ لە بەرێوەبەری خۆپیشاندانەکەیان پرسی ئاخۆ هۆی ئەو تووڕەییە عەنتەرییە چییە، گوتی: لەبەر ئەوەی هەموو بەیانیانێک شیری ترشاومان پێ دەفرۆشێ. ئەو فەقیرەش ئەو شیرەی دەفرۆشت کە لە گوندەکانەوە بۆی دەهات و نازناوێکی بە ناویشیەوە نووسابوو بەڵگەی هەژاریی بوو.. بە ناوی (حوسێن پووشکە)ەوە دەناسرا. ئەو ڕووداوە و شتی تری لەو بابەتانە لە هەژاریی ماددی و مەعنەوی و بێپێزی ئێستا و ڕابردووەوە دین و ئەوەی لە پاشەڕۆژدا لێیان دەکەوێتەوە لەوانە ڕوونتر نابێ. ئەوە لە سەر ئەو پاشەڕۆژە دەڵێم و لەگەڵ پاشەڕۆژی ئەو نەتەوانەدا بەراوردی دەکەم کە بە ڕێژەی ئەندازەیی پێش دەکەون. ئەو کۆمەڵگە ئیفلیجەی تیایدا ژیاوم بەوە پێش

ناکەوێ لە بری ئەوەی بە پێیان بڕوا، سواری هێستر بێ... یا سواری ئۆتۆمبیلێکی دەرەکی بێ کە بە بەنزین دەڕوا و هیچ لە دەرهێنان و ئامادەکردنی بەنزین نازانین. بۆ دڵخۆشی دەڵێم خاوەنی ئەم نووسینە شەوێکی لەو دەشتە مایەوە چونکە ئەو ئۆتۆمبیلەی خۆی و قوتابی تری لە پشوویەکدا دەگەیاندەوە شاری خۆی، لە ناو ئاودا پەکی کەوت. لە بیرمە بە هۆی درێژیی کاتی مانەوە و هەوڵی پاڵنانی ئۆتۆمبیلەکە لەناو ئاوە خوڕ و ساردەکەدا دەستی تەزی و باشترین شتێ کە کردی ئەوە بوو سدارەکەی داکەند و پێی تێ خزاندن تا خوا لایەک بە لایەک دەکا. ئەوەی لەم بۆنەیەدا جێی باسە، خوا لێخۆشبوو مەلا مەعسوومی هەورامی لەدەمەتەقێیەکدا لەگەڵ ڕۆشنبیرانی هەولێر گوتی: سەفەرمان بۆ بەغدا زەحمەتە چونکە ڕێیەکی ڕاستەوخۆمان بۆ کەرکووک نییە. پارێزەرێکی دزەیی گوتی: دەتوانن لە ڕێی هەولێرەوە بچنە بەغدا. ئەویش گوتی: سەفەرەکە دوورو درێژ دەبێ و زۆری تێ دەچێ. پارێزەرەکە گوتی: ئەو 'حەسقەلەیە چییە؟'. بە کوردی قسەی دەکرد و 'حەسقەلە'ی بەکار هێنا. خوالێخۆشبووش وەڵامی دایەوە: ئەدی ئەو 'بەطرەنە'یە بۆچی؟. ئەویش 'بەطرەنە'ی لە جێی 'حەسقەلە' گوت[*]. ئەوانە ڕوویان دەدا و کەس لە هەولێر نەبوو دەنگی نارەزایی بەرز بکاتەوە بۆ ئەو ڕێگا وێرانەی کۆیەی بە هەولێرەوە دەبەست و نەدەبەست. ئەوەش بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی دێنمە بەر باس کە کەس هەست بە بەڵای خەڵکی تر ناکا: وەزیرێکی کوردی خەڵکی سلێمانی بووە جێگری وەزیری بەرگری و ڕاپۆرتێکی بۆ بەڕێوەبەرایەتی 'حەرەکات' یا شوێنێکی تر ناردبوو تیایدا گوتبووی کردنەوەی ڕێگای ڕانیە ـ کۆیە بۆ نەوتی کەرکووک دەبێتە جێی مەترسی. ئیدی کۆیە تا ساڵی 1953 لە ڕانیە و قەڵادزێ دابڕابوو. کاتێ من بووم بە ئەندامی پەرلەمان و ڕێککەوت لەگەڵ خوالێخۆشبوو نووری پاشادا دیدارم هەبوو، ئاماژەم بۆ ئەو باسە کرد و گوتم: جەنابی پاشا، بۆ ستراتیجستی عیراقی شەرمەزارییە وا مەزەندە بکا قیرتاوکردنی چل کیلۆمەتری نێوان ڕانیە و کۆیە،کە نیوەی خۆبەخۆ ئامادەیە دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر کەرکووک لە کاتێکدا نەخوێندەواریش دەزانێ ئەگەر ڕووسیا هێرش بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بێنێ دەمێکی مەقاشەکەی دەچێتە کەنداوی ئەسکەندەرۆنە و دەمەکەی تری دەچێتە کەنداوی بەسرا... یەکسەر فەرمانی کردنەوەی ڕێگاکەی دەرکرد.

ئەو دەمەی لە کۆڕی زانیاری کورد بووم لە بەغدا، داوەتنامەیەکم بۆ هات بۆ بەشداربوون لە کۆڕێکی ئەدەبی لە سلێمانی مەرجی نووسینیش ئەوە بوو جیا لە هەموو زاراوەکان، دەبێ تەنها بە زاراوەی سلێمانی بێ.

---

[*] 'حسقلە' واتە حسقێلایەتی، واتە جوولەکایەتی. ئەوەش قرچۆکی و ڕەزیلیی دەگەیەنێ. 'بەطرەنە'ش لە 'بطران'ەوە هاتووە، واتە گوێنەدان و بێباکی.

ئەوە و زۆر شتی تری هەمەچەشنەی بواری ڕۆشنبیری و زمانی و (چی)یی هەستیاری دەستکرد و نا دەستکرد زەق دەکەنەوە [واتە لە مندالّدانی نەفامی] لێرە و لەوێ کەوتوونەتەوە و هەمووشمان دەزانین بوونمان لە مەترسیدایە.. دوو بەش لە پێنج بەشی ڕووبەری کوردستان لە دانیشتوانی کورد چۆڵ کراوە و ئەوی تریش بەڕێوەیە.. زۆر جوانە دانیشتوانی شارێک یا ناوچەیەک هەوڵ بدەن بارودۆخیان باشتر بکەن و هونەر و ڕۆشنبیری و بیناسازی تا ئەوپەڕی ببووژێننەوە، بەڵام لە سەر حیساب و لە ڕووی حەسوودی کەسانی ترەوە نەبێ کە مافی پێشخستنی بوارەکانیان هەیە. هەموومان دەزانین هەموو کوردستانی گەورە، نەک هەر عەبابەیلێ و سەنگەسەر، بە دەست ج دواکەوتوویەکەوە دەناڵێنێ. ئەو نموونانە لەوەدا خزمەتی ڕۆشنبیری کورد دەکەن کە چاو و دەماغی بەرەو واقعی کورد بکاتەوە کە هەمووی کارەسات و کەمایەتی و کڵۆڵییە: فەرەنسا و بەریتانیا جادەیەک بە بن تەنگەی دۆڤەردا بە یەکیانەوە دەبەستێ کەچی وەزیرێکی کورد بە بیانووی نەوتی کەرکووکەوە، فێڵ لە کۆیە دەکا تا بە ڕانیە نەبەسترێتەوە. ئەو قەومە چەند کڵۆڵە وەزیرەکەی خیانەت لە ئەمانەت دەکا و فێڵ و پێچوپەنا دەدۆزێتەوە!! نازانم بۆچی پێشنیازی نەکرد قیرتاوی نێوان کەرکووک و سلێمانی تێکبدرێ، کە شاخی هەیبە سوڵتانی لە سەر نییە و زێی بچووکی پێدا ناڕوا و مەترسییەکەی زیاترە. نە مەترسی لە ئارادایە و نە هیچ، بەڵام نەفسی فەرمانڕەوا و ویژدانی وێران و لەعنەتی ڕێ بۆ گوناهە گەورەکان خۆش دەکەن. ئەوە دەڵێم و سلێمانی بە دڵی کوردستان و دەماری هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی و قوربانیدان دەزانم و منیش وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵێم:

مەربووطە حەیاتم بە سلێمانی و خاکی

خۆشم دەوێ و بە لامەوە پیرۆزە و شانازی پێوە دەکەم، لە پێناوی خۆی و کوردستاندا بە گشتی و لەبەر ئەوەشی شانازیم بە سەروەرییەکانی و پیرۆزییەکانی و پاشاکانی بابانی و مەولانا خالیدی و کاکەحمەدی شێخی، بە خوێنمدا دێ و دەچێ و شانازی بە بەرەڵاکانی کۆڵانەکانیشیەوە دەکەم کە تایبەتمەندی خۆیان هەیە و فشەیان بە دنیا دێ و من بەخۆم گوێم لە یەکێکیان بووە لە ئاوفرۆشتنی هاویندا بانگی کردووە: بە عانەیەک سکت پڕ کە! پڕکردن لێرەدا ئاوسبوونیش دەگەیەنێ و بە پێنج فلووس[**] هەناوی خەڵک فێنک دەکاتەوە و بزەش دەخاتە سەر لێویان.

بە بێ سلێمانی، کوردستان لە سەر یەک لاق دەشەلێ و کوردستان بە یەک چاو دەڕوانێ و کوردستان بە کەللەسەرێکی نیوەبەتاڵ تێدەفکرێ.

---

[**] مامۆستا مەسعوود محەمەد (5) فلووسی نووسیوە بەڵام عانە 4 فلووس بوو، نەک پێنج.

ئەگەر دوای ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەی کورد بکەویت، کە 2550 ساڵە بە هۆی بێدەوڵەتییەوە لەتوپەت بووە و کیانێکی نەبووە پارچەکانی گرد بکاتەوە و دەست بخاتە پێش تەماحکاران و بەری ڕەنج بۆ ڕۆژی ڕەش یا قاتوقڕی بکاتە زەخیرەی لیکۆڵینەوە دەبینی ئەو خەڵکە سەرگەرمی شتگەلێکی بێسوودن و جگە لەپێداویستی خۆراک و فڕەدانی زبڵ و شۆردنی ئەوەی دەبێ بشۆرێ، کە هەموویان پێویستین، سێ کەس یا دوو کەس نابینی بۆ بیرکردنەوە لە چارەنووس دانیشتبن. نموونەیەک دێنمەوە و ڕەنگە لە ڕاکێشانی سەرنجت سەرکەوتووش نەبم: لە ئێزگەی ڕادیۆ بەر گوێت دەکەوێ و لە تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامەوە بەر چاوت دەکەوێ کە بابەتێکی ئەوپەری گرنگ ئێران و تورکیا و سووریا و عیراقی سەرقاڵ کردووە ئەوەش چۆنیەتی ڕێکەوتنە لە سەر ئاوی ڕووبارەکانی نێوانیان بۆ ئاودان و خواردنەوە و شتی تری بە سوود یا بەزیان. ئەو ئاوانە، لە سەدا نەوەتیان ئاوی کوردین و لە سەدا سەد لە کورد قەدەغەیە ڕای هەبێ یا نەبێ.. من بە ئیمان سوێند دەخۆم کە دوو لایەنی دژ بەیەکی کورد لە خەباتی نەتەوایەتیدا، هەر لایەنێکیان پێی ناخۆشە لایەنەکەی تر دەنگی لە بابەتەکەدا هەبێ ئەگەر خۆی بەشێکی تێدا نەبێ و بەچارەنووسی ئاوی کورد تووڕەش نابێ، بگرە گوێشی ناداتێ مادام هەمووی بە ئارەزووی بێگانەیە و بۆ کورد ئەوەندە بەسە بۆ پەڕینەوە کەڵەکی لە سەر بەکار بێنێ...

وا ڕێگەتان دەبەسرێ عێلاتی جاف و بڵباس
گەر مردوون لە گەرمیان مەمنووعە بچنە کوێستان
حاجی قادر

جاف و بڵباس، بە دوای لەوەڕگەدا بۆ مەڕ و ماڵات، بە هاوینان لە ناو شاخەکاندا هاموشۆیان دەکرد و زستانانیش لە پێدەشتەکاندا بوون و قسەی حاجی قادر لە سەر ڕووداوەکان هاتە دی..! بەیتی تری هەیە تیایاندا پێشبینی ئەوە دەکا کە ڕۆژێ دێ قسەکانی دێنە دی و خەڵک لە ناو خۆیاندا دەڵێن: حاجی چەند ڕاستی کرد! هەرچی گوت وەک کەرامات هاتە دی! ڕەحمەتت لێ بێ! نازانم دوای تێپەڕبوونی یەک سەدە و یەک ساڵ بە سەر مردنتدا بۆت بگریم؟ یا چی بڵێم و چۆنی بڵێم و باسی چی بکەم؟ هەموو کوردێک برینێک یا لە دڵیدایە یا لە ئاواتەکانیدا یا لە کەرامەتیدا یا لە دەربەدەری و خوێنی بەفیڕۆچووی خۆی و خوشک و برای و منداڵیدا هەیە، ئەوانە نەبێ فرسەتی ئەوەیان قۆستەوە پارە و سامان کۆ بکەنەوە و شایانی نەفرەتی ئەووەڵ و ئاخیرن و هەژارانیش ئەوەندەی تر بێبەش و حەسرەتبارن!!

ئەو ڕووبەرەی چەند دێڕی پێشتر بەشێکی بنەڕەتیی شێتخانەی سەرزەمینە ئازیزەکەمانە. هەندێ جار بۆچوونی وام بۆ دێ کە زەرەری نییە و خەسڵەتی مەحاڵیشی تێدا نییە، بەڵکو بەسوود و مومکینیشە ئەگەر لە پراکتیکدا جێبەجێ بکرێ دەبێتە بەشدارییەک لە لاکەوتنی ئەرکی گەورە لەسەر شانی ئەوانی خستوویانەتە ئەستۆی خۆیان و لە سەرهێشە، لەگەڵ خەڵکە نێزیکەکان و نانێزیکەکاندا لە کێشە دووریان دەخاتەوە و فرسەتی پشوودانی دوور لە ململانێیان دەداتێ: دەبێ چ بەربەستێک لەوەدا هەبێ پیاو زمانی خۆی بگرێ و (س) زامدار نەکا کە سوودیشی بۆ ئەو کەسە تێدا نییە کە دەیڵێ، با ڕاستیش بێ، ئەگەر هەڵبەستراویش بێ دەبێتە شایەد بۆ نەفامی و دوژمنایەتی هەڵبەستراو؟ حیکمەت لە قسەیەکدا چییە بەرژەوەندی تێدا نەبێ و چاوەڕوانیش بکرێ لە لایەن بەرانبەرەوە لەوە خراپتر بگوترێ ولە زۆربەی کاتدا خراپتریش دەگوترێ و دەستپێکەریش زوڵمی کردووە. حیکمەت لەوەدا چییە قسەی (ک) کە دژی (ج)ە بگەیەنیت؟ بۆ کەرامەتی مرۆڤ باشتر نییە نەسیحەتی (ک) بکەیت فیتنەیی نەکات و بە جۆرێ بدوێ تەحەددای تێدا نەبێ؟ حیکمەت لەوەدا چییە بەربەست بخەیتە بەر ئاوی جۆگایەک کە زەرعات ئاو دەدا، تا ئاواکە بە فیڕۆ بڕوا و نۆرە ئاودێری تێپەڕێ و هەتا چەند ڕۆژی تر نەیاتەوە ئەوجا لایەنیکی گرنگی زەرعاتەکە بفەوتێ. منداڵانی گەڕەک هەموو ڕۆژانی پشوو بە تۆپێن لە ئەرزەیەکی بێبینادا بەسەر دەبەن و هەندێ جار تۆپەکەیان دەکەوێتە ماڵە دراوسێوە و ئەوە دووپات دەبێتەوە تا خاوەن ماڵەکە وەڕس دەبێ لەوەی تۆپەکەیان بۆ هەواداتەوە. ئەگەر تەمبەڵی بکا پەنجەرەکانی بەر بەرد دەدرێن... یەک پەنجەرەی بێ پارێزگاریم نەدی نەشکابێ.. لە فەرمانبەری دەسەڵاتدار پاڕامەوە خۆڵیکی زۆریان هێنا و لەو زەوییە بەتاڵەی تەنیشتم هەڵیانڕشت، ئەوجا منداڵەکان، بە پێی پێویست، لەشکری خۆیان گواستەوە بۆ جێیەکی تر. خاوەن زەماوەندێک بەرتیلی دایە بەرپرسێکی کارەبا و گەڕەکێکی بە تەواوەتی، بۆ ماوەی چەندین سەعات تاریک کرد تا زاوا بتوانێ شەو دۆستەکانی خۆی داوەتی خواردنەوەی پەرداخی زیوین بکا... لە هەموو کون و قوژبنیکی وڵاتە خۆشەویستەکەماندا کەلێن و کەلەبەر دەبینی تا لێیانەوە بتوانی بەرتیل و خەڵوەت و جیلوە و خراپەکاری هونەرەکانی شەیتان ئەنجام بدەیت. ڕێبوارانی ناو عیراق، بە ناوچە کوردییەکانیشەوە، لە خاڵی پشکنیندا زوخاو دەچێژن. ئەو مەودایەی نێوان کەرکووک و هەولێر کە لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتدایە، هەشت ـ نۆ خاڵی پشکنینی لێ هەن و لە هەر یەکێکیاندا جەردەیی زەمینی لە دژی شوفێرەکان هەیە و جوانترین دیمەن کە دیتم ئافرەتێک تەکلیف کرابوو ژنان بپشکنێ و بە ئارەزووی خۆی بەرتیلی قوماش و پارە و خشڵی دەپچڕییەوە و ئەوەشی تێدا جوان بوو ئەوە بوو وەک گورگ دەستکەوتەکانی دپچڕییەوە و تەماشای ڕوخساری نێچیرەکانیشی نەدەکرد. وەک ڕستەیەکی بەرپەرچ دەڵێم: سوپای ئیسلام لە سەرەتای فەتحەکاندا دەرفەتی ئەوەی هەبوو هەر شتێ لەو شوێنەدا بکا کە جێی جەنگ بوو و جەنگ پێی دەویست. نەهاوەندی بە جەنگ گرت و

هـیچ شـەڕکەرێک دەربـاز نـەبوو و ژنـەکانیش بـە منداڵەکانیانـەوە بوونـە "سـەبایا" و بـردران و شارەکەش وێـران کـرا و دواییش ئـەبوو لوئلوئـە لـە تۆڵـەی نهاوەنـد عومـەری خەلیفـەی کوشـت، چونکە ئەبوو لوئلوئە خەڵکی ئەوێ بوو. ڕیوایەتی شکاتکردنی ئەبو لوئلوئەش لە خاوەنەکەی خۆی (ئەبوو لوئلوئە کۆیلە بوو) لای عومەری خەلیفە و گوێنەدانی خەلیفە بە شکاتەکە گوایـە لـە سـەر ئەوە کوشتبێتی، چ بنەمایەکی ڕاستی نییە، چونکە ئەبوو لوئلوئە دیتوانی خاوەنەکەی خـۆی بکـوژێ، کـە ئاسـانتریش بـوو، نـەک خەلیفـە. فـەتحی نهاوەنـد کـە لـە مێـژووی ئیسـلامدا نـاونرا فـەتحی فەتحەکان و لە شەڕی مەدائین بەرزتر بوو کە ئەمەیان پایتەختی ئیمراتۆریەتی فارسـەکانیش بـوو و تاقی کیسرای تێدا بـوو کـە ئێسـتاش لـە خـوارووی بەغـدادا ماوەتـەوە. ئـەم هەڵکەوتـە دەخـوازێ لایەنێکی توندوتیژیی شەڕی هەڵگەڕاوەکان باس بکەین کە دوای وەفـاتی پێغەمبـەر ڕوویدا،کە لـە دژی عارەب بوو نـەک فارسـەکان یـا قـەومێکی تـری ناعـارەب. چیرۆکی بیانووی خالیـدی کوڕی وەلید لە لە مالکی کوڕی نوەیرە بە تۆمەتی هـەڵگەڕانـەوە ئـەوەش بـە هـۆی دواکـەوتنی زەکاتـدانی، بەناوبانگە. ژنەکەی مالیک بە جوانییەکەی ناوبانگی هـەبوو و کاتێ مێردەکـەیان بـە تۆمـەتی کوفر بەرەو مردن برد، ئاوڕی لە ژنەکەی دایەوە و گوتی: تۆ هۆکاری کوشتنی منی.. من زەکاتم داوە و هەڵنەگەڕاومەتەوە، بەڵام خالید نیازێکی بە تـۆ هەیـە. دوای بەسـەرچوونی عـوددەی ژنەکـە، خالیـد خواستی. عومەری کوڕی خەتاب پێشنیازی ڕەجمکردنی خالیدی بۆ ئەبوو بەکر کرد لە سەر زینـا، چونکـە ژنـی هـەبوو. خەلیفـە گـوتی: ئیجتیهـادی کـردووە و هەڵـەی کـردووە. عومـەر گـوتی: لـە سەرکردایەتی سوپا لایبەرە. ئەبوو بەکر عوزری خواست و گوتی: خالید شمشێرێکە و پێغەمبـەری خوا هەڵیکێشاوە و نایخەمەوە کێلان. دوایی کە عومەر بووە خەلیفە، لـە شـەڕی دژی ڕۆم خالیـدی لە سەرلەشکریی موسوڵمانان لابـرد. نـاوی خالیـد وا ڕۆیشـتبوو کـە چووبێتـە هـەر شـەڕێکەوە بـراوە بووە. ئەوەش لە هەموو ڕوویەکەوە ڕاستە. یەکێ لەوانەی بە موعجیزەکانی جەنگ دادەندرێ ئـەوە بوو خالید بە هەندێ لە سوپاکەیەوە بە دەنگی لەشکری موسوڵمانانەوە چوو لـە سووریا و لـە دژی ڕۆم و بڕینی ئەو ڕێیە دوور و درێژە شتێکە بە عەقڵەوە ناچێ..

ئەو وێنەیە لە مێژووی ئیسلامدا، تا ڕادەیەک، ڕەنگدانەوەی دیمەنێکی ئەو ناوەیە کە لە سـەرەتای ئەم نووسینەدا باسمان کرد و لە سـەرەتاکانی فەتحەکانـدا قسـەیەک بـڵاو ببـۆوە دەیـانگوت: ئەمـە یەکەم گۆزە نییە لە ئیسلامدا شکابێ. ئەگەر بۆ خوێنەری ئەم کتێبە هەڵکەوێ بزانێ چ دابـڕان و لەتوپـەتبوون و تـەکفیرکردنی ئـەم و ئـەو و شـەڕی قڕکـردن [دژی ئەمەوییـەکانی ڕۆژهـەڵات و شوێنانی تـری وڵاتـی موسوڵمانان ڕوویـداوە ـ ئـەبوو موسـلمی خوراسـانی لـە دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عەباسیدا یارمەتیدەر بوو کە جێگیریش بوو کوشتیان] ڕوویـان داوە سـەری سوڕدەمێنێ تـا ئـەوەی ئیسلام بووە حەفتاو دوو دەستەوە و لە بارەی ئەوەشەوە گوتوویانە پێغەمبەر ئەو دابەشبوونەی کە

لە پاشەڕۆژدا ڕوویانداوە، بە چاک لەقەڵەم داوە و گوتوویەتی: جیاوازیی ئەممەتەکەم ڕەحمەتە، واتە حەفتاودوو دەرگا لە بەهەشت دەکرێنەوە تا پێیاندا بە ژوورکەون. لە سەر ئەو بنەمایە یەکریزی موسوڵمانان دەبێتە بارگرانی و خراپە.. وای لە گەمەی شێتبوونی عەقڵ و ئەو قەومە چەند حەساوەن کە خوێنیان بە دەستی برای ئاینی خۆیان دەڕژێ!! ئایە بۆ موسوڵمانان سوودمەندتر و جوانتر و هێمنتر نەدەبوو بە بێ شەڕ و کێشە لە یەک دەرگاوە بچنە بەهەشت؟ ئەی ئەگەر بە یەک جۆر نوێژیان بکردایە ئابڕووچوون بوو؟ شەڕکردن لە سەر ئەوەی قولەپێ بەر دەستنوێژ دەکەوێ یان نا، چ شانازییەکی تێدا هەیە؟

هەموو ئەو کێشانەی خاوەن پەیام لە ئایندا ناویانەتەوە بەرزن و ئاوانەش کە توێکڵ و وڕێنەن بۆمان بوونەتە کەلەپووری پیرۆز و خۆشەویست ئەگەرچی هۆی یەکەمایەتی ئەوە نازانین کە دووی کەوتووین لەگەڵ موسوڵمانانی تردا لە سەری دەچینە شەڕەقسەوە و هەمووشیان موسوڵمانن و هەموویان دڵسۆزن و هیچیشیان هیچ شتێ لە سەرچاوەی جیاوازییەکانی ئیجتیهاد نازانن و نازانن موجتەهیدەکان جیاوازییان چۆن بووە: ژمارەیەکی کەمی هەڵکەوتووانی دین دەزانن چ دەڵێن و ژمارەیەکی یەکجار زۆریش لەو ناودارانە لە سەر بۆچوونی خۆیان سوورن و ئەگەر بیانەوێ تیروپشک لە سەر ڕاستبوونی یەکێ لەو حەفتاودوو دەستەیە دەکەن و ئەگەر زاری تاوڵەکە دووشەش بوو، قولەپێ بەر دەستنوێژ دەکەوێ و سەرکەوتن بۆ خۆی دەبێ... ئیتر هەموو نەگونجانێک کە خەڵک دەکاتە دەستە و تاخمەوە، ئاوهایە! چارەسەرێکی چەند ئاسانە! با باوەڕ بکەین کێشەی هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ئێستاش ماوە و سبەینێش بە گورج و گۆڵی و زندوویی دەمێنێ تا دەیان هێلکە هەڵبێنێ جووجگی دەمەتەقێ و موجامەلەی شەڕەشیر و بۆمبا و بەخائینکردنیان لێ دەرچێ و هەر لە کۆنیشەوە بەشێ بووە لە جیهانە شێتەکەمان و نەخۆشخانە نەخۆشەکەمان: تالیبان و شامەسعوود، خوا بیانپارێزێ، دەماری ئیسلامیان بۆ ئەوە بزواند (کەڕ و فەڕ)ی کوشتن و وێرانکردن و ڕازیکردنی دوژمنی دۆست هەمەجۆر بکەن تا چەکی کوشتنی موسولامانیان پێشکەش بکەن و پێم وایە چارەسەری زیادبوونی دانیشتوانیان لە جەنگدا دۆزییەوە نەک ژمارەی ئەو هێلکانەی کە زندووەکان بەیانیان دەیانخۆن کەم بێتەوە و ئیسلام کەرامەتی بڕووشێ چونکە ڕاست نییە لەندەن و مۆسکۆ و پاریس بەیانیان هێلکە بخۆن و ئابڕوومان بچێ!!

ئەی ئەوانەی بە ناخی نەخۆشی غەفڵەت و شێتی و تاواندا ڕۆچوون واز لە عەبدەکانی خوا بێنن و بۆ بێعەقڵی و ڕووکەشی و ساکاری خۆیان لێیانگەڕێن و بۆ ئەوان وا باشترە بە ئاسوودەیی بمرن نەک وەک تاوانبار بکوژرێن یا وەک حەیوان سەربڕدرێن و گۆشتیشیان بە خەسار بچێ و گۆشتخۆرەکان نەیخۆن! لەم و لەو دەبیستم کە شامەسعوود و تالیبان بەکرێگیراوی بێگانەن جا با

ئەو بێگانەیە ڕووسییەکی ناموسوڵمان بێ یا شیوعییەکی نامەسیحی بێ یا پاکستانی... ئێرانی... ئەمەریکایی... شەیتانی... ئیبلیسی بنەبانی دۆزەخ بێ، من سوێند دەخۆم ئەو دوو سەرکردەیە هی ئەوەن شێتوشەیدای ئەو پڕوپووچانە بن کە بوونی مەعنەوییانی پڕ کردۆتەوە، جێی یەک دۆلاری ئەمەریکی و ڕۆبڵی ڕووسی و ڕوپیی پاکستانی و تمەنی ئێرانییان نەماوە چونکە ئەو مرۆڤەی نوقمی شتی پڕوپووچی وەک ڕایسز یا تۆپین بێ دەست لە هەموو کێشەکانی دنیا بەردەدا تا چاو و هەستی بە قامچی سوارە و شەقی هونەری پێی ڕاهێندراوێک تێربکا.. تەنانەت خوێندوومەتەوە زۆر کەس لەوانەی مەراقیان شەترەنجە لە دووریی هەزاران کیلۆمەترەوە گوێ بۆ تەقەی بزاوتنی عەسکەرێک یا ئەسپێک یا وەزیر شل دەکەن و بە تەختەی شەترەنجی بەردەمیانەوە بە شێوەی گەمەی یاریزانەکانەوە وابەستە دەبن تا لێکچوونی بەردەوام لە نێوان تەختەکەی خۆیان و دوو یاریکەرەکە هەبێ... پێنج ملیۆن بەشەر دوای جەنازەی ژنێک کەوت هەموو حیکمەتەکەی ئەوە بوو لەگەڵ مێردەکەیدا نەدەگونجا و پەیوەندی بە پیاوێکی ترەوە هەبوو و لادانی مێردەکەی لەوەدا یارمەتیدەری بوو بۆ ئەوەی دۆستێکی تر یا مێردێکی تر هەڵبژێرێ و حیسابی کەرامەتی منداڵانی ئەو دوو هاوسەرە و ناوزڕانی خێزانیش بکە.

واز لەوانە دێنم کە پەیوەندییان بە دوو هاوسەرەکەوە هەیە و لەو پێنج ملیۆن کەسە دەپرسم کە مەودای مەیلەو فەلەکییان بڕی تا یەک چرکە ـ خوا کوێریان بکا ـ دیمەنێک ببینن، ئەوانە کێشەیەکی مرۆڤایەتی پێکدەهێنن و هیچیان ئامادە نین دە پاوەند بە هەژارێک بدەن بەڵام سەروەتێک بۆ ئەوە سەرف دەکەن ماڵاوایی لە تەرمی ژنی میری بەریتانیا بکەن خوا سیمایان بشێوێنێ! کەواتە دەبینم ئارەزوویەکی شێتانەی لەناوبردنی نەیار پاڵنەری شامەسعوود و تالیبانە و ئەوانیش وەک شێتی (کش مات) و (ڕێست) و (قامچی سوارە) وان. لە سلێمانی کەسیکی زەبەلاحیان دیتبوو وەک چۆن عاشق ئامێز بە ئەویینداری خۆیدا دەکا، ئاوها بە شەوان ئامێزی بە عەموودی کارەبادا دەکرد و هەوەسی خۆی پێی دادەمرکاندەوە.. ئەوەی ئەو هەوەسبازە کردوویەتی لەتەپڵی سەری ئەوانە شەریفترە کە بە بێ هۆ گەمە بە سەری خەڵکی دەکەن و لەوەش گەرێ ئەگەر دژی بەرژەوەندی بەرزی سەرجەمی نەتەوەیەک بێ.. شاعیرێکی فارس دەڵێ:

راستی موجب رضای خوداست<br>
کس ندیدم که گم شود از راه راست

واتە:<br>
ڕاستگۆیی ڕەزامەندی خوای لە دوایە

کەسم نەدی لە سەر ڕێ ڕاست بزر بێ

ئەگەر بمتوانیبا بروسکەیەکم بۆ ڕۆحی ئەو شاعیرە دەنارد و دەمگوت خەیاڵە بەرزەکەی لەواقعێکی پێچەوانەی ئەو ڕێیە نیشتۆتەوە،کە ڕۆحە پاکژەکەی پیشانی داوە... نوکتەیەکی ڕۆحسووکم بیر کەوتەوە دەڵێ کیژێک کراسێکی لە پیشانگایەک هەڵبژارد و بە ئامادەبوونی کیژێکی کرێکاری ئەوێ، هەر لەوێ تاقی کردەوە. کرێکارەکە لێی پرسی: بە بەرت تەسک نییە؟ گوتی: نا. بە ئاسانی تیایدا دەبزوێی؟ گوتی بەڵێ... هەناسەت سوار ناکا؟ گوتی نا... کرێکارەکە گوتی: کەوابێ دایکەنە تا یەکێکی تەسکترت بۆ بێنم!! دەسەڵاتدارانی جیهانی سێیەم زۆربەی هەرە زۆری جار مەسەلە و خواست و ئاشتی و جەنگ بە پێوانەگەلێک دەدوورن کە باوێشک و هەناسەدان زەحمەت دەکا، ڕەنگە هۆیەکەش ئەوە بێ سەرگەرمی شتی ناباوی خەڵکن، وەک پێشوازیکردن لەمێوان لەگەڵ تەقەکردندا، بەڵام سوپاس بۆ خوا تەقەکان کەس ناکوژن.

مەسیحیەکانیش لە کێشە دینییەکاندا وەک موسوڵمانن و مێژوویان پڕە لەخوێن و ئاگر و وێرانی و قەشەکانیان لاملترین کەس بوون لە دژی زانست و تەنانەت خڕیی گۆی زەویشیان ڕەت دەکردەوە و کۆلۆمبسیشیان ڕیسوا دەکرد کە ویستی بە دەوری زەویدا بسوورێتەوە ئەوەش بەوەی بەرەو ڕۆژاوا بچێ و لە ڕۆژهەڵاتەوە بگەڕێتەوە(22).. زانا موسوڵمانەکان نەیاندەویست دەسەڵات بگرنە دەست لە کاتێکدا پاپاکان دەسەڵاتی دنیایی و دینییان هەبوو و دەیانتوانی پاشاکان لە دەسەڵات بێبەش بکەن. کاری کەهنووتە مەسیحەکان گەیشتە ئەوەی بەهەشت بە پارە بفرۆشن.. بە داخێکی گرانەوە دەڵێم ئەو کات و توانایەم نییە هەموو لایەنەکانی بەشەر بەسەر بکەمەوە و ئەوە ساڵانێکی زۆری دەوێ و تەنانەت خەریکبوون بە بەشەرە ناشارستانیەکانەوە، وەک ئەسکیمۆ و هندییە سوورەکان و هی تری دوورگەکانی ئۆقیانووسەکان دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئوستراليا و بیکمیز و هوتنتووت لە ئەفریقیا و باسێکی سەربەخۆی چڕوپڕی دەوێ و ئەوپەڕی توانام ئەوەیە بیانخەمە بەشێکەوە بەڵام دەشێ بارودۆخیان بە یەکەوە بۆ ئەوانە پێوانە بکرێ لە جیهانەکەماندا نەشارەزان (ئەوەی دەکەوێتە نێوان جیهانی شارستانی و ئەو سەرەتاییانەوە لەگەڵ ئەو سەرنجەدا کە ئەوانیش هاتوونەتە ناو جیهانی سێیەمەوە لەگەڵ ئەو خڵتوخاشەی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر لەگەڵ خۆیاندا دەیگوازنەوە).

ئەگەرچی خستنەڕووی بارودۆخی باوی دنیا لە ڕووی پێشکەوتن و دواکەوتنەوە زۆر زەحمەتە و لە مەسەلە مومکینە هەرە قورسەکانە و تێرکردنی لە بواری لێکۆڵینەوە وەک مەحاڵ وایە بە تایبەتی بۆ کەسێکی وەک من کە مەودای بزاوتن و سەرچاوەی پێویستم سنووردارن و هاوکاریم بۆ

ئاسانکردنی ئەو کێشانە نییە کە دێنە بەردەم نووسین و ڕاستکردنەوەی هەڵە، منیش بە توانای سنووردارمەوە مەگەر بە دەگمەن دەنا ناتوانم ئەوانە پاکنووس بکەم کە پێیان دەگوترێ ڕەشنووس و بیانکەمە یەک نوسخە و ئەگەر یەک پەڕەیان لێ بفەوتێ دەبێ لە توێی فکرەوە زندوو بکرێتەوە.. جگە لەوەش من لەو چەند ڕۆژەی دادێ دەچمە ناو هەشتا ساڵییەوە ئەگەر چەند ڕۆژ یا چەند هەفتە لەمەپێش نەچووبێتمە ناو هەشتاوە. ئێستا لە 14 / 10 / 1998 دام، شاعیری عارەبی جاهیلی زوهێری کوڕی ئەبوسەلما گلەیی کرد و گوتی:

تەکلیفی ژیان بێزاری کردم هەر کەسێ
هەشتا ساڵ بژێ بابی نییە خەمی بخوا

بەڵام من لە ژیان بێزار نیم و هەستم خاو نییە. من باسی لایەنە کەموکوڕییەکانی حاڵی خۆم، بەوپەڕی وردیی دەکەم و بە قەدەر داوە موویەک جیاوازی لە نێوان ئێستای تەمەنم و ڕابردوویدا نابینم و نە ناخم ئارامە و هەنگاوم لە ڕۆیشتندا، لە سەرکەوتن و دابەزیندا پتەون و ئارەزووی خواردن و جلپۆشین و کاتی خەوم لە کاتی بە دوای یەکی خۆیاندایە... کەمیی گرنگیدانم بە سەروەت و سامان چۆن بوو ئێستاش وایە... جێی ئەوەیە بەیتێکی شاعیرێکی عارەب لێرەدابهێنمەوە، پێم وابێ هی سەردەمی عەبباسییەکانە، کە ئارەزووەکانی لە حەوت (کاف)دا کۆکردوونەتەوە:

| | |
|---|---|
| کن و کیس و کانون و کأس طلا | مع الکباب و ک.. ناعم و کیساء! |
| پۆشاک و کیسە و سوکنا و پێکێ | لەگەڵ کەباب و ک..ی ناسک |

لە وشەکانی ئەو بەیتەدا دەردەکەوێ کە گرنگیدانی بە (کیسە) بۆ ئەوەیە شەشەکەی تری دەست بکەون. کانوونیش دوو ئامانج دەپێکێ: خۆراک و وەرزی زستان. وەک لە بیرم بێ ئەو بەیتە بە (کافەکانی زستان) ناوی دەرکردووە. لە قورئاندا هاتووە: "الشعراء یتبعهم الغاوون، الم تر انهم في کل واد یهیمون و یقولون مالا یفعلون". نوکتەش لە سەر ڕێزمانزانەکان زۆر و خۆشن و خۆشترینیان ئەوەیە دەڵێ شەوێکیان ڕێزمانزانێک بانگی غوڵامەکەی کرد و گوتی: "هل سقعت العتاریف؟" غوڵامەکەی وەڵامی دایەوە: "مولاي حبظلم". ئەویش گوتی: "نەگبەت، حبظلم چییە؟!" غوڵامەکە وەڵامی دایەوە: "ئەدی سقعت العتاریف چییە؟". گوتی: "مەبەستم ئەوەیە ئاخۆ کەڵەشێر بانگی داوە؟" ئەویش گوتی: "منیش مەبەستم ئەوەیە هێشتا بانگی نەداوە". من، خوێنەری هێژا، ماوەی ساڵێک زیاترە بارودۆخی ژیانم باشە ئەگەرچی زۆر زۆر حەیفم لە کوردستان دێ، ئەوەش هەر لەبەر ڕووداوەکانی بارودۆخی خەباتی سیاسی کورد نییە بەڵکو ئەوەیە کە ڕێگای سەرکەوتن

و بە ئامانج گەیشتن دەیان جار لە ململانێ و بەربەرەکانی ڕوونتر و سەلامەتتر و ئاسوودەترە. فرسەتی ئاسوودەیی و دەوڵەمەندبوون و بیناسازی ئەمڕۆ [14 /10 / 1998] لە هەر وڵاتێکدا باوەڕی بە ئاشتی و تەبایی و بەرەکەتی شارستانی هەبێ زۆر و بەپیتە. من خەمی لەدەستچوونی مومکینەکانم کە لەوە سووکترن نەتەوە لە دەست بچێ و هەموو ڕۆژێک دەرفەت نارەخسێ و کارەسات هەموو جارێ بە نیوەمردن نابڕێتەوە.. کە ناونیشانی شێتخانەم هەڵبژارد بۆ ئەوە بوو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە گشتی بە شێتخانە دەچێ نەک هۆیەکی تایبەتی کە شانی بوونی کورد بگرێتەوە: بۆ لایەنی گشتگریی (شێتخانە)ش ئەوەندە بەسە ئەو دەوڵەتانەی لە ڕووی زانستی و تەکنیک و پیشەسازی و سامانەوە پێشکەوتوون، لە سیاسەتی ناوخۆ و نێودەوڵەتیدا وەک هەرزەکار ڕەفتار دەکەن [ئەمەریکای دایکی گوناهە گەورەکانی سیاسەت: ئابڕووچوونی ڤێتنام.. دەستوەردان لە ئێران... شەڕی دوورگەی بەرازەکان... ڕەفتاری هارانەی سیاسەتمەدارە گەورەکان لە حیزبایەتی و سێکسدا. کتێبێکم هەیە 1100 لاپەڕەیە و لە سەر شێوەی ڕۆمانە و ناوی ( Harolt´s Ghost)ە هی نووسەرێکی ئەمەریکاییە بەناوی (نۆرمان میللەر)ەوە لە سەر کەسە سەرەکییەکانە و هەموویان بەرپرسی گەورەی ئەمەریکا بوونە لە سەرۆکی کۆمارەوە بگرە و بە کۆنگرێس و پەرلەماندا وەرە تا پەراوێزی دائیرە بەرزەکان.. نووسەرەکەی دەیسەلمێنێ کە مارلین مۆنرۆ خۆی نەکوشتووە بەڵکو بە هۆی ئەو ململانێیەوە کە لە سەری هەبوو کوژراوە.. [یا بە هۆیەکەوە کە من سەرنجم نەچۆتە سەری] پشکنینی پزیشکی سەلماندوویەتی کە گەدەی بەتاڵ بووە بەڵام خوێنی دەرمانی تێدابووە و بۆتە هۆی مردنی. یەکێ لەوانەی ململانێی لە سەری هەبوو سەرۆک کەنەدی بوو، کە دوای ماوەیەک لە شاری (Dallas) کوژرا و ئەوەش نموونەیەک بوو لە ڕەفتاری خاوەن سامان و دەسەڵات لەو وڵاتەدا.

بەڵام لایەنی بوونی کورد وای دەویست لە بری قەڵەم تیغ بەکار بهێندرێ چونکە لە رادە بەدەر هەڵە و دەستدرێژی بۆ سەر خەڵک بە گشتی پشتگوێ خراوە و ڕەوایەتی بە شەڕی تواندنەوە لە دژی خەڵکی ئاسایی دراوە و سەروەت و سامانی بە زیادەڕۆییەوە بۆ گیرفانی ئەوانە ڕۆیشتووە کە شایستەی نین.. ئەوە دەڵێم و دەزانم ئاستی ڕەشەخەڵکەکە لە ئاستی سیاسەتمەدارە حیزبییەکان باستر نییە بەڵکو خراپتریشە بەڵام هەرچۆنێ بێ خاوەن مافن با وەک منداڵێکی بێهۆشوگۆشیش بێ کە مافی ژیان و چاودێری و پەروەردەی هەیە و ئەوەشی بخەرە سەر کە بیانووی حیزبایەتی و چەکهەڵگرتن و چوونە شەڕی هەمەجۆرەوە لەو بەڵگەنەویستەوە دی کە گەل سەرچاوەی مافە و بەوە خزمەتی دەکا و بە ئەرکی سەر شانی خۆی هەڵدەستێ [ئەگەرچی دەزانم واقعی جیهانی سێیەمی دوای سەد بە تەواوەتی پێچەوانەیە چونکە ڕەعییەت ـ ناڵێم گەل ـ لە پلەی یەکمدا لێیان دەخوازرێ خزمەت بکەن و سەرکردەکانی ڕزگاری بە ئەنجامگەیاندن بحەسێننەوە لەگەڵ ئەو

سەرنجەدا کە ڕەعییەت پێش ئەوەی بزووتنەوەی نیشتمانی بگاتە تەمەنی پێگەیشتن لە لایەن بەهێزەکانەوە ڕەفتاری مەیلەو یەکسانی لەگەڵدا دەکرێ بەڵام حیزبایەتی ڕۆشنبیر!! ڕەعیەتی لایەکەی تر دەچەوسێنێتەوە وەک ئەوەی دوژمنی سەرسەختی گەل! و نیشتمان! بێ و چ پێویست ناکا درێژەی بدەمێ]

دوای ئەوەی دەستبەرداری شتی ساکار، بەڵام زۆر گرنگی شێتخانەکە بووم، لە نووسیندا دەگەمە کێشەیەک کە زیرەکترین زیرەک و زاناترین زانا و بەتواناترین کەس لە چارەسەرکردنی کێشە دەربەستی نایێ، ئەوەش پرسیارێکی ساکارە لە چەند وشەیەکدا و ناوەڕۆکەکەی ئەمەیە: هۆی ڕاستەقینە و عیللەتی پەیدابوونی شێتخانە چییە کە ملیارەها بەشەر لە خۆی دەگرێ؟؟ ئایە هۆیەکە بایۆلۆژییە یا سۆسیۆلۆژی یا جۆرەها ئاڵۆزکارییەکانی کۆمەڵگە و ئەو دیاردە سروشتییانەیە کە بۆ خەلکی ئاسایی تەفسیر نەکراوون یا هۆکاری شاراوەی سروشتە.. لە کەوندا دەستی خۆی دەوەشێنێ و تا ئێستا هیچی لە بارەوە نازانین؟ دەشێ کۆمەڵگەیەک لەبەر هۆکاری نەزاندراو دووچاری ناساغی (اعصاب) بێ نەیزانین و تێینەگەین و لەخۆڕا و بە بێ مەبەست کاری خۆی بکا؟ تۆ بڵێی لە توانا و کاریگەری و سروشتی سستەمی (عەسەبی) تێگەیشتبین؟ ئەوە مەعجیزەی مەعجیزەکانی ئەم کەونەی بەر دەستی هۆشمانە تا کاتی ئێستا یا من وای بۆ دەچم. بۆ نموونە دەڵێم کۆئەندامی هەرسکردن و سوڕی خوێن و کۆئەندامی تر خۆیان لە خۆیاندا موعجیزەن بەڵام تایبەتمەندی بەشەر نین چونکە زندەوەران، بە دەگمەن نەبێ، کۆئەندامی هەرس و خوێن و بینین و بیستن و هەستکردنیان هەیە.. بەڵام هیچیان ئەو کۆئەندامەی (عەسەبی)یان نییە کە عەقڵی تێدابێ کە ئامێری گەورەی موعجیزەکانی کەونە، چونکە ئەگەرچی ڕێی تێدەچی لەو کەونە بێ کۆتاییەدا جیهانێکی تری وەک ئەم زەمینە هەبێ و بۆ دروستبوونی ژیان یارمەتیدەر بێ و لە ماوەی ملیارەها ساڵدا پەرەی سەندبێ و بووبێتە بوونەوەرێکی هۆشەکی وەک ئەوەی لە زەمینی نیشتمانی ئێمەدا ڕوویداوە، ئەو و هی تریش ئەگەر لە شوێنێکی تر هەبێ نموونەی ئایاتی بەرزی وەک عەقڵی مرۆڤن. تەنانەت ئەو خەیاڵەی مەرج و بەند سنوورداری ناکا بە دووری نازانێ لە پەنایەکی کەوندا ژیان هەبێ (مەبەستم حاڵەتێکی تایبەتی وەک هی زەوییە) بێ ئەوەی پێویستی بە ئاو و هەوا هەبێ، لەو بۆچوونەوە، ئەگەرچی دووریشە، شێوەی زندەوەری و جۆرەکانی زۆر دەبن و شوێنیشیان زۆر دەبێ و نازانین چۆنچۆنی زاوزێ دەکەن و تەمەنیان چەند دەبێ و لە سای ئەم بۆچوونە فراوانەی ڕووبەرێکی چەند جار و چەند بار لە زەوی بەرینتر کە بە زندەوەران ئاوەدانە، خەیاڵم بەرەو ئەوە نابەم لە سای ئەو بۆچوونانەوە چارەسەر بدۆزمەوە گرنگیپێدانم ئەوپەڕەکەی ئەمەیە: دەشێ ئەو زندەوەرە خەیاڵکردانە و ئەو دەوروبەرەی تیایدا دەژین کاریگەری لە سەر ژیانی لای ئێمە هەبێ، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە شێتخانەی مرۆڤەوە هەیە؟ من نازانم بەڵکو

بیری لێ دەکەمەوە، تەنها بیرکردنەوە. دەبێ ئیمکانی دزەکردنی سروشتی ئەو گیانەوەرانە لە ڕێی مەودای فەلەکییەوە بۆ سەر زەوی و دوورتر نەبێ، چونکە ئەگەر لە ملیارەها ملیار ساڵەوە هەبووبن کاریگەرییان بە شێوەی هەڕەمەکی و بێ ئەنجامیکی دیاریکراو پەخش کردووە ئیدی گرنگ نییە ئاخۆ زەوی بەتنها خۆی ئاوەدان بووە یا سەدان و هەزارانی تر بە کەوندا بڵاو بوونەتەوە و جۆرە ژیانیکیان تێدا بووبێ کە ڕەنگە لە ژیانی سەر زەوی، بە ژیانی بەشەریشەوە لەپێشتر یا لەپاشتر بووبێ. لەوانەی لە سەر گریمانەی بوونی ژیان و نەبوونی ژیان لە کەونی بەریندا وەک لە بیرمە، ئەوەم خوێندۆتەوە کە ڕێی تێدەچێ یەک ملیۆن ئەستێرەی لە چەشنی زەوی هەبن بە پێی هاوکێشەی بیرکاری باڵا و سەرچاوەی تری زانیاری، ژیانیان تێدا هەبێ.

ئەوە دەڵێم و دەزانم زانستی نوێ ئاگای لە کاروباری کەونی بیکۆتایی هەیە بەڵام نە ناوی بڵاو دەکرێتەوە نە نهێنییەکەی نە ناوە نهێنییەکەی و هەتا ئەمرۆکەش نازانم هۆی ئەو پەردەپۆشکردنە ئانقەستە چییە وەک ئەوەی بەشێ بێ لە زانستی بەمەترسی یا کلیلی دێوی ناو قوتوو بێ. دەرفەتەکە دەخوازێ بڵێین کە شوێنەواری کاری مرۆڤانەی کۆن ماونەتەوە [یەکێکیان لە باشووری ئەمەریکایە] و کلیلی نهێنی ومەبەستەکانی نەکراونەتەوە.. باسی هەبوونی نهینی ئاماژەیی لە ئەهرامەکانی میسر دەکرێ و هند و چینیش شتی نهێنیئامێزیان تێدا هەن... هەژارانی هند دەستێکی باڵایان لەوەدا هەیە کە پێی دەڵێن جادوو یا یۆگا. موسوڵمانانیش بە گشتی، جا لە هند یا لە شوێنی تر، چەندین پلە لە دوای مەهارەتی ئەوانەوەن، هۆیەکەش، وەک بۆی دەچم، حەرامکردنی جادووگەری و شەعبەدەبازییە لە ئیسلامدا. زۆربەی کەرامات دەدرێنە پاڵ سۆفییەکان. هەندێ لەوانە شەعبەدەبازییە و خەڵکی نەدار بە کەمێ توانای چاوخەڵەتاندنەوە پەنای بۆ دەبەن. بەشێکی تری ڕەسەنە و چ فێڵی تێدا نییە. شتی وا تەنانەت لە لای قەرەجەکانیش هەیە. وا بزانم باسی (سێر ئۆلیڤەر لۆج)م لەگەڵ قەرەجە غەیبزانەکەدا لە ماڵی خۆیدا کرد کە قسەکانی ڕاست دەرچوون.

ئێستاش: بیسمیللاهی مەجریها وە مەرساها، هۆکاری ئەوە چییە ماڵی عاقڵان دەگۆڕێ و دەبێتە شێتخانە؟ قورسترین پرسیار کە لە هەموو ژیانمدا ئاڕاستەی خۆمم کردووە: ئەی خەلقەندەی خوا، ئەی مرۆڤی تاک لە ناو زندەوەران کە خەسڵەتی تێگەیشتن و دەرخستنی نەزاندراوت هەیە... ئەی ئەوەی بە نێوان ئەستێراندا هاتیت و چوویت و سواری هەوا بوویت و چەندین جار لە هەوا تیژتر فڕیت... ئەی تاکە خەلقەندەی بەر هەست و دیدمان کە تەلیسمی ڕاکێشانی زەوی و تیۆری ڕێژەیی ئەتۆم و ڕەهەندی چوارەم و دوای چوارەمت کردەوە و بە زانست لە دووری یەک ملیار ساڵی تیشکییەوە هەناوی کونە ڕەشاکنت پێوا.. ئەی موعجیزەی موعجیزەکان و ڕوونکەرەوەی

تاریکایی و نێزیککەرەوی ڕێگای دوور، خەریکە باوەڕ بێنم کە "سیحر لە سیحرباز هەڵگەڕایەوە" و تۆ کۆیلەی خۆتیت و وێرانکەری ماڵی خۆت و بە خوریکردنەوەی ڕیسی خۆتی و لەناوبەری ئاسوودەیی و هێمنی خۆتی و کەی لەگەڵ خۆتدا دادپەروەر دەبیت و بەزەییت بە وەچەکانی خۆتدا دێتەوە و دەبیتە مرۆڤێکی ئاسایی؟! چۆن بە کاری خۆت و تێگەیشتنی خۆت شێتخانەت دروست کرد؟ ئەم شێتییە کۆتایی دێ؟ ئەدی کەی لەخەو ڕادەبیت؟ لە خۆت و مەبەستت سەرم سوڕماوە. باسی پینەدۆزێک دەکەن گوایە هەموو ڕۆژێ زینێکی وای دروست کردووە دڵی هەموو کەسی ڕاکێشاوە و دوایی پارەی دنیایان پێ داوە و نەیداوە، کەچی بە تیغ ونجڕونجڕی کردووە و بۆ سبەینێ دەستی بە دروستکردنی یەکێکی تر کردۆتەوە. هەتا ڕۆژی مردنی ئاوها بەردەوام بووە و تۆڵەی گوناهێکی وای لە خۆی کردۆتەوە کە پڕ ناکرێتەوە و لێبوردن نایگرێتەوە. تۆش ئەی وەکیلی پینەدۆز، ماڵی خۆتت کردۆتە گۆڕستانی بەختەوەری و کەوسەرت لە خۆت کردۆتە گۆژاڵک و خەریکە بەیانت لێ دەبێتە شەوی دەیجووری بێبڕانەوە. سوودی چییە و گلەییت لە چییە و لە کێ نێزیک دەبیتەوە، کە خۆت خاوەنماڵی و خۆت غەدداری غەدرلێکراوی و خۆت ڕووناکی و ئاگریت و ئەگەر لە تاریکیی هەندێ لە گۆشتی خۆت بسووتێنیت ڕووناکایی پیوەکەت شوێنی ئازارت پیشان دەدا و کێشەکە ئا ئەوەیە کە تێگەیشتن ماندووت دەکا و تۆ خۆت ئەو پزیشکەی چارەسەری خەڵک دەکەیت و خۆت نەخۆشیت. بە هۆی زیادبوونی بەڵاوە لە نێوان بەنی ئادەم و زیادبوونی ترس لە دەرپەڕینی عیفریتی وێرانکەری سەرجەم، کەسێکی وەک من وریا دەکاتەوە کە توانای بەرگری بەرانبەر تفەنگێک نییە، لە ڕێی دۆزینەوەی سەرچاوەی کارەساتەکانەوە هەوڵی چارەسەری درامای مرۆڤایەتی دەدا بەڵکو ئەوە خوایە دەستی لە سەرەداوێک گیر بێ و بیگەیەنێتە شوێنی نیوە ئیفلیجییەکەی شارستانی ئەو مەزنەی لە نێوان ئەرز و ئەستێرەکاندا دێ و دەچێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە دڵنیام زۆر کاریگەری شاراوەی نەرێتی هەیە کە ئەو ئیفلیجییە ناوبراوە زیاد دەکا بەڵام دەزانم جەوهەری مرۆڤ و پێکهاتە (عەسەبی)یەکەی و هێڵی جیاکەرەوەی لەگەڵ ئاژەڵدا پاڵپشتی بەرەکەت و بەڵا و ڕووناکی و تاریکی و جوانی و ناشرینی ـ کۆمەڵایەتی سەید مەریوش و کاکە هاوار و ئاقای ئەسفەندیاری و بایار بەگ و مستەر سمیت و مسیۆ نازانم کێ و کێیە... هەتد. ئەگەر بتوانین حوکمی ڕاست بە سەر ئەوانەدا بدەین کە یەکەم کاریگەری چاکە و خراپەی دەوروبەریانن بە سەر ئەو خەلقەندانەوە، یەکەم کلیل و گرنگترین کلیلی هەموو مەتەڵە سەرسوڕهێنەرە ئاڵۆزەکانمان بە دەست هێناوە بۆ تێگەیاندنی ڕەشەخەڵکەکە ئەوەش ئەو عەقڵەیە کەمەریوش و دارودەستەکەی لە هەموو ئەو زندەوەر و بێگیانانە جیا دەکاتەوە کە دەکەونە بەر زانیاریمان یا لە ناو مەتەڵەکانی کەوندا شاردراوەن و لێهاتوویی مرۆڤ دەیاندۆزێتەوە. تا چەند دە ساڵییەک بەر لەئێستا وابەستەکانی ئاین پێیان وا بوو خوای تەبارەک و تەعالا هەر خۆی دەزانی کۆرپەی ناو زگی دایک چییە، کەچی وا گەشەکردنی

ئـەو کۆرپەیـە لـە تەلەڤزیۆنـەوە لـە منداڵدانـدا دەبینـی و بـە دڵنیاییـەوە نێـر و نێرەمـووکی لێـک جیادەکەیتەوە، وەک ئەوەی تەماشای ناو کیسەیەکی پڕ یا بەتاڵ بکەیت. وابەستەکان پێیان وابوو مانـگ تـەنێکی ئاسـمانە و لـە نـوور پێکهـاتووە، کـەچی دەرکـەوت جەسـتەیەکی ناشـرینە و نـەئاوی تێدایە نە هەوا و مسیۆ کۆنزالیس بـە سـەریدا پیاسـەی کـرد و کیسـە پیسـاییەکەی فڕەدایـە سـەر ڕووبەرە ناهەموارەکەی، تەنانەت ئاسمانی مانگ، کاتێ خۆریش بە دەرەوە بێ، بەهۆی نەبوونی ئەو گازانـەوە کـە تیشـک دەدەنـەوە تاریکەشـەوە. مانـگ بەرەبـەیان و عەسـر و نـازانم چـی لـێ نییـە و تەنانەت هەست بە خۆری پشت ئاسۆ ناکەیت تا کتوپڕ و بێ پێشەکی دەردەکەوێ. ڕۆژی سـەر مانگ 15 ڕۆژە و شەویشی پانزە ڕۆژە.. نـە بـەهاری لێیـە و نـە هـاوین و نـە جـەمال و نـە کـەمال، مانگ یەکێکە لە پەراوێزەکانی پەراوێزێکی خۆر کە زەوییە و جوانییەکەی لە کوردیـدا پێـی دەڵـێن دوورکوژی نێزیـک خەسار.. بـەڵام بـازدان لـە سـەر مانـگ چەنـدین جـار لـە بـازدانی سـەر زەوی بـەرزترە چونکـە ڕاکێشـانی مانـگ لاوازە و ئەگـەر توانـام هەبوایـە لەگـەڵ کەڵەگـەترین پاڵـەوانی بازبازێندا دەکەوتمە ململانێوە بە مررجێ من لە سەرمانگ باز بدەم.

مانـگ بۆتـە کاروانسـەرای ئەوانـەی لێـی دادەبـەزن بـەڵام هـەرە دواکـەوتووەکانی مـرۆڤ لـە کـاتی مانگگیرانـدا تـەپڵ دەکـوتن و کـاری تـر دەکـەن تـا جنۆکـە و عیفریتـی لـێ دوور بخەنـەوە و لـە خۆرگیرانیشدا لەوە زیاتر دەکەن!!

ئاسـتێکی هـەرە نـزم لـە عەقڵـدا هەیـە ئەگـەر مـرۆڤ دابەزێتـە ئـەو ئاسـتە دەگاتـە سـەر هێڵـی جیاکەرەوەی نێوان بەشەر و حەیوان. واقعی بەرچاویش لە ڕەفتاری زۆرینەدا لـە ڕووی کەمهۆشـی و ڕەفتاری دڕندانە و لۆژیکی بەرەواژ و باوەڕکردن بە پڕوپووچ ئـەو هیوایـە نـاهێڵن ببنـە هاوکاری یەک هەنگاوی بەرەوپێشچوون. ئەوان بە پێچەوانەوە، بەرەو دوا هەنگاو دەنێن و هەست ناکـەن و گوێش نادەنـە ئـەوەی چـی دەکـەن و بـەرەو کـوێ دەچـن چونکـە دنیـا لای ئـەوان دنیـای خوایـە و جیاوازی لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و باشوور و باکووریدا نییـە مەگـەر شـەیتان تەڵەیـەکی لـەو ئاڕاستەیەدا نابێتەوە کە هـەڵیبژاردووە... بـۆ تێگەیشـتن لـە هەشـت ئاڕاسـتە ناسـراوەکە، زۆرینـە بـە لایانەوە گرنگ نییە بڵێن: باشووری باکوور و ڕۆژهەڵاتی ڕۆژاوا چونکە هـەمووی هـەر ئاڕاسـتەیە و مەلایەکـەت چاودێرییـان دەکـا... ئەوانـەی لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی بیسـتەمدا بەعـەقڵی دوو سێ هەزار ساڵ بەر لە ئێستا دەژین خەریکی پێشخستنی شارستانەتی و ئاسانکردنی زەحمەتـەکانن لـە ڕێـی هـەوڵی زاناکانـەوە بـۆ دۆزینـەوەی ڕاسـتی بـوون، بەشـیان وەک بەشـی ئـەو ئامێرانـە و ئـەو ئاژەڵانەیە کە بار هەڵدەگرن شت دەگوازنەوە و ڕەنگە بەشیان هەر لە بنەڕەتـەوە نـەبێ مەگـەر لـە

وێنەیـەکی پێچەوانـەی نەریتیـدا ئـەوەش بـەوەی زۆر داهێنـان بدەنـە پـاڵ شـەیتان تـا ڕۆژێکـی لەگەڵیاندا ڕادێن و لەزەت لە سوودەکانیان دەبینن..

من کە زۆر وێنەی خەڵکی ناهۆشیاری ساکار پیشان دەدەم مەبەستم ئەوەیە خوێنـەران بـە گشتی بۆ ئەوە ڕابێنم بیرۆکەی شێتخانەیان قـەبووڵ بێ: ڕەنگە زوڵمم لـەو خەڵکـە ساکارە مێشکبەتاڵە کردبێ کە لە ڕووناکی سەردەم بێبەشن چونکە زۆر نموونەی پاشکەوتووییانم لە بوارە جیاوازەکاندا لـە سـەر هێناونەتـەوە ئـەوەش بـە بـەراوردی نـەفامێک تـەپڵ بـۆ مـانگیران لێـدەدا و حیزبییـەکی شۆڕشگێڕی عیلمانی کە لە توندوتیژی و بـەخائینکردن و وێرانکردنـدا یـەک ئینـج لـە سـەر پشتی هێسترەکەی دانابەزێ تا ئەوەی ملیۆنانی وا بە دەرهێنانی ڕەگوڕیشـە نـەبێ ڕازی نابێ جا بۆ ئـەو بەشـەرانە بـێ کـە بـە دووپشـک و مـار و گـورگ و جانـەوەری ژەهراوییـان دەزانـێ یـا بـۆ هـەر بیرۆکەیەک کە هۆشی بلیمەتەکان بۆی دەچێ. لێرە قسـەیەک بـاس دەکـەم کـە مـن نووسیومە و خـەڵکی پـێش منـیش بـە کوردی نیشـتەجێی ئـەوروپایان گوتـووە، کـە (گەنجینـە!!)یـەکی سیاسی فەلسەفی کۆمەڵایەتییان دۆزیوەتەوە و فەتوای بۆ دراوە کە بۆرژوا لـە کوردستاندا خـەلق بکـەن و دوایی بیرووخێنن تا قسەی مارکس لـە بارەی سـەردەمە مێژووییەکانـەوە بـە ڕاسـت دەرچـێ. ئـەم قسـە شـیرینە کـە لیکـی تێنـوانی ئـاوی کەوسـەری بـۆ دادەچـۆڕێ قـابیلی خـەڵکی تـر بـوو کـە سـەردەمەکانیان بڕیبـێ و لـە هیواکانی مارکسیان تێپەڕاندبێ چونکـە قسـەی ئـەوان دەبیسـترێ و زمان و قەڵەم لە مەعریفە دەکوتن و حەقیقەتە شاراوەکانی بن ڕیز لـە دوای ڕیـزی لەخشـتەبەر و بیـانوو دەدۆزنـەوە. کوردێـک دان بـەوەدا بنـێ بینـای نییـە تـا بیرووخێنـێ، بـە دەسـتی بەتاڵـەوە و ئەوەندەی نەبێ دە خانووی لەو گوندانە پێ دروست بکا کە بـە فـەرمانی ئاسـمان بـۆ جێگیرکردنـی پێغەمبەرایەتی مارکس لە بڕینی سەردەمەکاندا بۆ ڕووخانـدنیان هـاتبێ، چـی پـێ دەکـرێ.. خۆزگـە ئەو وڕێنە پێکەنینهێنەرانەی بەڵگەی بەتاڵیی کەللەن توانای جێبەجێبوونیان هەبوایە ئەگەرچی پڕن لە بێهۆشی و وەهـم چونکـە یەکـەم پێویسـتی بۆ بـەدیهێنانی ئـەو نیازەیـان بـوونی دارایـی و دراو و کێشانە و هونەر و ئەو بابەتە داهێندراوانە هەیە. بۆرژوا بە هیتاف و نەفرەت و پاڕانەوە لـە گـۆڕی پیاوچاکان و نەفرەتکردن لە شەیتان و عیفریت دروست نابێ: سەردەمێکی کۆمەڵایەتی بەنازوفیزە و جیـاوازی لەگـەڵ کـوردی موفلیسـدا ئەوەنـدەی ئـەو حـەوت مەودایـە دەبـێ کـە سـندباد لـە سەفەرەکانیدا بڕیویەتی. ئەو دەروێشە عاشقانەی وەهمی خۆیان هاوڕێی ئەکلیرۆسە مەسیحییەکانن کە فەلەکناسیان لە سەر باسی سووڕانەوەی زەوی دەکوشـت بـەڵام قەشـەکان لـە تاوانەکانیانـدا لـە ڕێگەی بە غەیبی کردنی دنیاوە فێڵیان کرد و دەستخۆشییان لە زانا فەلەکناسەکان و خاوەن هونەر و پیشەکان دەکرد ئەگەرچی وەک دەڵێن (لە دوای باران کەبەنک!!)

به هەرحاڵ کەس چاری نییە و هەر دەبێ دان بەوەدا بندرێ کە عەقڵی مرۆڤ لە دەیان هەزار ساڵ لەمە پێشەوە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ و تا دوارۆژێکی نەبیندراو، یەکەم کاریگەری سەر هەموو ڕووداوێکی وابەستەیە بە کۆمەڵگەی مرۆڤەوە و بەڵگەی ئەوەش بە بێ قسە دێتە گۆ و دەبینین جیهانی سروشتی بێگیان و گیاندار بە بێ گۆڕانکارییەکی هەستپێکراو لە لایەن هەستی هۆشیارەوە خۆی دووبارە دەکاتەوە و ژیرترین مەیموون لەوە تێناگا کە (2 کەڕەت چوار دەکاتە 8) چونکە ژیریی بۆماوە هەر ئەوەی لە دەست دێ زندەوەر بخاتە سەرەڕێی خۆپاراستن و بەردەوامی وەچە لە دیدی گیاندارەوە.. جیاوازی لە نێوان پارچە بەردێک و فڕۆکەیەکی جەتدا هەر ئەوەیە کە بۆ یەکەم جار فڕۆکە دەبینێ تووشی شڵەژان دەبێ چونکە مرۆڤ خۆشی کە یەکەم جار فڕۆکەی لە دەشتی کەرکووک یا لە بازیان دیت، لە مەیموون زیاتر سەرسام بوو. لە ڕاستیدا فرەوانی جێوازییەکانی نێوان بەشەر و ئاژەڵ لە دیدی هەردووکیانەوە بۆ بوون، چەند دە هەزار ساڵێکی کەم بەر لە ئێستا ڕووی دا و هەتا ئێستا لە هەندێ بواری ژیاندا پێکدەگەنەوە. سەگ، بۆ نموونە، خەریکە بەرانبەر ئاشنا و بێگانە و لە کاتی مەترسیدا ببێتە کۆپییەکی خاوەنەکەی و بۆی هەیە بە لای خواردندا نەچێ تا خاوەنەکەی ڕێی پێ دەدا و چاودێری منداڵێکیش دەکا کە خێر و شەڕی خۆی نەزانێ. ئەگەر نیگاری پەیژەیەک بۆ سەردەمەکانی پەرەسەندنی زندەوەران بکێشیت دەبینی جیاوازی نێوان زندەوەری میکرۆسکۆپی و مەیموون، گەلێ لەجیاوازی نێوان مەیموون و مرۆڤ زیاترە.. خەریکە بە لای ئەوەدا دەچم باوەڕ بە خۆم بینم کە ڕێی تێ دەچێ گۆڕانکارییەک لە مەیمووندا ڕوو بدا و ببێتە شتێک لە نێوان مەیموون و بەشەردا... خوێندوومەتەوە کە مەیموونێ هەندێ پیتی پێ دەگوترێ بێ ئەوەی تێیانبگا. دەبێ دوای دە هەزار ساڵ چۆنی لێ بێ. ئەدی ئەگەر بەشەر توانا زانستییەکانی ئێستای خۆی لە هێواشکردنەوە و خێراکردنەوەی پەرەسەندنی ژیان ڕەتدا چی دەبێ؟ بە گەیشتن بە کۆپیکردنی بەشەر، خەریک بو پیاوانی ئاین شێت بن و ئەوەش سەرەتایە و دوای هەزار ساڵ چی دەبێ؟ دەستگرتنی نەزان و لاڕێگرتوو بێ ئەنجامە چونکە ئەو پەرۆشی لەڕێلادانی بەشەر و ترساندنێتی لە مەسیحی دەجاڵ و چارەنووسی خەڵک و خەڵکیش لە باوەڕکردندا بە پڕوپووچ نەرمن چونکە ئەو بەڵگەنەیان نییە کە داستانی پڕوپووچ بە درۆ دەخەنەوە بۆیە باوەڕهێنانی بە پڕوپووچ پەنابردنە بۆ سەلامەتترین ئەنجام. دەترسێ ئەوەی جادووگەر لە تەسبیحە سەد و یەک دەنکەکەیەوە دەیڵێ ڕاست دەرچێ. خوارافات بە ئاسانی نامرێ و دیتمان ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ بۆرژوا دروست دەکا و بە خەیاڵ دەیرمێنێ، ئیتر دەروێش عەبدوڵڵا و سۆفی عەوەزەڵڵا چی بکەن لە کاتێکدا خەیاڵ، بە بێ ڕووخاندن و ماندووبوون دەروازەی بەهەشتی بۆیان خستۆتە سەر پشت بۆ بەهەشتێکی ڕێکتر و جوانتر کە حۆری و کۆشک و مەلایەکەتی لە نوور تێدان نرخەکەشی هەر ئەوەیە باوەڕ بە خورافات بێنێ. باوەڕهێنانی ئەوە لە باوەڕهێنانی تیکۆشەری شۆڕشگێڕ بە نوکەتەکەی کە یەک فلسیشی نییە شێر و خەتی پێ بکا،

سەیرتر نییە.. سۆفی لەو ئاواتەی نێزیکترە کە پشت بە غەیب دەبەستێ، لە شۆڕشگێڕێک بە بێ یەک فلس شارستانەتی دادەمەزرێنێ تا دوایی بیرووخێنێ..

وەک میسرییەکان دەڵێن، عەقڵ پشووی وەرگرتووە بەڵام هەر دەبێ دانی پێدا بندرێ کە ئامێری تێگەیشتن و زانست و جیاکردنەوەیە ئەگەرچی لە زۆر شوێنی فرەوانی سەرزەمینی خوا بە نەفامیدا ڕۆچووە و لە سای بەڵێنی وەهمی چاوەڕوانکراودا حەساوەتەوە و ئەگەر چاوەڕوانکراوەکانیش بە ڕاست نەگەڕێن توندتر بە باوەڕەکەیەوە دەلکێ و خۆی بە تێکشکاندنی خائینان و بۆرژواکان و دەرەبەگ لە سەرەڕێی ئامانجە بەرزەکانی لە پاکتاوکردنی واقعی چەپەڵدا هەڵدەکێشێ... و بۆ خولێکی بێ ئامانجی تر ئامادە دەبێ: ئەگەر، خوانەخواستە سەرکەوتوو نەبوو، خاوەن باوەڕی چەواشەکار و هەڵاتووە بە کرێگیراوەکان لە ڕەگ و ڕیشەوە دەردێنێ! دوای ئەوەی دوا تنۆکی ئاسوودەیی ڕابردوو دادەدۆشێ، شتێکی نامێنێ خۆی پێوە خەریک بکا ئەوە نەبێ ناتەباییە کۆنەکان زندوو بکاتەوە کە بەشی سەرگەرمیی ماوەیەک دەکا تا وەک کەفی سابوون دەرفەتی تەقینەوەی دەبێ و لە ئامێزی شەیتاندا دەمرێ...

دیسان دەیڵێمەوە کە عەقڵ کاریگەری یەکەم و دووەم... و دەیەمی ڕوودانی پێشکەوتن و پاشکەوتن و توندی و خاوی و ئاشتی و جەنگە.. کورتەی قسان ئەوەیە کە بەو شێوەیە دەیبینین پێشدەکەوێ لە سەر یەک ستوون وەستاوە کە چونە پاڵپشتێکی هاوکار و تێکدەری هەیە و ئەگەر ئەو پاڵپشتانە کرِ بن عەقڵ بە یەکەمایەتی دەمێنێتەوە... بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێم نەوەخستنەوە لە سەر یەک ستوون وەستاوە کە ئەوەش پەیوەندیکردنی هەردوو ڕەگەزە بە یەکەوە و بە بێ ئەوە ئەگەر هەموو خۆراک و خواردنەوە و خۆشییەکانی دنیا و قەیامەت کۆ ببنەوە منداڵێک لە دایک نابێ و حۆری بەهەشتیش لەو بوارەدا کەڵکی نییە. بۆ نموونە، تەماشای کۆئەندامی بیستن بکە کە پەنجەرەیەکە بەرەو جیهان و وەک بۆنکردن و تامکردن یەکێکە لە ئامێرەکانی عەقڵ و ئەگەر دووچاری تێکچوون ببێ هیچ شتێکی تر جێی ناگرێتەوە بەڵام عەقڵ یەکی پێناکەوێ چونکە دەتوانێ بە ئاماژە تێبگا و گەلێ جار یەک دوو حەفتە لە ڕاو دەبێ و چاو ڕۆڵی یەکەمایەتی لە هەستەکاندا دەبینێ. تام شتێکی لاوەکییە و ئەگەر مرۆ لە دەستی بدا بیری دەکا بەڵام مەترسیدار نییە. ڕێی تێ دەچێ منداڵ کە لەدایک دەبێ تام نەکا یا کەسێک هەستی تامکردن لە دەست بدا بەڵام کاریگەرییەکەی زۆر نابێ چونکە مەودای تایبەتمەندی تام هەستکردنە بە تام. زۆر کەسمان دیت هەستی تامکردنی نەماوە بەڵام کاریگەری لە سەر بەرژەوەندییان نەبووە و هەستیشیان چۆن بووە وا ماوەتەوە...

عەقڵ لایەنی لە ژمارەنەهاتووی چاک و خراپی هەیە و یەکەم شت کە دەبێ بگوترێ ئەوەیە ملیۆنێک ساڵ بەر لە ئێستا مرۆڤ بە عەقڵی تەواوەوە لەدایک نەبووە بەڵکو ئەو گۆڕانکارییە بایۆلۆژییانەی بە سەردا هاتوون کە لەوەتەی ژیان پەیدا بووە، بە سەر زندەوەرانیشدا هاتوون و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ شوێنەواری ڕاستگۆ لە جەستەیدا هەیە وەکوو ڕیخەڵۆکەکوێرە و کلێنجک و هەندێ غوددە کە سەدان هەزار ساڵە لەکار کەوتوون تا ئەوەی لەدایکبوونی جمک، وەک بیزانم، گەڕانەوەیەکی کەمە بەرەو سەردەمانێکی دوور کاتێک ملیۆنەمین نەنکی بەشەر ژمارەیەکی زۆر منداڵی بە زگێک دەبوو. ئەوە لادان نییە لە سەرچاوە بەڵکو جۆرە گەڕانەوەیەکە بەرەو سەرچاوە. هۆی شەش پەنجەیی دەستی مرۆڤ نازانم ئاخۆ ئەوە مەیلی زیادبوونە یا گەڕانەوەیە بەرەو ڕابردووی هەردوو دەست. کتێبیشم لەو بارەیەوە نییە بۆی بگەڕێمەوە تا بابەتەکە یەکلایی بکەمەوە بەڵام بە دڵنیاییەوە لە لای پسپۆران یەکلایی بۆتەوە.

هەر دەبێ ڕووناکییەک بخەینە سەر لێکچوونی ئەندامەکانی جەستەی زندەوەران، پڵنگ بۆ نموونە، هەموویان کۆئەندامی هەرسکردنیان لێک دەچێ و کەوڵەکانیان هەر بە کاری پەڕەمووچەی هونەرمەندێک دەچێ کە نیگاری ڕەنگیی بکێشێ.. شانەی هەنگ و ئەو هەنگوینەی تیایدا هەڵدەگیرێ و دابەشکردنی کار بە سەر جۆرەکانیدا و کارەساتی لەناوبردنی کارکەرەکانی، هەموویان شێوازگەلێکی نەگۆڕن و بە مجێزی بەشەر جێی باوەڕکردن نین چونکە ڕانەهاتووە چارەنووسی پرۆلیتاریای هەنگ لە کۆتایی کارەکەیدا کوشتن بێ و باوەڕ ناکەم کەس بزانێ چۆن لە ملیۆنان ساڵەوە بەردەوامی ژیانی هەنگ بە قەتڵوعامی کارکەرەکانی بێ!! ئەو سروشتە کەڕوکاسەی دەوروبەرمان لە پەڕی تاووس هونەرێکی بێوێنە دادەهێنێ کە عاقڵترین هونەرمەند بە دەستیەوە خەریک بمێنێ و ئەو جوانی و کەماڵەی تیایدایە هەزار جار لەوە زیاترە کە نێرەکە لەپێناوی وەچەخستنەوەدا پێویستی بێ بۆ ڕاکێشانی مێ.. سەرم لە نایابی کارێک سوڕماوە کە بە بێ تێگەیشتن و هیچ جۆرە ئیرادە و ئارەزوویەک پەیدا دەبێ و ئەو سروشتەی ئاگای لە خۆی نییە موعجیزەی لە نەخش و نیگاری تاووسدا لێ دەکەوێتەوە بە بێ دەستتێوەردانی هیچ جۆرە هۆشیارییەک. ئەو موعجیزە باسکراوە و هاتنی با و بارانبارین و بڵاوبوونەوەی پەتا و بارەی مەڕ هەموویان لە ڕووی نەبوونی ئیرادەیەکی دیارەوە یا مەبەستێکی دیاریکراوی ئەو دیاردانە و ملیۆنان ملیۆنی وەک ئەوانەوە یەکسانن. لە هەندێ شوێنی پێشتری قسەکانمدا باسی ئەوەم کرد گریمانەی ئەوە هەیە کاریگەری بەهێز یا لاوازی جیهانی ملیارەها ساڵی تیشکی دوور لە سەر وردەکارییەکانی مرۆڤ و (زەویش بە گشتی) هەبێ و پشتیشم بە موعجیزەکانی سروشتی کەڕ و کاس بەستبوو کە شتی مەیلەو وەهمیمان لە لا هەیە کە لە کەشوهەوای زەوی و خۆر و پەراوێزەکانەوە بە شاراوەییەکی تەواوەوە کاری خۆیان دەکەن و هەستیش بە خۆیان و غەیری خۆیان ناکەن و دەبنە

هۆکاری شتگەلێک بێ ئەوەی چاوەڕوان بکرێ ڕوو دەدەن و دەبنە دیاردەی وا کە لای خەڵکێکی دەگمەنی لێهاتوو نەبێ، چ تەفسیر هەڵناگرن و ئەوانەش بە توانای لە ڕادە بەدەر ناناسرێن. ڕەنگە تووشی خەوێک یا خەیاڵێک یا هەستێک یا تارمایی لە کاتی دوور لە یەکەوە هاتبێتی و بە وەهمت زانیبێ و بە هۆی سەرقاڵیتەوە بە بێ سوود و بێ ئەنجامت زانیبێ و لەوەدا مافی خۆتە چونکە داوا لە هەموو کەس ناکرێ بچێتە ناو کێشەی ئاڵۆزەوە و لە دیاردەی ناڕوون تێبگا، تەنانەت بەشەری دەگمەن نەبێ کەس توانای تێپەڕبوونی بەو ژانە سەرسوڕهێنەردا نییە، بەڵام چارت نییە و دەبێ گرنگی بەو خەونە بدەی کە لە خەوی بەرەبەیانتدا دیوتە و بە ڕاست گەڕاوە یا لە بێدەنگی شەودا گوێت لە دەنگی بەشەرێک بووە بێ ئەوەی سەرچاوەکەی دیار بێ بەڵام دەنگەکە ئاماژە بووە بۆ ڕووداوێک. گریمانە باسکراوەکان لە نێوان دڵنیابوون بە بوونی و گومانکردن لە بوونی خۆی بە سەر سەرجەمی وردەکارییەکانی عەقڵدا دەسەپێنێ و لە ڕووی کاریگەرییەوە بەشێک دەبێ لە کاریگەریی عەقڵ. ڕاستییەکەی، خەڵکانێک لە یەک کەشوهەوادا دەژین ڕەفتاریان لە یەک بابەتدایە [یا بڵێی تۆڵەکردنەوەی کەرامەت] بە شێوازی جیاواز، دەبینی یەکێکیان بە عەقڵی منداڵ ڕەفتار دەکا و شاخی گایەک دەهاوێتە حەوشەی ناحەزەکەیانەوە و یەکیکی تریان دەچێ کلکی کەری دوژمنەکەیان دەبڕێ و سێیەمیان خۆی لە وردکردنی داوەتووتنی هەڵخراوی ناحەزەکەدا ماندوو دەکا.. ئیتر بەو شێوەیە [زۆر ڕووداوی تۆڵەسەندنەوەی وا ڕوویانداوە و هەندێکیان دەزانم و باسکردنیان ئاسان نییە].

بەو شێوەیە، خوێنەری هێژا، دەمبینی لەڕەفتاری مرۆڤدا حوکمی یەکەمایەتی بە سەر عەقڵدا دەدەم جا لەڕەفتاری خۆیدا ئازاد بێ یا فێڵبازێک فریوی دابێ یا لە لایەن قۆڵبڕێکەوە ئیرادەی لێ سەندرابێ یا بە هۆی تەمای پارە و شتی ترەوە بەرەو چاکە یا خراپە پاڵ نرابێ، چونکە هەموو تەما و هەموو فێڵ و هەموو باوەڕەکان ناتوانن بەشەر بەرەو ئامانجی دیاریکراوی سەپێندراو بەرەن ئەگەر عەقڵەکەی تێینەگا و مەرجیش نییە لە هەموو بارودۆخێکدا باوەڕ بێنێ و عارەب لە کۆنەوە گوتوویانە "براکەت ناچار کرا و قارەمان نییە" بەڵام ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ شتێ ڕەت نەکاتەوە کە لێی دەخوازرێ یا فریو بدرێ ئەگەرچی ژیانی خۆشی لە سەر دانێ: چەند قارەمانی گیانبەخش لە مەرگی پاک و شەریفدا مردنیان هەڵبژارد نەک ژیان، لە بارودۆخی وادا ویژدان ڕازی نابێ بە نرخی خۆی بۆ خۆپارێزی شل بێ، ئەوەش قسەیەکی قەبووڵکراو و تەنانەت بەرزیشە بەڵام ویژدان، ئەگەر خاوەنەکەی شێت بێ یا عەیبدار بێ، نابزوێ و هەر دەبێ عەقڵ مەسەلەکە یەکلایی بکاتەوە جا بە ڕێکەوتن بێ یا خۆبەختکردن یا خۆبەدەستەوەدان یا بێلایەنی یا چاودێریکردن یا فێڵکردن یا خیانەت یا ڕاکردن بۆ پەنایەک یا خۆکوژی.

چار نییە دەبێ دان بە یەکەمایەتی ڕۆڵی عەقڵدا بنێین لە هەموو شتێکی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا و هیچ عفریتێک یا مەلایەکەتێک ناچێتە پێچەکانی مۆخ یا پەنای زمانی مرۆڤەوە و لە بری ئەو قسان بکا: گریمان وەهمێک سواری سەری عەقڵێک بوو، ئەو عەقڵەی ژێر کاریگەری وەهم هەر بە بەڕێوەبەری دەمێنێتەوە ئەگەر بەربەستێک پێش بە ئازادی ڕفتارەکانی نەگرێ و هیچ شتێک جێی عەقڵ ناگرێتەوە مەگەر خاوەنەکەی شێت بێ و قازی وەکیلێکی بۆ دابنێ، کە عەقڵی تەواو بێ یا لە پێستی هۆشمەندی خەڵکدا بێ. بەڵگەنەویستە و دەزانین بزوێنەری بەد و چاک و بێلایەن لە ژماردن نایەن و تاک و کۆمەڵی خەڵک لە ژێر کاریگەری قسە و باس و کرداردان تا ئەوەی باوەڕی ترسناکی دینی و سیاسی و ئایدۆلۆژی دەبنە بەشێکی گرنگ و کاریگەری باوەڕی ڕەگداکوتاویان و وەک شێت دەروێشایەتی بۆ دەکەن. ئەوەش یەکێکە لە ئافاتە کوشندەکان کە هیچ دەرمانێکی نییە ئیفلاسکردنی باوەڕەکە نەبێ، ئەوەش لە کونکردنی تووترک زەحمەتترە بە تایبەتی لە جیهانی پاشکەوتوودا کە هەوێنی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی تێدا نییە و چەندین سەدە تێدەپەڕن و ئەو هەر لە جێی خۆیدا لە خەوی خۆشدایە و تا ئەوەی هاتنی تازەبابەت لە جیهانی پێشکەوتووەوە ئەو کاریگەرییە شارستانییەی لە سەر نابێ کە لە جێی خۆی بە سەر شارستانی و پیشەسازییەوە هەیبووە. سواری ئۆتۆمبیل دەبێ بەڵام بە ڕۆحی کەسێکەوە کە دەچێتە لای ساختەکارێکی ڕدێنزەردهەڵگەڕاوی دووکەڵاوی و تەماشای فرۆکەی تاقی ئاسمان دەکا بەڵام حەمدی ئەو شێخە دەکا کە هیدایەتی ئەو کافرانەی داوە تا بە گژ ئاسماندا بچنەوە و زیاتر بە کوفردا ڕۆچن... لە ماوەی دەیان ساڵدا زۆری چەشت تا وای لێ هات لە بیری چووەوە کە کارەبا کاری شەیتان نییە وەک بۆی دەچن. دوای ئەوەی لەگەڵیشیدا ڕاهات لە بایەخدا خستیە خوار کوانووی دووکەڵاوییەوە و نازانم کاتێ ئامێری ئاژەڵدۆشین لەبری پەنجە بڵاو دەبێتەوە چۆن بیر دەکاتەوە. لە بیرمە کاتێ تۆری ئاو لە کۆیە دامەزرا، یەکێ لە زانا ئاینییەکان بە باوکمی گوت: گەورەم لەوەتەی ئەو پرۆژەیە دامەزراوە، ئاو تامی نەماوە، ئەویش گوتی: ڕاست دەکەی چونکە بەر لە پرۆژەکە هەر کووپە ئاوێک مسقاڵێ پیسیی تێدا بوو بەڵام ئێستا ئاوەکەت بە خاوێنی بۆ دێ و دیارە تامەکەشی دەگۆڕێ.

بیر لەمە بکەرەوە: زۆربەی داهێنان و دروستکراوەکانی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان بازاڕی وڵاتە دواکەوتووەکان پڕ دەکەن بەڵام ئەو شارستانیەتە خەلق ناکەن کە ئەو بەرهەمانەی دروست کردووە چونکە کەرەستەی هاوردە (مێوان)ی وڵاتە دواکەوتووەکەن و ئەو کارگانەی بەرهەمەکانیان دروست کردووە لە وڵاتە شارستانیەکەدا مێوان نین، چونکە کارگە و ئامێری تاقیبکردنی ئەسترە و شێوازی گردکردنەوە و شێوازی زانست و هونەر لە ماوەی چەندین سەدە یا بە لای کەمەوە سەدەیەکدا ئەوەش ناکرێ کارگەی بۆ نموونە، کارگەی ئۆتۆمبیل دامەزرێ

چونکە هەر سەقەتبوونێک لە هەر بەشێکی ئۆتۆمبیلەکەدا )یا فرۆکە یا مەکینەی کارەبا یا... یا...) ئەگەر دروستکردنی بە تەواوی نەبێ دەبێتە هۆی پەککەوتنی ئۆتۆمبیلەکە و شتی تری لە بابەتی ئۆتۆمبیلەکە. ئەمرۆ قەتار دەبینی بە خێرایی 150 کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا بە نەفەقی ژێر زەویدا دەڕوا و شوفێریشی نییە [دوو ڕۆژ لەمەپێش مەترۆی نوێی پاریسم بەو سیفەتانەوە دیت]. ئەو کرێکارەی لە یەکەم ڕۆژەوە ڕاهێنان لە سەر کاری هونەری دەکا، بیر لە بەرنامەیەکی تر بە خەسڵەتی کەمتر ناکاتەوە و لە منداڵیشەوە کە لە کۆمەڵگای بە دیسپلیندا بە سەری بردووە، گریمانەی هەرە زۆر ئەوەیە لە خەتی گشتی پرنسیپەکانی ماڵ و بازاڕ و قوتابخانە و شوێنی خواپەرستی لانادا، لە کاتێکدا نەفەری پاسی گواستنەوەی لای خۆمان دەبینین بە چەقۆ خۆی بە درینی کوشنەکانەوە سەرقاڵ دەکا... لە جیهانە کلۆڵەکاماندا ئەوەش باوە حەسحەسی شەو لەگەڵ دزەکاندا ڕێکدەکەون ماڵی خەڵکی ببرن و خەڵکی تر بە جلوبەرگی ڕەسمییەوە دەست بە سەر ماڵدا دەگرن و خاوەنماڵ ناوێرێ نارەزایی دەربڕی نەک خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی بکوژن و حوکمی فەلسەفە لە کوشتنی خەڵکدا وای لێکدەداتەوە کە مردوو قسان ناکەن و تۆڵە ناکەنەوە و لە ڕووتکردنەوەیاندا بەرگری ناکەن و پتر لە دەوڵەتێکی ڕۆژهەڵاتە ناوەڕاستەکەماندا کوشتن تیایاندا بە مسۆگەرترین ڕێگە دادەندرێ بۆ نەهێشتنی کاردانەوەی هەژاران و بێدەنگکردنی ئەوانەی بە چاو دەیبینن و بە گوێ دەیبیستن.. قاجەریەکان سەرەکخێڵە کوردەکانیان بە لوولەی تۆپەوە دەبەست تا دیمەنە خۆشەکەی لەتوپەتبوونیان ببینن وەک ئەوەی دیمەنی (دیسنی لاند)ی لۆس ئەنجلس بێ.. سەرکردەیەکی سەربازی گۆشەیەکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆی گێڕامەوە: ڕەتڵەکەمان لە مەودایەکی دووری واوە تەقەی لێ کرا کە کاریگەری لە سەر نەبوو، منیش پیاوانی گوندە نێزیکەکانم هێنان، کە هەموویان زەحمەتکێشی دوای ژیانی خۆیان بوون، بە دەستڕێژێک هەموویانم کوشت و ژمارەیان بیستوپێنج پیاوی پیری بێچەک بوو!! زۆربەی جار لە بارودۆخی ودا، ئەوەی ژیانی خەڵکی بە لاوە سووکە لە ڕووی پیاوەتییەوە عەیبدارە و لە ڕێی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە بەرانبەر مردوو، بە سەر نامەردێتی و ئابرووچوونی خۆیدا زاڵ دەبێ و ئەوەش ڕاستییەکی تاڵ و کارەساتئامێزە، بەڵام هەزار جار بە داخەوە، شەریعەتی لادان و نەزانی و تورەهاتی و لەدەستدانی مرۆڤایەتی و کەرامەتە. ئەوەی لە بارەی ئەمرۆمانەوە دەیڵێم لە بناغەیەکی ڕەگداکوتاوی ئیسلامیانەوە بۆمان ماوەتەوە، چونکە یەکەم خەلیفەی عەبباسی حیکمەتێکی هەبوو دەیگوت: لەسەر گومان بکوژە! ئەوەش حیکمەتێکی بنەبڕە بۆ بەدەستهێنانی سەلامەتیی خۆی، چونکە ئەگەر لە دڵی ئەو کوژراوەدا شتێکی خراپ هەبێ، ئەوا لە شەڕی پارێزراو دەبێ و ئەگەر بێتاوانیش بێ زەرەری بۆ خەلیفە نییە. ئەوجا مەنسووری دوای ئەویش وای دەکرد، ئەمانی بە مامێکی خۆی و ئەبوو موسلیمی خوراسانی دا و بێ ئەوەی چ دەرفەت بدا هەردووکیانی کوشت. ڕۆژگار بەو شێوەیە بە ڕووداوی وا ئاوس بوو کە دڵی پێ خۆش نەدەکرا و بەردەوام بوو.

نوکتەیەکی کوردی هەیە دەڵێ خاوەن دەعوایەک لە بەردەم قازی ئامادە بوو، کە چووە دەرەوە کوڕەکەی لێی پرسی ئاخۆ دادگا چۆن بەڕێوە چوو، گوتی: کوڕم، سوێندخواردنم بە قسمەت بوو.

ئەوەی دەبێ ئاگاداری بین ئەوەیە، هەرچی قەباحەتێکی منداڵ دەیبیستێ و دەیبینێ، دەبێتە بەشێکی گرنگ لە کەرەسە مەعقوول و هەستپێکراوەکانی و بە هاوکاری شتی خراپ و بەردەوام، ڕێچکە لە ناخیدا هەڵدەکۆڵدرێ و ڕۆژ بە ڕۆژ بە دوای یەکتردا دێن و ئامادەیی عەقڵ و ویژدانی بۆ باوەڕکردن بە پڕوپووچ زیاتر دەکا. گەلێ جار ئەو ڕاستییە نەفرەتییەی هەرزەکار بە خۆراکی نەزۆک و ژەهر تێر دەکا، دەمترسێنێ و بە ئاستەمیش ڕووناکایی نابینم جێی هیوا بێ و تەمی دەوری خەیاڵی تێکۆشەر برەوێنێتەوە چونکە لە منداڵییەوە بە پڕوپووچی شێتان پاراو دەکرێ و کاوێژیان دەکاتەوە و دوای ڕاهاتنی لەگەڵ شەڕەقۆچی وەک بەران و بەیەکدا هەڵشاخانی وەک کەڵەشێر و شەڕەجنێوی وەک نوێژ فەرز، لەگەڵ دیمەن و هەواڵی وادا بە تەمەندا هەڵدەکشێ کە لە بەهای مرۆڤ کەم دەکەنەوە: ئەو ڕاهێنانە بەردەوامانە لە منداڵییەوە، منداڵی دوێنێ و هەرزەکاری ئەمڕۆ و گەنجی سبەینێ، وەک سەربازێک ئامادە دەکەن کە لە بنەبانی دۆزەخی ناهۆشیارییەوە هاتبێ و ڕۆژوو و نوێژە سیاسییەکانی دەبنە ڕێوڕەسمی هاربوون و مومکین نییە ببێتە ئەو هیوایەی هەناوی نیشتمان و نەتەوە خستبێتیەوە. ململانێی ناوخۆمان لە زۆر وڵاتی جیهانی سێیەمی دوای بیستەمدا لەوە توندوتیژتر و خوێناویتر و بریندارکەرترن لە شەڕێک کە لەگەڵ دوژمنی دەرەکیدا کردبێتیان. بزانە لە دنیای دواکەوتوودا چۆن لایەنێکی سیاسی نەبووە بەوە ڕازی بووبێ لەگەڵ لایەنێکی سیاسی وەک خۆیدا لە دەسەڵاتدا بەشدار بێ و هەر دەبێ شەڕێکی یەکلاییکەرەوە لە نێوانیاندا ببێ و خەباتگێڕیش وەک هەتوانی هەموو برینێک لێی دەڕوانێ. لێرەدا دوو هۆکاری نەگونجان و دووبەرەکی هەن و یەکەمیان ئەو کەلەپوورەیە کە لە ڕابردووەوە گواستراوەتەوە و گومان و دڵکرمێیی بڵاو دەکاتەوە [عەقڵ نایبڕێ دابەشبوونی ئیسلام بە سەر حەفتاو دوو دەستەدا لەئەنجامی لێکحاڵیبوون و زۆریی یەقین و ئارەزووی یەکێتی و تەبایی بێ]. ئەگەرچی ڕابردووی کورد، بۆ نموونە، ناتەبایی سیاسی و ئایدۆلۆژی سەردەمی خۆی نەبوو، هۆکارەکە ئەوە بوو کە ژیان و لایەنی کۆمەڵایەتی کورد سەرەتایی بوون و ئەوەش زانست و هونەر و تەکنیک[23] و ئابووری دەگرێتەوە تا ئەوەی مێژوومان بانکێکی کوردی تێدا نەبووە و گۆڕینەوەی پارەش بەم دواییانە هەبووە و ئەوەش بە ژمارەی کەمی وەک نەبوو. هۆی دووەم درێژبوونەوە و تازەبوونەوەی ئەوەیە کە لە ڕابردوودا بووە بەو واتایەی ئەو کوردەی دابڕان و دوژمنداری و جیابوونەوەی وەک بۆماوە بۆ ماوەتەوە، ئەمڕۆ لە واقعێکدا خۆی دەبینێتەوە کە لەوەی ڕابردوو جیا نییە و پەراوێزی (سیاسی و ڕەگەزایەتی)شی هاتۆتە سەر و لە کوردستان و زۆر وڵاتی دواکەوتووی تردا، بە گیانی ئەو ڕێگرییەوە پێڕەو دەکرێ کە سەد ساڵ لەمەپێش

ئەنجام دەدرا و ئەوەش جێی سەرسوڕمان نییە، چونکە هەر لایەنیک لەو لایەنانەی کە لە واقعی کورددا سیاسەت دەکەن هاوکێشەی خۆی وا دادەنێ کە لایەنەکانی تر خۆیان بۆ ڕۆژی یەکلاکردنەوە کۆ دەکەنەوە و دەبینی هەر لایەنە و لایەنگری دوژمنی خۆی بە پارەیەک دەکرێ کە لە مەعاشی چەندین مانگ، بگرە چەندین ساڵی (پێشمەرگە)یەک زیاترە و (هەر کەسەش نرخی خۆی هەیە). ڕەنگە بگوترێ دەوڵەتانی لوتکەی شارستانەتیش خەڵک و لایەنگر دەکڕن و ئەوەش ڕاستە و تەنانەت لەململانێی نێودەوڵەتی تازەدا زەرروورەتیشە، بەڵام جیاوازی نێوان حاڵەتی ئێمە و ئەوان ئەوەیە کە مجێز یا ئیرادەی بەهێزەکانی لای ئێمە ئەوەی دەوێ نەک سیاسەتێک بێ و لە سەری پێکهاتبن و پارەیان لە داهاتی وڵات بۆی تەرخان کردبێ ئەگەرچی واقعێکی کەڵەکەبووش هەبێ کە یەکلاییکردنەوەی دەمودەستی پێویست بێ. وا دەبێ ئەو ئیرادەیە چەندین مانگ موعامەلاتێک دوا دەخا و دووریش نییە هەر لە بنەڕەتەوە ڕەتی بکاتەوە جا بە پێی بارودۆخ، بە حیکمەتێک بێ یا بێ حیکمەت بێ. تێکۆشەرێکم دی هەموو تەمەنی لە حیزبایەتی و ناخۆشترین بارودۆخدا بەخەرج دابوو چونکە چەپە توندڕەوەکان ساڵی 1959 ـ 1960 زۆری نەمابوو قەومییەکان لە ڕەگوڕیشەوە دەربێنن و ئەو تێکۆشەرەش بە خۆ و خێزانەوە لە گەڕەکێکیدا دەژیا هەموو دانیشتوانی توندڕەو بوون.. لە شەستەکاندا ناچار بوو کۆچ بکا و لە کوردستانی ئێراندا مایەوە تا ڕۆژێکی بارودۆخ چاک بوو ئەوجا گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی بەڵام کەس لە خزمەکانی پارووە نانێکی نەدایێ هانای بۆ منی لاواز هێنا.. دوای ساڵێک منیش سەردانم کردەوە دیتم مردبوو [لە ماوەی ئەو ساڵەدا من گەڕابوومەوە بەغدا]

دەبێ لێرەدا قسەیەکی هەق بکرێ کە ئینسافە و چ موجامەلەی تێدا نییە: ئەو بەهێزانەی کە لە ڕەوەندی کاروباردا لۆمەیان دەکەین وەک ئێمە مرۆڤن و ڕەنگە لە زۆر کەس کە توانایان نییە باشتریش بن [یا ڕەنگە بە پێچەوانەشەوە بن]. ئەوان لە بارودوخۆی باوی لای ئێمەدا کەوتوونەتە نێوان دوو بەردی دەستاڕەوە، یەکێکیان سووکە کە هەستی مرۆڤانەیە ئەوی تریان قورسە و حوکمی بارودۆخی باوە کە چ ڕەحم ناکات. لێرەدا بوار نییە تا بەراوردی نێوان بەزەیی و حوکمی بارودۆخ بکەین ـ لەگەڵ ئەو حەقیقەتە ڕوونەشدا پەراوێزی هەواڵ ئەگەرچی بەرینیش نەبێ مەودا هەیە بەهای پێ بدرێ تا لە کارەساتی دەستوەشاندنی ناچاری ئەوەندە بیپارێزێ ئێسکی نەشکێ و مەودای گیرسانەوەی شکان بدا. ئەمە دەڵێم چونکە هەرگیز ئێسکم نەشکاندووە!!

بارودۆخی منداڵ لە تەمەنێکدا کە هەست بە شتی ئاسوودەبەخش و هەڕەشەئامێز و (خراپ)ی زەرەربەخش و (چاک)ی سوودمەند بکا، یەکێکە لەو گۆشەنیگا داپۆشراوانە ڕووەو واقعی ناهەموار چونکە یەکەم وانەی ژیانی لە پاڵپشتێکی ناو قوڕ و چڵپاوەوەیە و زۆربەی ئەوانەی دەیانبیستێ و

دەیانبینێ و درکیان پێ دەکا شتی ناحەزن و تەنانەت هەندێکیان ئازاربەخش و ڕووشێنەریشن. ئەو وانەیەی کە بە دوای یەکەم وانەدا دێ ئەو تێکەڵاوە بێزارکەرەیە کە لە هەموو جۆرە سەروسەکوت و ڕەنگی دژەیەک و تێکەڵاوی یەکترە.. شتێکی قێزەونی لە باسکردنەهاتووی تەمەنی پێش قوتابخانەم، کە ناکرێ بە سەر زەمانمدا بێ و ساڵانێکی دوور و درێژ بە هۆی ناهەمواری و ناشرینییەکەیەوە تلاومەتەوە... دوای ساڵێک لەو تەمەنە کیژێکم دیت لە گەڕەک دەرۆزەی دەکرد. بە دەم گریان و لەخۆدان و هەڵدڕاندنی بەرۆک و هاوارەوە، بە دۆڵی خوار شارەکەدا دەگەڕایەوە و چەندی پێی کرابێ قوڕ و پیسیی ڕووبارەکەی بە سەروپێتەڵاکی خۆیدا کردبوو: فڵانەکەس، لە ناو ڕەزی دۆڵەکەدا ئەتکی کردم.. نازانم دوای ئەوە چی بە سەردا هات. ئەو فڵانەش بۆ پشدەر ڕای کرد و دوای دوو ساڵ، وەک ئەوەی هیچ نەقەومابێ گەڕایەوە کۆیە. ئەو کیژە لە کوردستانی ئێرانەوە کۆچی کردبوو و خێزانی نەبوو و هەرچۆنێ بێ بزر بوو. ئەو دەمە لە سەراتایی قوتابی بووم. هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ هاتوهاواری ئەو کڵۆڵە بە زندوویی لە گویمدا ماوە. منداڵانی هەموو گەڕەکێک بە دەست زۆرداریی منداڵێکی بەهێزی نازڕاگیراوەوە زەلالەتیانە ئەگەرچی لە توانای جەستەیی و جلوبەرگدا جیاوازییەکی ئاساییشیان هەبێ. ئەو تەمەنە ناوبراوە مەترسی خۆی هەیە و ناکرێ بچینە ناو هەندێ لە بارودۆخەکانیەوە. [کتێبەکەی فرانە هاریس، ژیان و دڵدارییەکانم بخوێنەوە بە تایبەتی ئەو بەشەی کە باسی ڕووداوەکانی شەوانی نێوان هەرزەکارانی بەشی ناوخۆ دەکا، هەروەها ڕەفتاری یەکێکی بەهێز و ترسناکیان] باسی ژنەکانی باوک و ئەو منداڵانە کە دایکیان مردووە و هەموو پیاوێکی بەهێز توانای خراپەکاری هەیە: سەردەمێکی هەستیاری تازەپێگەیشتوان بە تایبەتی، چونکە شتێ نییە تەرازووەکەی ڕاگرێ. هەموو لادانیکی تەمەنی منداڵی و هەرزەکاری نەریتی خۆیان هەیە و تەمەنی داهاتووی هەرزەکار مۆر دەکا. ئەو شتە سەیرەی مێژوو لەو بارەیەوە دەیپارێزێ هەندی بەیتی ئەبو عەلای معەڕییە پیاو لە منداڵ ئاگادار دەکاتەوە و دەڵێ:

ئەگەر کوڕەکەت گەیشتە دە ساڵ
با نەچێتە حەرەمی ژنانەوە

ڕواڵەتی بەیتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە خەیاڵی ئەبولعەلا لە سەر گریمانەی نەریتی کوڕی دە سڵان لانەکەوتووە چونکە لە شیعردا گرنگی بە پارێزگاریکردنی مێینەی ناو خێزان دەدا لەدەستدرێکردنی هەرزەکاران و ئاگامان لە بارودۆخی سەردەمی ئەو نییە تا بزانین چۆن بەرانبەر منداڵ لە چوونە ناو ژنان تەمێمان دەکا و ئایە هەزارانیش بە تەنیشت (حەرەم)ەوە دیوەخانیان هەبووە؟ ئا ئخۆ قسەکە ئاڕاستەی خەڵکی پایەدار و دەوڵەمەندی وا کراوە کە توانیویانە (حەرەم)

له دیوەخان جیا بکەنەوە! له لایەکی ترەوە دەبینین ئەبوعەلا ئەوپەڕی بەزەیی بەرانبەر زندەوەران هەیە و دڵێ بەرەڵاکردنی کیچێک کە دەستگیرت کردووە لە درهەمێک خێری زۆرترە کە بە نەدارێکت دابێ! لەگەڵ ئەوەشدا کە کێچ خوێنی مرۆڤ و ئاژەڵیش دەمژێ و لە یاسای سروشتدا و دواتر لە یاسای مرۆڤدا، ڕێ دەدرێ شەڕ دوور بخەیتەوە بۆ بەرگریکردن نەک دەستدرێژی! بەڵام ئەبو عەلا ڕووەکیی بوو و گۆشتی نەدەخوارد و مەیلی بە لای لێکدانەوەی زانستانەی کەوندا هەبوو و پێشتر باسی سەرسوڕمانیمان کرد کە چۆن ژیان چۆتە (جەماد)ەوە و دەیتوانی بۆ ئاسانکاری ئەوە بداتە پاڵ خوای گەورە... ئەم دیاردە (عەلائیە) لە ململانێی نێوان کەونێک کە سەربەخۆ دەوامی هەیە و ئاشکراکانی و شاراوەکانی خۆی دەخولقێنێ و سەرەتا و کۆتایی نییە و خوایەک بە ئیرادەی (کون فیکون) ماددەی زندوو و مردووی دروست کردبێ. جیاوازی ئەو دوو بۆچوونە لە ناتەبایی ڕەهادان لە بچووکترین بچووک و گەورەترین گەورەدا یەکتر ناگرنەوە. باسی نەگونجانی ئەو لایەنە، کۆن و بەردەوامە و جێی سەرنجە زانایانی سروشت (یا عیلمانییەکان) لۆژیک و تاقیکردنەوە و دیاردەکانی سروشتیان لە بۆچوونی خۆیاندا بەکار هێناوە و ئاوها مانەوە تا مەسیحییەت بووە هێزێکی دنیایی و دەستی بە بەرپەرچدانەوە و سزادان کرد. ئیسلامیش هات و بۆ باوەڕپێهێنان دەستی بە دەمەتەقێ کرد.. ئەوجا باوەڕ و دەسەڵاتی لە خۆیدا کۆ کردەوە و بە بێ پشوودان دنیای بێباوەڕی داگیر کرد.. زاناکانیش لە پۆلی وانەگوتنەوە و دەمەتەقێدا تا ئاستی بەکافرکردنی ئەم و ئەو مانەوە، بەڵام کەسیان نەکوشت. کاتێکیش موعتەزیلە باوەڕی دەوڵەتیان بە دەست هێنا لە بازنەی زانست و بەڵگە و لۆژیکیان تێپەڕاند و فەتوای کوشتنی ئەوانەیان دەرکرد کە باوەڕیان بە بۆچوونیان نییە، بەڵام وەک مەسیحییەکان کاری ئیعدامکرنیان ئەنجام نەدا..

ئەو دێڕانەی سەرێ دەمانباتە سێ مەیدانەوە کە سێ قوتابخانە تیایاندا تێکدەئاڵێن [بۆ بەکارهێنانی قوتابخانە، داوای لێبوردن دەکەم] یا سێ مەیدانی شەڕ: مەیدانی یەکەم مەیدانی شەڕی نێوان دەوڵەتانە. مەیدانی دووەم ململانێی توندی نێوان دنیاییەکان و دینییەکانە. مەیدانی سێیەم ناکۆکی خوێناوی نێوان ئەو دینانەیە کە توانای بەرپاکردنی جەنگیان هەبووە. مەیدانی تریش هەن بە ژمارە زۆر و بە گۆڕەپان بەرتەسکن بە درێژایی سەدەکان هۆکاری ناکۆکی سنووردار بوونە [تەشەنەیان کردووە و دامرکاونەتەوە]. باوەڕی جیاواز لە سنووری یەک ئایندا یا ئایینی جیاوازی یەک نیشتماندا هەرگیز نەبۆتە هەوێنی پێکەوەژیان و ئەوەندە بەسە مەسیحی مەی بخواتەوە و موسوڵمان بە جۆرێ لە گوناهە گەورەکانی بزانێ، یا سەربڕینی مانگا ببێتە هۆکاری کوشتار لە نێوان موسوڵمان و هندۆسدا. نەختێ زیاتر تیایدا ڕۆدەچین دەبینین ئیسلام هاوسەرگیری ژنی موسوڵمانی لەگەڵ ناموسوڵمان و هاوسەرگیری پیاوی موسوڵمانی لەگەڵ دینی تردا، جگە لە

مەسیحی و جوو، حەرام کردووە. بە گوێرەی زانیاری من ناکۆکی نێوان موسوڵمانانی مەزەبە جیاوازەکان، لە ناکۆکی نێوان موسوڵمان و کەمایەتییە ئاینەکانی تر کە پێکەوە دەژیان زیاتر بوو. هۆیەکەش ئەوەیە کە ئەو کەمەئاینییانە مەترسییان کەم بوو و دەقی شەرعیش بۆ پارێزگاریکردنیان هەیە مادام شەڕانگێز نەبن. جیاوازی نێوان ئایدۆلۆژیە شۆڕشگێڕکانمان دیت و جێوازی نێوان ئەوان و قوتابخانە فکری و سیاسییەکانی ترمان دیت کە توندوتیژترین چەوساندنەوەیان لە دژی یەکتر بەکار هێنا و لە دەقی فەلسەفی شۆڕشدا مەودای لە ڕەگدا دەهێنانیان دراوە و واز لەوانەش ناهێنن کە هەڵوێستێکی دیاریکراویان نییە بەڵکو ڕەعیەتن و بۆ ژیان کار دەکەن و خۆیان داوە بە دەستی واقیعەوە، ئەوانەش ئازار دەدەن و بێزاریان دەکەن و ناچاریان دەکەن نارەحەتترین کار بە کەمترین حەسانەوە و کەمترین کرێ ئەنجام بدەن. لایەنیکی ئەو واقیعەمان لە نووسراوی لایەنی ڕووسی سەردەمی گلاستنوست و پرۆسترۆیکای دوای هەرەسی سۆڤیەت زانی و پێش ئەو نووسراوە نەمدەزانی واقعی ستالینی و بریجنێف تا ئەو ئاستە ئاژەڵی و دڕندانە بووە چونکە ڕووسیای قەیسەر هەرگیز نەگەیشتبووە ئاستی کەمێکی ئەو زوڵمەی لە خەڵکی کران، بیانووی لایەنگرانی لینین و ستالین و دوای ئەوان لەو مۆرفینە زیاتر نییە کە دەرویشە توندڕەوەکانی چەپایەتی دەیجوون. لە ڕاستیدا، کۆمۆنیزم لە ڕێگەی توندوتیژی گردەبڕەوە نەبوایە هەر لە سەرەتاوە لە ڕووسیادا بڵاو نەدەبووەوە. ئەگەرچی گریمانەی شتێ کە لە واقیعدا ڕووی نەداوە پێوەرێکی لاوازە بۆ بڕیاردان بە سەر شتێکدا، بەڵام پێم وایە لینین سەری بۆ ڕاگەیاندنی شۆڕشی بەلشەفی نەوی نەدەکرد ئەگەر خۆی سەرۆکی شۆڕش نەبوایە و بۆ ئەڵمانیاش شل نەدەبوو دەست لە ڕووبەرێکی بەرینی ڕووسیا بەردا بەڵکو هێزی کەسایەتی پاڵی پێوە دەنا تا بە ئیرادەیەکی پۆڵاییەوە بەرەنگار بوایەتەوە. باوەڕی ڕەهای لینین بە خۆی دوو کاریگەری هەبوو: یەکێکیان سەپاندنی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بە سەر شۆڕشی ڕووسیادا لە دوو سەردەمی مێژوویيدا [بە پێی زاراوە سیاسییەکان: لیبراڵی و سۆسیالیزم]. دووەم کاریگەری ئەوەیە، لەبەر ئەوەی شۆڕشی پرۆلیتاری لە سەر بنخان و بانخانی بەهێز یا نیوەبەهێز بینا نەکرابوو بە هەڵچوون و سەپاندنی ویست و دروشمی توندڕەوانەوە، شانبەشانی توندوتیژی شۆڕشگێڕانەی بێبەزەییەوە هات و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بەرهەمە نەرێتییەکەی دەرکەوت چونکە ژیانی سیاسی بەلشەفی، هەروەها ژیانی کۆمەڵایەتی لەو چوارچێوەیە دەرچوو ئەو شێوازە ژیانە بی کە مرۆڤ دڵی پێی خۆش بێ و یاساکانیش ئەوە نەبوون بەربەستی توند بن بەرانبەر ئارەزووی شۆڕشگێڕی سەرەوە و کۆمەڵگەی بەلشەفی بووە مەیلەو سەربازگە و ڕاهێنانی لە سەر ئەوە دەکرد گوێلەمست بن بەرانبەر یاسا توندوتیژەکان و کۆتایی شۆڕشەکەش بەو شێوەیەی کە دەستکردی شۆڕش خۆی بوو نەک دوژمنێکی دەرەکی یا کارەساتێکی سروشتی یا شۆڕشێکی ناوخۆیی بە سەر بەلشەفیدا هات. لە ئاوێنەی پێچەوانەوە کە بۆرژوای نەفرەتی و چینایەتی تاوانبار و بڕیاردراو بە

نەمانی بە کەیفی خۆی پێدەکەنێ، ئەوەش بە بەلشەفی نا بەڵکو هاوتەریبی سروشتی مرۆڤ کە ئەمەریکییەکان لە کاتی دەستبەتاڵیدا شتێ نابیننەوە گەمەی پێبکەن ئابڕووبردنی سەرۆکی کۆمار نەبێ کە دڵدارییەکەی تەنانەت لە ناو قازییەکانیشدا بڵاوە کە دادگایی خودی کلنتۆن دەکەن. لە نەبوونی ئوسوڵدا بەغداییەکان مەسەلەیەکیان هەیە: ڕدێنی پاشا لەماڵی ئێمەداگسکە. بەڵام ئەمەریکییەکان لە ڕدێنیان ڕەتدا و گەیشتە کەرامەت و شەرەفیش...

ئەوەی لە بارەی سێ مەیدانەکە و ناتەباییان و شەڕی نێوانەوە باس کرا جێدەستی لە هەموو بەشێکی کۆمەڵگە چ وەک گشت و چ وەک تاک دەمێنێ و هەندێ لەو کارەساتانە پیرۆزیی تایبەتی دەبێ وەک ئەوەی خوای گەورەوە فەرمانی لە سەر دابێ[24] یا یەکێ لە کەسە پیرۆزەکانی بواری سیاسەتی شۆڕشگێڕی وەک شتێکی گەنیو لایبەرێ یا یەکێ لە پیاوچاکە خواناسەکان بە لایەنگرانی خۆی پیشان دابێ: دەبینم لە ڕووی ناچارییەوە ئەوەی یەکێ لەو سێ جەوهەرە ڕەت بکاتەوە دەبێتە ئەرک بە سەریەوە کە ڕقی لێی بێ.. ئەمە بۆ تەواوکردنی سەرجەمی باساکە لە هەموو ڕوویەکەوە دەڵێم چونکە ئەوە بەس نییە مرۆ بە خۆگێلکردن لە کارەسات بە سەریدا بگوزەریت و پشتگوێخستنی بۆ خۆلادان لە خراپییەکانی بۆ مرۆڤایەتی کوفرە. لە ئیسلامدا فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە: هەرکەسێکتان خراپەکارییەکی دیت با بە دەستی خۆی بیگۆڕێ و ئەگەر نەیتوانی بە قسە بیگۆڕێ و ئەگەر ئەوەشی پێ نەکرا با لە دڵی خۆیەوە پێی ناخۆش بێ و ئەمەیان کەمترین کارە. ئامادەنەبوونی کەسێک لە مەجلیسی پڕوپووچ و قسەی سووک و غەیبەتکردن ڕەنگە لە ڕووی ناڕازابوونەوە بێ. قەڵەم سەرسامە لە گەڕان بە دوای کاری سوودبەخشدا چونکە لە تێکەڵاوی و دابڕانی ئەو سێ مەیدانەوە خەسارەتەکە گەورەیە و بە داخەوە لە یەکەم ڕۆژەوە خۆی بە سەر واقیعدا سەپاندووە، لەگەڵ سەرنجی ئەوەدا کە جەنگ هەرە کۆنەکەیانە و بە دوایدا مەیدانی ناتەبایی نێوان هێزە دنیاییەکان و هێزە دینییەکان دێ. دوای ئەوە مەیدانی ناتەبایی نێوان ئاینەکان دێ کە بوو بە خاوەنی دەسەڵات... ئەو شەڕەشی کە تیایدا بەرانبەر لە یەکتر دەگیرێ، هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوامە لایەنێکی گرنگی ئەوانە سەرف دەکا کە پەیوەندی بەسوودیان بە مرۆڤەوە هەیە و مەسرەفی شەڕ و وێرانبوونی بیناسازی و لەناوچوونی خەڵکیشی دەخرێنە سەر. جێی سەرنجە کە چالاکی ئیسلامی هەرە بەهێز لە ناو بزووتنە دینییەکانی ئێستادایە و ئەوەی تواناشیان زیاد دەکا ئەوەیە کە زۆرینەیان، نیشتمانەکانیان دوورن لە شارستانەتی و پیشەسازی و هەموو سەرچاوەیەکی پێشکەوتنەوە کە جۆرە بەربەستێک لە نێوان توندوتیژی و ئەو ئاسوودەییە دادەنێ کە ژیانیان پێ جوان دەبێ. خەڵکی بەغدا لە 14ی تەمموزی 1958دا کۆشکەکانی مەلیک و ماڵەکەی نووری سەعدیان ڕووخاند و پەیکەری یەکەم پاشایان ڕماند [پاش ماوەیەک دروست کرایەوە] هەروەها پەیکەری جەنەراڵ مۆد. ئەگەر لە داهاتوو و

ڕووداو و کارەساتە ناوخۆییەکانیان بزانیبا و بیانزانیبا لە دەرەوەی وڵاتدا شەڕ دەکەن بۆ پەنای ئاسوودەیی هەڵدەهاتن... هەموو مرۆڤێک بە نییەتێکی پاکەوە خوێن و چالاکی خۆی پێشکەش کرد و پاشان کاروبار وا ڕۆیشت کە نیشتمانپەروەر تا ئاستی کوشتن و بەخائینکردن دەستی بە سەر خەڵکدا بڕوا و خوێنەکەی بە فیڕۆ بچێ و ئەگەر پاشەڕۆژی بخوێندبایەوە خۆی بۆ گیانفیدایی هەڵنەدەبژارد.. دەیان و سەدان و هەزاران کەس لەوانەی لە دژی پەیمانی بەغدا بەشداری خەباتیان کرد دواتر بە دەستی ئەوانە کوژران کە پەیمانی بەغدایان هەڵوەشاندەوە. لە ڕاستیدا، جیهانی نەتەوە دواکەوتووەکان گەمەیەکی سیاسی وا دەکا بەرەو سڕکردنی هەست دەچێ لەگەڵ خەڵکدا و دەسەڵاتدار بەوە ئاسوودە دەبێ چونکە مردوو داوای هیچ ناکا و ئەگەر تەنگوچەڵەمەش بەسەر بچێ و چنگی دەسەڵاتدار شل بێتەوە یا دەسەڵاتی لەناوچوو ئەو خاوخلیچکانە دەبنە بەرانی شەڕەقۆچ و دوو ڕۆڵی دژ بە یەک دەبینن: 1 ـ ڕۆڵی خەڵکی خۆبەدەستەوەدەر لە کاتی بوونی دەسەڵاتدارێکی توندوتیژدا. 2ـ ڕۆڵی تاڵانچی و جەردە و وێرانکەر ئەگەر دەرفەتی هەبێ. ئەو بەزمە بە درێژایی سەردەمی دواکەوتن دووبارە دەبێتەوە: خۆدانە دەستەوەی بەهێز و دۆزینەوەی فرسەت بۆ تاڵانی و ڕاوڕووت. ئەوەی نەترسانی خستە دڵی هەژارانەوە تا تاڵان بکەن تاوانبارکردنی بەربڵاوی بۆرژوا بە خوێنمژیی ڕەنجدەران. ئەم دیدەش ڕەنگە بۆ شتێکی زۆر گرنگ ناهۆشیارانە بێ چونکە ئەگەر ڕەنجەدرێک خۆی ڕەنجدەرێکی تری وەک خۆی بەکرێ بگرێ ئەو کرێیەی دەداتێ کە لە سەری پێکدێن و لە بازاڕ باوە، جا یا دەبێ ئەو ڕەنجدەرەش وەک خەڵکی تر خوێنمژ بێت یا ئەوانی تر خوێنمژی ئەو و ڕەنجدەرانی تر نین و وەلانانی ئەم ڕاستییە زەقە غەفڵەتێکە نیەتێکی خراپی لە پشتەوەیە بەرانبەر ئەو جەماوەرەی لەگەڵ ژیاندا هەڵسوکەوت دەکەن و لە پێشیشیانەوە ڕەنجدەران خۆیانن، لە ڕاستیدا چاک وایە ناوی بنرێت غەفڵەت و چاوپۆشی و فێڵ و لێزانی چونکە کرێکار و بەقاڵ و تەڕاح و.. و.. هەموویان (لە پەرۆشیدا ڕۆژهەڵاتین) چونکە بازاڕ کۆمەڵگەیەکە بەرگەی دڵنەوایی و مێوانداری ناگرێ و مەیدانێکی ئاشکرای بێ بەربەستە. وەزیر و فەڕاش، هەردووکیان لە ژێر کاریگەری نرخی بازاڕدان و وا نەبێ بازاڕ نە دادەمەزرێ نە بەردەوام دەبێ. بازاڕ تا ئاستی قێزبوونەوە پلەی جیاوازی هەیە و بۆرسە بازاڕێکی لووتبەرزە و لەماوەی چەند سەعاتێکدا ملیۆنێر تیایدا ئیفلاس دەکا و مامناوەندی دەبێتە ملیۆنێر و خۆشی نازانێ چۆن وای لێ دێ. لە ڕاستیدا، (ئەدەبیات)ی بۆرسە سەری تێدا بەگێژ دێ و هەندێ لایەنی هەیە لەوانە شاراوەیە کە ئاڵوێری تێدا دەکەن و کڕین و فرۆشتن وەها بڵاو بۆتەوە لە دووریی هەزاران میلەوە لە ڕێی پەیوەندی خێراوە کە هاوتەریبی خێرایی بەدەستهێنانی زانیاری بۆرسە و بانکە زەبەلاحەکانی دنیایە، لە بارەی دابەزین و بەرزبوونەوەوە ئەنجام دەدرێن... ئەو خێراییە خۆی کە تایبەتمەندی ئەو کارانەیە کە لە ئاستی ئاسایی تێپەڕاندووە، دنیای تایبەتی خۆی زمان و پێوەری خۆی هەموو شتێکی تایبەت بە خۆی و بە پێی

پێویست دادەهێنێ: لە پێویستی سەرچاوە و پەراوێز و کەرەسەی خاو و دروستکراو و خۆراک و بەرگ و قوتابخانەی منداڵان و سەرچاوەی ئاو و کارەبا و دادگەی داوەری... هتد لە کۆمەڵگەی بەشەر دانابڕێ، بەڵام لە کڕینی شێلمی بازاڕەوە، ئەوەندەی دووریی کەشتییە ئاسمانییەکان لە عارەبانەی دوای ئەسپەوە دوورە... گەرمکەرەوەی کارەبا لە مەقاڵەوە بە خۆی پووش و دووکەڵیەوە دوورە کە پرووشکی لێ دەپەڕێتە سەر لۆکە و دەیسووتێنێ. ئەو جیهانی خێراییە جیهانێکی مامناوەندی لە نێوان خۆی و بازاڕ و کێلگەی سنووردار‌دا بە پێی پێویستی هەردووکیان بە یەکتر، دەخولقێنێ و خەریکە پەیوەندی نێوان خۆی و خەڵکی ئاسایی دەپچڕێ و لێرەوە بۆشاییەکی کۆمەڵایەتی و سەرگەردانییەکی مەیلەو شارستانی دروست دەبێ و ئەگەر جیهانی خێرایی دووچاری قەیران ببێ کتوپڕ خاوەکان دەبینن بانک ئیفلاس دەکا و بازرگانی کرژ دەبێتەوە و مانگرتن توندوتیژ دەبێ و وەزارەتەکان دەست لە کار دەکێشنەوە: ئەو دابڕانە زندووەی نێوان زەبەلاحەکانی دارایی و خەلقەندەکانی تری خوا خەڕەندێکی مەعنەوی لە نێوان هەردوو لا هەڵدەکەنێ و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ هەوڵێک لە ژیانی گشتیدا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە نییە چونکە: لەبەر نەبوونی پەیوەندی پیشەیی لە نێوانیاندا چ دیداریش لە نێوانیاندا نییە مەگەر لەو ئاستەدا بێ کە لە نێوان زەبەلاحێک و خزمەکارێکدا دەبێ کە ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ و لە ناو تاکسی و دەم زەریادا یەکتر نابینن - ڕووی مەترسی ئەو دابڕانە زەحمەتیی دیداری نێوان لاوازەکان و زەبەلاحەکانە بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک کە پەیوەندی بە سەرجەمی خەڵک و بەرژەوەندییانەوە هەبێ و بە گوێرەی کێشە و بەرژەوەندییە گەورەکان شتگەلێکن بە ئاسانی چارەسەر دەکرێن بەڵام بۆ خاوەن داهاتی سنووردار ئەوپەڕی گرنگییان هەیە. دەتوانی، چۆن تەماشای دوو دەستە دەکەی کە یەکێکیان بە ژمارە زۆر و بە سامان کەمن ئەوی تریان بە ژمارە کەم و بە سامان زۆرن بە دوو زمانی جیاواز قسە دەکەن و دەمەتەقێیان لە نێواندا ناکرێ یا کەسانی کەڕ و لاڵن، ئاوها تەماشای بابەتەکە بکەیت.

وای دەبینم باسکردنی سەرنجێک بە سوود بێ و تەنانەت گەیاندنی ئەمانەتیش بێ بە خوێنەر کە بەر لە چل ساڵ زیاتر لە دۆستێکی لێهاتووم بیست [ئێستا لە بیرم نەماوە کامە هاوڕێم بوو] گوتی: هۆکاری شڵەژانی گەلی فەرەنسا لە ڕۆژانی پێش بەرپابوونی شۆڕشەکەیاندا ئەوە بوو چینە باڵاکان هێز و دەوڵەمەندی خۆیان دەردەخست و سواری گالیسکەی نایابی دوای ئەسپی ڕەسەن و جوان دەبوون و جلوبەرگی ئاوریشم و حەریریان لەبەر دەکرد و خزمەکار و چاودێریان بە دەورەوە بوون و خۆیان بە سەر خەڵکی هەژاردا بادەدا و بەو مەزنایەتییە زیادەڕۆییە بۆشەیان خەڵکیان بێزار و تووڕە دەکرد لە کاتێکدا چینی ئۆرستوکرات و پارەداری بەریتانیا لە یانە تایبەتییەکانیاندا خۆیان بزر دەکرد و بە تەواوەتی لە چاوی خەڵک پەنهان بوون و بە پێچەوانەی ئۆرستکراتە

فەرەنسییەکان کە زۆرداریيان یەکێ بوو لە هۆکارەکانی شۆڕشی کۆتایی سەدەی هەژدە، کەسیان بێزار نەدەکرد.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئۆروستوکراتەکان لە فەرەنسا و بەریتانیا لە چینی سەرمایەدارەکانی ئەو سەردەمە نەبوون. جێی سەرنجیشە کە دانیشتوانی بەریتانیا لە سێ نەتەوە پیکهاتبوون، سکۆتلەندی و ئینگلیز و ویلزییەکان کە بە ئەنجامی لێکتێگەیشتنی تەواو گەیشتن تا ئەوەی ویلزییەکان ئەو ئۆتۆنۆمیەیان ڕەت کردەوە کە لە لایەن دەوڵەتەوە خرایە بەردەستیان چونکە خێریان لە تێکەڵاوی زیاتر بوو لەوەی لە ئۆتۆنۆمی دەستیان بکەوێ. لە مێژووی ئینگلیزدا شۆڕشی کرۆمویل هەیە کە ماوەی بیست ساڵ دەسەڵاتی پاشایەتی نەهێشت و کاتێ کرۆمویل مرد ئینگلتەرا گەڕایەوە سەر پاشایەتی. (هێنری)ی هەشتەم زۆردارێک بوو و قینی لە کەنیسە و پەرلەمان بوو... یەکێ لە ژنەکانی ئیعدام کرد کە (ئان)ی شازادە بوو و ڕۆماننووسێکی ئینگلیز لە ڕۆمانیکیدا بەم عیبارەتە باسی دەکا کە لە ئینگلیزییەوە گوازراوەتەوە: مەقسەڵەکە بەربووەوە و لەگەڵیدا بەرزترین و جوانترین سەرێ بەربووەوە بوویتە تاجی سەری مرۆڤایەتی هەموو سەردەمەکان! ئەم کۆمەڵگە مرۆڤایەتییە تێکەڵێکی سەیرە کە خۆی دووچاری بەدگۆڕان دەکا و وا دەکا شیاوی ئەوە بێ خەسڵەتی (نەخۆشخانە..)ی پێ بدرێ.

دابڕانی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی یەک کۆمەڵگە لە یەکتری یەکێکە لە هۆکارە ڕاستەوخۆکانی لایەنێکی گرنگی نائاسوودەیی کۆمەڵایەتی و باسیش باسی کۆمەڵگە پێشکەوتووە شارستانەکانە و جۆرە پڕکردنەوەیەکی ئەو بۆشاییە ناوبراوە دەکرێ: زاڵبوون بە سەر ئەو لایەنانەدا کە یاسا و سستەم بە سەریاندا تێدەپەڕێ و شتێ بکرێ کە لە لێکحاڵیبوون نیزیک ببنەوە و ئەگەر بە بارودۆخی جیهانی کلۆڵی سێیەمی ئێمە پێوانە بکرێ لەسەر زەوی دەبێتە بەهەشتی خوا. دووەم کار دەنگدانە بە ئەندامانی پەرلەمان هەر چەند ساڵ جارێک ئەوەش بە بێ فێڵ و خەڵەتاندن و شتی لەو بابەتانە. ئەوجا کۆبوونەوەی نوێنەرانی هەموو چینەکان لە بن یەک بنباندا ئەنجام دەدرێ تا یاسا و سستەم دابڕێژن و دەمەتەقێیان لە سەر بکەن و ڕا و بۆچوون بگۆڕنەوە و بەوەش جۆرە ئولفەتێک لە نێوان هەموو چین و توێژەکاندا دروست دەبێ و یەکێ لە بەرهەمەکانی، کەمبوونی بشێوێنی سیاسی ناوخۆیە لەو دەوڵەتە شارستانیانەدا بە تایبەتی دوای ئەوەی کۆمۆنیزمی ڕژاوای ئەوروپا دەستبەرداری بۆچوونی شۆڕشی چینایەتی بوو و دیموکراتی هەڵبژارد چونکە فەلسەفەی شۆڕشگێڕی خۆی لە خۆیدا و بە بێ تیژکردنی چەقۆ و دامەزراندنی مەقسەڵە بەسە و لێشی زیادە بۆ ئەوەی هەموو دەنگێک بخنکێندرێ لۆمەی ڕەفتارێکی شۆڕش بکا ئەگەرچی هەموو کەونیش وێران بکا. ئەگەر لە عورفی ئاینەکاندا خوا مافی ئەوەی هەبێ زەوی و ئەو گایە کاول بکا کە لە

بنی زەودایە و هەروەها حەوت فەلەکی هەڵسوورێنەری حەوت ئەستێرە، شۆڕشی چینایەتی تەواو سەپاویش مافی بە سەر کۆمەڵگەی مرۆڤ و ڕاستییەکانی کەونەوە هەیە فوو لە ژیان بکا... قوڕ بە سەر ژیان!

دوورکەوتنەوەی مەودای نێوان لووتکەی زانست و شارستانی لە بنەبانی نەفامی هەمەلایەنەی خەڵکی جیهانی سێیەمەوە یەکێکە لەو کێشانەی کە دەرمانی ڕاستەوخۆیان نییە وەک کۆرپەڵەی هەناوی دایک لە یەکەم دروستبووندا کە دوای نۆ مانگ نەبێ ڕووناکایی نابینێ بە مەرجێک ئەو کۆرپەیە ساغ بێ و نەکەوێتە ژێر کاریگەری لەبارچوونەوە. مرۆڤی نەخوێندەوار پێویستی بە مامۆستای لێهاتوو نییە تا مەزەندەی لە سەر ڕاستییە کۆمەڵایەتی و کەونیەکان لابەرێ چونکە ئەوا هازاران ساڵە پێی وایە هۆکاری بوومەلەرزە ئەوەیە گایەکە، بە زەوی نێوان شاخەکانیەوە سەری ڕادەوەشێنێ، ئیتر چۆن بوومەلەرزە نابێ؟!

گوتمان، بە ڕاستیش گوتمان کە خولقینەری جیهانی شێتان مرۆڤ خۆیەتی، وەک چۆن خولقێنەری شارستانەتی خاوێن و زانست و هونەر و زیادییە نایاب و پڕ لە جوانکارییەکانیش مرۆڤ خۆیەتی. قسەکەمان چڕ کردەوە و گوتمان ئەوەی وا لە مرۆڤ دەکا ببێتە هۆکاری چاکە یا هۆکاری خراپە لە یەکەم پلەدا عەقڵەکەیەتی بەو بەڵگەیەی ئەگەر عەقڵەکەی بسڕێتەوە [وەک شێتبوون] ئەو هەستە غەریزیانەش لە دەست دەدا کە حەیوانی بەستەزمان هەیەتی. شێتیش پلەی خۆی هەیە، هەندیکیان توندە و بەشەر دادەگرێتە ئاستی سفر لە جیاکردنەوەی شتەکاندا لە ڕووی سوود و زەرەر و جوانی و ناشیرینییەوە لە کاتێکدا گیاندارێک تووش نەبووبێ بە ڕوونیی و بە حوکمی چەقی غەریزە لە جێی عەقڵ دەزانێ چی بەکەڵکە و چی بێکەڵکە. لەو ڕاستییەوە بەو حەقیقەتە مرۆییە دەگەین کە پەیوەندی بە هاوسایەتی عەقڵ و غەریزەوە هەیە چونکە ئاشکرایە کەسێک عەقڵی بشێوێ غەریزەکانیشی دەشێوێن ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی پەیوەندی تێکەڵبوون لە نێوان عەقڵ و غەریزەدا هەیە ئەوەش پەیوەندی جۆرە دەسەڵاتدارییەکە کە عەقڵ خۆبەخۆیی غەریزە جڵەو دەکا تا ئەوەی ئەگەر خواستی غەریزە لە مرۆڤدا بۆ شتێک کە حەزی پێیەتی بەهێز بوو و عەقڵ دەرەقەتی نەهات دەسەڵاتی عەقڵ بەرەو بێلایەنی دەچێ، ناڵێم تێکشکان، چونکە عەقڵ وەک ڕێنیشاندەر بۆ شتەکانی تر دەمێنێتەوە. و عەقڵ یەکێکە بەڵام غەریزە زۆرن... لێرەدا سەرنجێک هەیە کە دەبێ ئاشکرای بکەین ئەوەش ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ لە شتێکەوە ئازاری پێ بگا، وەک ئەوەی دووپشکێک یا مارێک یا ئاوی گەرم یا ئاگر بە جلوبەرگەکەیەوە بنووسێ یا بروسکەیەک بینایەکی لەرزاندبێ یا لافاوێک بیناکانی وێران کردبێ... هتد، ئیدی لەو شتەیان دەترسێ کە ئازاری داوە و ئەوانی تر نا کە تووشی نەهاتوون. تەنانەت شێتم دیوە کە سەگی دڕ

پەلاماری داوە ترسەکە لەو سەگە و لە سەگی تر لە لای خۆی دەپارێزێ و جگە لە سەگ گوێ بە شتی تر نادا مەگەر گیاندارێکی وەک گورگ بێ کە شێوەی لە سەگ دەچێ و لە شتە ترسهێنەرەکانی دی وەک بروسکە بۆ نموونە ناترسێ. [ئەم قسەیەم زۆر بە وردیی نییە چونکە دڵنیا نیم لەوەی کەشێت تەنها لەو گیاندارە دەترسێ کە ئازاری داوە. جگە لەوەش شێت کە دەترسێ دیاری عەقڵ زادی ترسی دەداتێ نەک غەریزە. ئەم مەسەلەیە لە لای من بە بێ وەڵام دەمێنێتەوە: کەسێ عەقڵی لە دەست دابێ چۆن لە هەمان ئەو گیاندارە دەترسێ کە ئازاری داوە ئەگەر عەقڵ خۆی زاد بە هەست بدا؟ چار نییە دەبێ چاوەڕوان بین تا پرس بە پسپۆڕێک بکەم]

تاقیکردنەوەیەکم لەگەڵ ئازاردا هەیە کە هەندێ لایەنی بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە: لە سەرەتاکانی سییەکاندا دووپشکە پێوەیدام و لە مردنی نێزیک کردمەوە: لەو دەمەوە بە بینینی دووپشکە هەست بە قێزبوونەوە و تەنانەت ترسیش دەکەم بەڵام لە مار ناترسم و تەنانەت شەوێک لە سەر پێخەفەکەم درێژ ببووم، مارێک بە سەرمدا تێپەڕی و هەستم بە ساردایی جەستەی لە سەر قولەپێم کرد و هەستێکی وام نەبوو مجێزم تێکبدا و تەنانەت خۆم بە لایەکی تریشدا وەرنەسووڕاند و تەنانەت چەند جارێک لە چەند شوێنی جیاوازدا بە ڕاکردن دوای مار کەوتووم و کوشتوومە، جا یا بە بەرد یا بە دار. لە کوشتنی دووپشکەدا جورئەتی تێکەڵ بە سڵکردنەوە دەخوازمەوە.

سەیر ئەوەیە خەڵک بۆ تەرککردنی ڕەفتارێک کە پەشیمانی بە دوادا بێ تەمێی یەکتر دەکەن بەڵام لە سواربوونی مەترسی بەرەو تەماح چ کەمتەرخەمی ناکەن. بۆ بەزەییهاتنەوە تەمێی یەکتر دەکەن و پێستی یەکتریش کەوڵ دەکەن بەو شێوەیە تا کۆتایی لستەیەکی دوورودرێژی دژبەیەکی وەسێت و نەسیحەتی زارەکی قامووسیکی گەورەی ڕەفتاری ڕووخێنەری چاکەکاری و دوای ئەوە سەرسوڕمانەکە بەوە زیاتر دەبێ کە خاوەننەسیحەت بەپێچەوانەوە ڕەفتار دەکا، هەست بەو گاڵتەجاڕییە ساکارە ناکا کە بێئاگایانە، لەو لادانانەوەی کە زۆربەی بارودۆخیان داگیر کردووە، ئەنجامی دەدا. لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو دەبێ و نوێژەکانی لە کاتی خۆیاندا دەکا و لەوەیە خێر بە هەژارانیش بکا بەڵام زمانی بە ناشرینترین وشە وەردەسووڕێنێ و بە هۆی ڕاهاتن و ئولفەتگرتنەوە بەردەوامیش دەبێ و لەوەیە بۆ شاردنەوەی شتی ئاشکرا بەرانبەر هەموو بیسەرێک و بینەرێک زیادەڕۆییش بکا. لە ڕووی دەروونییەوە ئاسوودەیە و هەست بە شڵەژانی ناخی خۆی ناکا کە پێچەوانەی خۆیەتی و هەر دەڵێی هەر یەکە لەو دوو دژبەرە بە ڕێی خۆیدا دەڕوا و نە تووشی ئەوی تر دەبێ و نە پێی دەگا. خەڵکی زیرەک و ڕۆشنبیر لەو ئافەتەوە دوورن.کێشەی ئەوەی دووچاری دەردەدرۆ بووە ئەوەی کە نەخۆشییەکی دەروونییە و چاری نییە: لە ژوورێکی ئوتێلدا، لە

بەغدا تووشی یەکێکی لەو بابەتە بووم مێشکمی پڕ کرد لە درۆی یەک بە دوای یەکدا و منیش بە بێدەنگی باوەڕکردنی خۆم ڕادەگەیاند. ئەوجا نەخۆش کەوتم، بەو خودایە ئەو تووشبووە بە دەردەدرۆ بە جۆرێ چاودێری دەکردم مەگەر دایک ئاوها چاودێری منداڵی خۆی بکا. خوا لێی خۆش بێ، سێ شەو شەونخوونی کێشا. با پێت بڵێم من بە بێ ڕیا خۆم تاقیکردۆتەوە و خۆمم دی کە نەمدەتوانی چواریەکی ئەو چاودێرییە ئەنجام بدەم کە ئەو لەو میحنەتەمدا بە منی بەخشی..

زیانی نییە ئەگەر بە سەر دیاردەیکی تایبەتی ژیانی مرۆڤدا ڕەت بین [بە پێی ئاگاداریم]. هەندێ ژیان، وەک بزانم، پەیوەندی بە نەوەوە هەیە و بە دەم هەستکردنەوە بە چاکە و خراپە کاری خۆی ئەنجام دەدا و نێزیکترین تاقیکردنەوەی ئەوە پەنابردن بۆ دزی لە کاتی نەبوونیدا شەرمکردنی لە فڕاندن و عەیبدەرکەوتن کەمترە و دز هەیە کاتێ هەبوو بووە پارەی ماڵە دزراوەکەی گێڕاوەتەوە. خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب لە ساڵی گرانیدا سزای دەستبڕینی وەستاند و ئێمەش لە سەردەمی لادانی سەردەمدا چەند پێویستیمان بەو پیاوەیە و لە کۆنەوە گوتراوە (بلغ السيل الزبى ـ گەیشتۆتە تین). لە قسەی پێشینانی عارەبدا هاتووە: شەرم بەربەستی ڕزق و فەسادییە! منیش ئەوەی بۆ زیاد دەکەم کە شەرم لە هەندێ بارودۆخدا هەندێ زمان دەبەستێ نەک لێکدانەوەی وای بۆ بکرێ کە بە دووی سوودی تایبەتییەوەیە [ئەوە لە سنووری خواستی ڕزقدا و لە بەرینکردنی سنووری سووددا وەک ئەوەی یەکێ داوای شایەدی لێ بکرێ بەڵام لە ترسی ئەوەی بە لایەنگریی خاوەن دەعوا لێک بدرێتەوە، شایەدی نەدا]. لە ڕاستیدا، ئەو بارودۆخە جیاواز و دژبەیەکانەی کە مرۆڤ پێیاندا ڕەت دەبێ جێدەستیان لە کەسایەتی تاکی مرۆڤدا بەجێ دەمێنێ و خەڵکانێک دەبینین لە ئەنجامی زامدارکردن و شەرمەزارکردن و سزادانی سەردەمی منداڵیدا دووچاری زمانگرتن بوونە و بەوەش بەشێکی گرنگی خۆشییەکانی ژیانیان لەدەست داوە. هی وا هەیە دڵی بە لای کیژێکدا چووە و لە ترسی ئەوەی ڕەت بکرێتەوە بە کیژەکەی نەگوتووە و سۆزی خۆی لە سینگی خۆیدا گۆڕ کردووە و تەنانەت لە هەموو جێیەکدا خەڵکانێک هەن لەو دەستپێکردنە پەکیان کەوتووە کە خەڵکانی تر دەشیکەن چونکە لای خۆیەوە دڵنیایە بەرەو ئەو پێویستییە بچێ دەکەوێتە بارودۆخێکەوە کە دەرەقەتی نایێ. ئەم بارە بە درێژایی تەمەن دەمێنێ. ڕاستە هەندێ منداڵ لەگەڵ لەدایکبووندا زمان دەگرن و کەس لۆمەیان ناکات بەڵام شکاندنەوەی منداڵ و عەیبدارکردنی لە بەردەم خەڵکدا تاوانێکی قورسە و تێکەڵی بێعەقڵییە. هەندێ باوک دووچاری جۆرە سادییەک بوونە و لەگەڵ منداڵی خۆیاندا دڕندانە توندوتیژن و بەرانبەر خەڵکی تریش لە ترسی کاردانەوەیان، لە بارێکدان داوە مووەکەی معاویە ناپسێنن: ئەو منداڵە باسکراوانەش لە زۆربەی حاڵدا زمانپاراوە لە دەست دەدەن و ناتوانن دەستپێشخەر بن و لە ئەنجامدانی کارێک بە تەواوەتی، کەمتر پشت بە توانای خۆیان دەبەستن. من کەسێکم، بە داخەوە،

ئەگەرچی سۆزی زۆرم بۆ منداڵی خۆم و منداڵان بە گشتی هەیە بەڵام توانای هاروهاجییانم نییە ئەگەر بارودۆخی ماڵ و ژووری میوانداگیر بکەن.. نەوەکانم لە سەرەتای تەمەنیاندا ئامێزی منیان پێ خۆشتر بوو لە ئامێزی دایکیان. بەڵام منداڵانی دراوسێ کە ڕێی شێواندنی ژووری میوانەکەمیان نییە، لەگەڵیاندا وەک مێو و ڕۆنم تا ئەوەی دوو ـ سێ ساڵان، ئەگەر لەبەر چاویان لابکەوم و بچمە ماڵەوە بە دووامدا دەگرین... ئەو نموونانە تاقیکردنەوەی تاقەتی منیان تێدایە بەر لەوەی تاقیکردنەوەی منداڵان بێ... توندوتیژی زەرەربەخش و ناحەزە و بە قەدەر بێدەسەڵاتی کەسێک لە بەرگریکردن لە خۆی توندوتیژی لەگەڵیدا زیاتر زەرەری پێ دەگەیەنێ و ئەوەشی لەگەڵیدا توندوتیژە، زوڵمەکەی زیاتر دەبێ و زیاتر لە مرۆڤی دڵنەرم دوور دەکەوێتەوە: دەبێ چ زەرەرێک بە دونیاویست بگا ئەگەر مەرایی لە بەردەم بەتوانای زۆرداردا کەمێ کەم بکاتەوە و هەندێ گرنگی بە لاوازی بێدەسەڵات بدات؟ لە یەکێ لە بازنەی هەڵبژاردنەکاندا[25] ناوی پاڵێوراوان بڵاو کرابوونەوە و لە ناویاندا ناوی (عەلی حموود) هاتبوو. پایەدارێکی هەولێر پەیوەندی بە خوالێخۆشبوو عەلی مەحموود کاکەخانەوە[26] لەو ئوتێلەدا کرد کە لێی میوان بوو و پیرۆزبایی هەڵبژاردنەکەی لێی کرد، ئەویش سوپاسی کرد و گوتیشی کە ئەو پاڵێوراوە (عەلی مەحموود)ی فلانی پیاوماقووڵ و سیاسەتمەداری بەغدایە. ئەوجا پێشکەشکەری پیرۆزباییەکە ئاراستەی پیرۆزباییەکەی گۆڕی و بە شێوەیەکی گەرموگوڕتر پیرۆزبایی کرد. ئەوە یەکێکە لە خەتەکانی ئەوپەڕی تەماح و ئاواتی دنیاویستی لە مرۆڤدا دەوروژێ چونکە ئەو پیرۆزباییە لە بەر دوو هۆ دەمارێکی ئەو کەسە نابزوێنێ کە پیرۆزبایی لێ دەکرێ: یەکەمیان ئەوەیە کە دەزانێ ئەو پیرۆزباییە ڕووکەشە، دوومیان ئەوەیە دووبارەکردنەوەی هەڵگرتنی تەلەفۆن بۆ وەڵامی پیرۆزبایی، خاوەنەکەی بێزار دەکا و ئەگەر بیر لەوە نەکاتەوە ئەو کەسە بۆ ئەو کەسێکی گرنگە تا کۆتایی قسەکان تەلەفۆنەکە ڕادەگرێ چونکە وەڵامی دووڕوویی بە دووڕوویی دەداتەوە.

ئەو نموونانە بە شێوەیەک لە شێوەکان، ئەوە دەردەخەن کە کۆمەڵگەی دواکەوتوو باری گرانی ناپێویستی خستۆتە ئەستۆی خۆی و ئەگەر خراپەی زۆر و چاکەی کەم لە ژیانیدا نەبوونایە ئەو بارگرانییە پێویست نەدەبوو چونکە دارودەستەی نقوومبوو لەو نەریتیانەی ژیانیان پڕ کردۆتەوە چاوەچاوی دەرفەتێکن بەرانبەر لۆمەی توانایان و دەسەڵاتداران و زۆرداران خۆیان بێ خەتا دەربکەن و هیچیان بە دەستەوە نییە ئەوە نەبێ سووکایەتی پێشەواکان بە کەمالیات و زیادە بزانن. ئەوەش وێنەیەکە لە وێنەکانی نەخۆشخانەکەمان و بەرز و نەوی، هەر یەکە و بە پێی دەرفەتی ڕیاکاری بەشداری تێدا دەکەن. پیاوانی دەوروبەری خۆمم لەخێزانی کەمدەرامەتدا دیوە شانازییان بە خۆیانەوە کردووە و سەریان بۆ هیچ کەسێکی سەر بە دەسەڵات و دارایی نەوی نەکردووە و ئەو خەسڵەتەم لەوەدا لێ دیتوون کە خۆیان لەوە بەرزتر بینیوە لە بۆنەکاندا سەردانی دیوەخانی

ئاغا و ئەشراف بکەن و ڕەنگە خوالێخۆشبوو قادر ئەفەندی دەبباغ [نازناوی ئەفەندی لەوەوە بە سەردا هات لە قسەکردنی کوردیدا شێوازی تورکی بەکار دەهێنا] بە نموونەی گەورەیی و بەکەرامەت دابندرێ چونکە لەوپەڕی هەژاریدا بوو بەڵام وەرگرتنی زەکاتی لە کەس قەبووڵ نەبوو و بە شێوازە باوەکەی خۆی دەیگوت: بیدەنە یەکێکی فەکیر [لە قسەکردندا، بە پێی ڕاهاتنی تایبەتی لە سەر زمانەکەی خۆی قافی دەکردە کاف]. گەلێ جار خۆمم دەدواند: ئەگەر من لە ژیانێکی ئاوها هەژارانەدا بوومایە، دەبێ وەکوو ئەو بەرگەی ئەو ژیانەم بگرتبایە؟ مەحاڵە... مەحاڵ... لە خۆڕاگری ئەو خوالێخۆشبووە و خەڵکانی کەمی تری وەکوو ئەوەوە، هیوای ئەوەم لە لا دروست بوو دەست بە کارێکی سوودبەخش بکەم لە پێناوی گەلی کورددا لە عیراقی سەردەمی پاشایەتیدا، چونکە دەمزانی چەندین خێزانی ناسراوی کورد لە دروسبوونی دەسەڵاتی بەغداوە لە 1920دا و دواتر، مەیلی سیاسی نەتەوەییانەیان هەبوو. ئەگەر بکرابا ئەو خێزانانە لە کۆمکارێکی دۆستانەدا کۆ بکرابانەوە و لە بادینانەوە بۆ سۆران و هەتا بابان هاموشۆی سەرنجڕاکێشیان لە نێواندا دروست بوایە دەبوونە تیشکۆیەکی هەستپیکراوی دوور لە گومان و دروستکردنی مەترسی و جیاوازی لە نێوان دابڕان و هاودەمێتی و کۆیەتی گەلێ زۆرە و پەیوەندییان بە حکوومەتەوە لە بەرژەوەندی هەموو دانیشتوانی کورددا دەبوو و ئەگەر دەرفەتیش هەبوایە قورساییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی وامان پیکدەهێنا کە حسێبی بۆ بکرابا و بەوە یا بە شتێکی جێگر و وەک ئەوە نەبوایە نەدەکرا.. بەڵام هەوڵەکە بەری نەبوو، چونکە ناودارترین کەسم هەڵبژارد تا ئەو پێشنیازەی پێ ڕابگەیەنم و ئەویش لە گەورەترین بنەماڵەی کوردستان بوو و سەروەریی بۆماوەیی دینی و دنیایی و ڕۆشنبیری سەردەمانەی زۆری بۆ مابوونەوە و دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوانماندا هەبوو.. بەڵام باوەڕهێنانی ڕانەگەیاند و بیانووی هێنایەوە و کێشەکانی ئەو کۆمەڵە پێشنیازکراوەی ژمارد، هەروەها هەڵوێستی دەسەڵاتیش... پرۆژەکە هەر لە هەناوی دایکیدا مرد. لە ڕاستیدا هەڵوێستی کۆیە و پشدەر و هەولێر و هەندێ کەسایەتی بادینانم پێوابوو بێ ئەوەی ئاماژە بە بەرنامەیەکی ڕێکخراوەیی بدەم و ئامەدەییەکی ڕانەگەیەندراوم لێ بەدی کردن کە مژدەی پێشوازیکردن بوو، بەڵام ئەوەی پێی دەڵێن بناغە، واتە کەسایەتی سەرەکی لە هەوڵەکەدا بە هۆی نەریتی خۆیەوە بناغەی بیرۆکەکەی هەڵتەکاند. لە شوێنێکی وەک وڵاتی ئێمەدا کە لە سەر (دەمودەست) دروستبووە بە تایبەتی لە دوای شۆڕشی تەمموزەوە، بەدەستهێنانی هەر سوودێک بۆ شارێک یا پارێزگایەک یا ناحیەیەک دەستکەوتێکی بەرزە و دووبارە نابێتەوە. بە پێوانە لەگەڵ ئەوەدا، خۆلادان لە خراپە چەند گەورە یا بچووک بێ دەبێتە دەستکەوتێکی هەستپێنەکراو. خەڵکی دڵڕوون بایەخ دەدەتە ئەو دەستکەوتە با شاراوەش بێ. دەکرێ لەو سەرنجەوە بەرنامەیەک دابندرێ خراپەکاری بێئەنجام پەراوێز بخا و ئامێز بۆ هاوکارییەک دەگرێتەوە کە خەمخوارێکی پێشپێگیراو پێشکەشی دەکا! لە ڕاستیدا، ئەگەر مرۆ خۆی لەگەڵ پێشکەشکردنی هاوکارییەکدا ڕاهێنا کە لێی

هەڵدەستیٚ و پێشکەشی ئەوانەی کرد پێویستیان پێی هەیە، دوو جار ئاسوودەیی دەبینیٚ، جارێکی لە هەستکردنی بە دڵنەرمی و جارێکیش لەوەی کێشەی کەسێکی چارەسەر کردووە کە پێویستی بووە. تەنانەت چاکەی سێیەمیش لەپێزانینی خاوەن کێشەدا دەبینیٚ... ئەو ڕاستیانە لەهەموو بارودۆخێکدا بەهای خۆیان لە ڕایەڵی کۆمەڵایەتیدا هەیە. بەڵیٚ خەڵک هەن بە فێڵ و داهێنانی پێویستی دەرفەت دەقۆزنەوە و ئەگەر چاکە لەگەڵ کەسێکی تردا بکریٚ بێزار دەبن. لەگەڵ ئەو ڕاستییەشدا کە گەرد دەخاتە سەر دڵ بوونی هەوێنی هەستکردن بە هاوسۆزی و تەنانەت سۆزی یەکلایەنەش لە نیشانەکانی بەختەوەرییە چونکە هەوڵدان بۆ دابینکردنی پێداویستی خەڵکی یا زوڵملێکراو دوو خێری هەیە: ویژدانی چاکەکار و دووەمیان نەبوونی خراپەکاری لەو کارەدا کە چاکەیە، واتە نەبوونی دەستدرێژی لەو کارەدا. لە ئیسلامدا (إماطة الأذى عن الطريق - پاککردنەوەی ڕێگا لە ئازار) لقیکە لە لقەکانی باوەڕ چونکە خێرێکی بەردەوامە نەک پێویستی تاکە کەسێک بیٚ و ببڕێتەوە. بیرم لەو دیاردەیە کردەوە و لە ڕەفتاری ئەو مرۆڤانە ورد بوومەوە کە دەیانبینم، بۆم دەرکەوت بە سەر ڕەفتاری جیاوازدا دابەش بوونە و دەگەنە ئەوەی پێچەوانەی یەکتر بن: یەکەم دەستە خەلقەندە گەلێکن بە ئازاردانی خەڵکی ئاسوودە دەبن و بە ئەشکەنجەدان و سووکایەتی پێکردنیان و شتی لەو بابەتانە دڵخۆش دەبن. دووەمیان چاکەکارییان پێش ویستی خۆیان دەکەویٚ و ئەوانەش بە ژمارە زۆر کەمن و لایەنی بەرانبەر دەستەی یەکەمە. زانیومە هەندیٚ کەس لەزەتیان لە خۆراکێک نەکردووە ئەگەر میوانێک بەشداری لەگەڵیدا نەکردبیٚ، سێیەمیان لە سەر هێڵی بێلایەنە و نە لەمیوان وەڕس دەبیٚ و نە تەنهایی پیٚ خۆشە. خەڵکی تر بە میزاجی جیاوازەوە هەن تیایاندا هەیە واز لەمیوان دینیٚ بە دەردی خۆیەوە و هەیە تا ئاستی بێزارکردن زۆر لە میوان دەکا و سێیەم خۆراک لە بەردەم میوان کەڵەک دەکا و پارووی بەلەزەتی گۆشت بۆ میوان هەڵدەبژێریٚ. میوانیش هەمەشێوە و هەمە مجێزن. خەڵکم دیوە دەستی بۆ خۆراک نەبردووە ئەگەر هاوڕێکەی هانی نەدابیٚ و دیتووشمە وەک گورگی برسی پەلاماری خۆراک دەدا: لە لایەنی خاوێنی دەگەڕێین چونکە باسێکی دوور و درێژی هەیە و ئەوەندە بەسە هەندیٚ لەوانەی خۆراک دەخۆن پاشماوەی پاروەکەی ناو دەستیان دەخەنەوە ناو قاپی هاوبەشی ئامادەبوان و ڕەنگە هەبیٚ تفیش ڕۆ بکا و خراپتریش بکا و دەستی بە جلەکانی بسڕێتەوە و گۆشتی ناو مەرگە بە دەستە پیسەکەی دەربێنیٚ و ئێسقانەکە بهاوێتە شوێنێکەوە کە نابیٚ بیهاویٚ!! ئەو سووکایەتییە سووکانە بەشی ئەوە دەکەن خۆشی دانیشتنەکە نەهێڵن بە تایبەتی ئەوانەی بۆ چاکە و خراپە و دڵخۆشکەر و بێزارکەر هەستیارن و سەرجەمی باسەکە هەمووی دەبێتە ئەوەی کۆمەڵێکی بەڕێزی کۆمەڵگە تاریک دادیٚ و بێزار دەبیٚ و هەندیٚ جار قێزبوونەوە لەوە زیاتر دەبیٚ هەموو کەس لێی بێدەنگ بی چونکە هەموو گەدەیەک خۆراکی پیس هەرس ناکات و ئەنجام دەبێتە ئەوەی ڕەزامەندی لێرە و لەویٚ بەربەستی دێتە پێش کە پێویست نییە ئەگەر ئامادەبوان

سەرنج بدەنە میزاجی هەموان و ئەو بەشەی سروشتیان ڕێک بخەن کە دەبێتە هۆی نەهێشتنی ڕەونەقی دانیشتنەکە. هەرچۆنێ بێ، دەرفەتی نەرمی و ڕووخۆشی لە کۆمەڵگەی دواکەوتوودا زۆر نییە و ئەوەی ڕەفتاری خۆی پێ جڵەو نەکرێ بیانووی نییە. با خەیاڵی خوێنەر بۆ ئەوە نەچێ من حەوسەڵەم بەرانبەر ئەو بێزارکەرە باسکراوانەدا نییە، چونکە من بەرانبەر نەناس و مێوانم هەرچۆنێ بن حەوسەڵەم هەیە و هەوڵ دەدەم مێوانم حەساوە بێ و لە ساڵی (1946)ەوە ڕووبەری ژووری مێوانم لە کۆیە زیاد کرد تا مێوان نەگەڕێتەوە: ئەم قسانە بۆ ئەوە دەکەم کە بیسەلمێنم لە ڕوانیندا بۆ ئاسانکاری و قورسکردن لە سەر مێوان و نەناس وردم چونکە بەوپەڕی توانام هەوڵم داوە ڕێزی بگرم و لە چارەسەری کێشەکانیدا بە شێوەیەک یارمەتی بدەم کە کەلێنی تێدا نەبێ، بەڵام... بەڵام! باشتێک لەو بارەیەوە بگێڕمەوە: پیاوێکی گوندی سکتانی سەر بە قەزای ڕانیە، دوای ئەوەی کێشەیەکم بۆی ئاسان کرد بووە ئاشنام. ڕۆژێکیان بە شڵەژاوی هاتە لام و خۆی هاویشتە بەردەمم و گوتی: دەخیلتم... کوڕەکەم کەسێکی خەڵکی گوندەکەی کوشتووە و هەڵاتووە و ئەوەش تفەنگەکەمە و دەیکەمە دیاری تا بەڵکو چارەسەرێکی بۆ بدۆزیتەوە. منیش ئارامم کردەوە و دوای پشوودان پێم گوت: من بە مەرجێ یارمەتیت دەدەم کوڕەکەت خۆی بە دەستەوە بدا و بۆی ببمە پارێزەر تا ئەوە خوایە دەرگایەکی نەجاتبوونی لێ بکرێتەوە و تفەنگەکەشت با لە لای خۆت بێ و کرێی منیش کێشە نییە، دوایی باسی دەکەین. ئەو پیاوەش وەک هەر پیاوێکی عەشیرەتی نەهاتە سەر ڕای من و پێی وابوو مەسەلەکەم بە جددی وەرنەگرتووە و خەڵاتەکەی زیاد کرد و منیش ڕەتم کردەوە و ئەویش پێی وابوو چارەسەری ئەو موسیبەتە هەر پارەیە جا بە ڕازیکردنی پارێزەر بێ یا بە بەرتیلدان بێ بە پۆلیس و دادگا. کە لە من بێهیوا بوو چووە لای پیاوانی دۆستی دەسەڵات و تفەنگەکەی پێ دان و کوڕەکەی بۆ هێنان و حوکمێکی قورس درا [بەندکردنی تا هەتایی]. دوای ماڵاوایی، هەتا مرد نەمدیتەوە، خوای لێ خۆش بێ. ئەوە تێکەڵەیەکە لە چەندین داو کە هەموویان ناهەق و لادانن بەڵام بەچکەی واقیعە و کوشتن [لە بەر شتێک کە بووە هۆی کۆشتن] هەڵەیەکە لەسەر ڕووبەری نەفامی ئەزەلی مەلە دەکا و ڕەتکردنەوەی نەسیحەت کە بە دڵسۆزی پێشکەشم کرد لە دیدی لێقەوماوەوە ئەو دەرگایەی بەرەو چارەسەر دەچێ ئەوەیە کە تفەنگەکەی پێشکەش بە لایەنێکی قارەمانانی دادگا و سوڵح بکا یا بە شێوەیەک حکوومەت بکاتە پاڵپشت!

ئەگەر لە جددیەتی خاوەن بیرۆکەی زانستی ورد بیتەوە، واتە وەکوو ئەوان جددی بیت، دوای وردبوونەوە، شتی سەیروسەمەرە دەبینیت و هەندێکیان لە نزمیدا دەبنە مایەی پێکەنین و هەندێکیشیان بە هۆی ناڕاستییەوە دەبنە مایەی پێکەنین و زۆریشیان، چۆن تۆز یا پووشکەی دەم با سەرنجت ڕاناکێشێ، ئاوها سەرنجت ڕاناکێشن: دوکندارێکی بازاڕ زەرەری کردووە و جگە لە

قوتووی بەتاڵ هیچی تێدا نەماوە کە بە جوانی ڕیزی کردوون و وا دیتە بەر زەین کە پڕ بن و لەبەر بەدبەختی بایەک هەڵدەکا و قوتووە بەتاڵەکان بە هەوادا دەبا و فێڵەکە ئاشکرا دەبێ و بە یەکجارەکی بازاڕی چۆڵ دەکا [ئەمە ڕووداوێکی ڕاستە و لە شارەکەی مندا ڕووی دا]. پیاوێکی مامناوەندی نێوان پایەداری و نەداری، هەموو عەسرانێک هەندێ کورسی نیوە بەسەرچووی ڕیز دەکرد، باوەڕ ناکەم لە ماوەی مانگێکدا کەس سڵاوێکی لێ کردبێ، بەڵام وەک شەهیدان بە پایەدارییەوە وابەستە بوو تا خوا بردییەوە [لە دەرگا کراوەکەیماڵەوە دەمبینی چاوەڕوانی هەر مێوانێکی دەکرد و منیش بەزەییم بە کیسە بەتاڵەکەیدا دەهاتەوە و سڵاوێکم لێدەکرد]. پیاوێکی دەوڵەمەند چەند باغێکی هەبوو و بە بیانووی گوڵچنینەوە دەچووە باغی خەڵکی و لێرە هەنارێکی لێ دەکردەوە و لەوێ بۆڵە ترێیەک و بە دزییەوە دەیهاویشتنە باخەڵیەوە.. لە خەڵکم بیستووە گوتوویانە ئەو پیاوە ئەگەر لوقمەی حەرامی نەخواردبا نەدەحەسایەوە... لە تەمەنی شەش ساڵیدا بووم، پیاوێکم بینی وەک دز دەچوو بۆ سەیرکردنی پاڵەوانبازی پیاوێک و ژنەکەی، کە بە پارەیەکی کەم تەماشا دەکران و بە چاوی خۆم دیتم پۆلیسێک گرتی و بە لای ڕاستی سمێڵی ڕایدەکێشا و ددانی وەک ددانی سەگ دەرکەوتبوون و بە شاپ و لە بابەتی شاپ، تف و زللە و پاڵ، دەریانکرد. بە ڕاستی بۆ سیرکردن خۆی تووشی مەترسی کردبوو چونکە بە بێ پەیژە بە دوو نهۆمدا هەڵگەڕابوو و ڕێی تێ دەچوو بەربێتەوە بۆ ناو ئەسفەلەسافیلین. پیاوێکی عەشرەتی چووە ڕەزێکەوە و بە سەر دزییەوە گیرا و بردیانە دیار حەوزێک کە خەڵکی زۆری لێ بوون. دوای ئەوەی گیرفانیان لە ترێی دزراو بەتاڵ کردەوە هاویشتیانە ناو حەوزەکەوە... و دوای دەرهێنانی ڕۆحی ئازادیان کرد... دوایی سەرۆکعەشرەتەکەی بۆی گێڕاینەوە کە گەیشتۆتە ماڵەوە ڕووداوەکەی ئاوها بۆ خەڵک گێڕابۆوە: دوایی دوو دەنکە ترێم لە ناو لۆچەکانی جلوبەرگەکانمدا دۆزینەوە و خواردمن و بوونە شفای دەردم... بە درێژایی سەردەمەکان و لە هەموو وڵاتێکدا و زیاتر لە دوو کیشوەر، ڕووداوی چرووک دەبنە هۆی هەڵوەشانەوی ڕایەڵی کۆمەڵایەتی و دەشزانین تەندروستی و سەلامەتی لە نەخۆشی و هۆکاری ترس زەحمەتترن و بیناسازی عەقڵی زیاتری دەوێ لە ڕووخاندن، جا بۆ ئەوەی هاوسەنگی کۆمەڵگە تێکبچێ پێویست بە جەنگی گشتی و بوومەلەرزەی چیالەرزێن و لافاوێ ناکا شاران ڕاماڵێ، ئەوەندە بەسە بانگی دانیشتوانی ئاسوودەی ماڵێک بکەیت و جنێویان پێ بدەیت تا فیتنە هەڵگیرسێ و خوێن برژێ... دەبێ بزانین شتی جوانی لەبەردڵان تەکلیفی زۆرترە و زەحمەتتر بە دەست دێ جا بۆ ئەوەی پارێزگاری لە تەندروستیت بکەیت دەبێ بە بەردەوامی چاودێری بکەیت چونکە هەوایەکی سارد لە جەستە تەڕە عارەقاوییەکەت بدا لەوەیە بتداتە دەست هەوکردنی سییەکانت یا کراسی دەوری سییەکانت، ئەوجا ڕزقت کەم دەبێ یا تەنانەت بە هۆی نەخۆشییەوە دەبڕێ ئەگەر دەستت کورت بێ. ئەو وردە کێشانە کە بە ژمارە زۆرن لایەکی زۆری ئاسوودەیی و ئامانج دەخۆن بەڵام لەبەر ئەوەی

لەگەڵ ڕەفتاری ناهەموار و گوێنەدان بە خەمخۆری ڕاهاتووین، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاهاتووین بە ئاسوودەیی و تەندروستیمان باجیان بدەین و پەشیمانبوونەوە لە گوێنەدانی ناپێویستی ڕەفتارمان کاویژ بکەینەوە. لە ڕاستیدا، قەبووڵکردنی ئەو وردە سەرهێشانە بەرهەمی دواکەوتنە کە لایەنێکی هەستی مرۆڤ لەوەدا کەم دەکاتەوە هەست بەو هەموو ڕێکوپێکی و ناڕێکیانە بکا کە هەن. نوکتەیەکم بیر کەوتەوە بۆ ئێرە گونجاوە، لە گەڕەکەکەماندا کەسێکی لاڵ هەبوو پێیان دەگوت (لاڵە)، چووە مزگەوت و بە تەنها نوێژی عەسری کرد. پێیان گوت: لاڵە، تۆ سێ ڕکات نوێژی عەسرت کرد. بە خەمساردییەوە وەڵامی دانەوە: مەغریب چوار ڕکات دەکەم!! ئەگەر نوێژی لاڵە سەر بە غەیب بێ و کۆی 3 و 4 بە (5) دابندرێ یا بە (100) ئەنجامگیری ڕاستی مەحاڵ دەبێ چونکە (3+4) ڕاستییەکی باوە لە ناو ژمارەکاندا و ملیۆنێک ناکاتە ملیۆنێک چونکە وا حیساب کرا کە (3+4) دەکاتە (5) کە بەشێکە لە ملیۆن وەک (7 ئەنجامی کۆکردنەوەی 3 و 4)ە و بەشێکە لە ملیۆن و ڕاستە بەڵام پەکی خراوە. گەرەکمە لە گۆشەیەکی ترەوە زیاتر ڕوونی بکەمەوە کەزیاتر سەرنجڕاکێشە. هونەری جوان و ئەدەبی جوان و بیناسازی جوان، هەموویان لەسەر بنەمای حیسابکراوی یەکلاییکراوەوە دامەزراوون بەڵام سروشتی بیناسازی جیاوازی لەگەڵ سروشتی هونەردا هەیە تا ئەوەی دەکرێ هەڵەیەکی بچووک لە دیوارێکدا پشتگوێ بخرێ بەڵام تێکچوونی وەزن و ناڕێکی قافیە لە شیعردا دایدەگرێتە ئاستێکی نزم. شیعر لە لەنگیدا زیاتر هەستیارە چونکە لە سەدا پەنجای پێکهاتەکەی وەزن و قافیەیە کەچی هونەر بونیات و پێشەکی تێکەڵی هەیە و بەرانبەر داکشان لە شیعر پارێزراوترە. ئەدەبیش لەجێی خۆیدا لە هونەر پارێزراوترە و زاناترین کەسی ئاسمان و زەریا و وشکان و درێژەی بوونی سروشتی و مرۆیی لە بەر دەستتدان، بۆ نموونە بە ڕێبازی تەجرید یا واقیدا بڕۆیت یا تیۆرییەک دابێنی پێچەوانەی پێشینان و داهاتوان بێ و بە شانوباڵی سامان و ئاسوودەییدا بڵێیت و دراوسێکەت بە نەخشونیگاری تاوسدا بڵێت و سێیەم نەفرەت لە بۆرژوا بکا و چوارەم لیبرالیزم بەرز بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا واقعی کۆمەڵگەی بەرهەمهین بە بێ هەڵەکردن، وەک وردەکاری هەنگ بێ لە دروستکردنی هەنگویندا و ئەگەر ئەم باسکراوانەی ئەم چەند دێڕە بێنیتە بەر چاوت و بیر لەو ڕووبەرە بکەیەتەوە کە بە هزر و بنەما و فەلسەفەی سەر کاغەز و هێندراو و بە لێشاو دەرپەڕیوی زاران دەیگرێتەوە، دەبینی ڕێژەیەکی سەدی زۆر کەم بیروباوەڕی لەگەڵ داس و باری و کۆمپیوتەرو دەرهێنانی نەوت و ڕاکێشانی سکەی ئاسن و دروستکردنی پرد و هەوردڕ و فڕۆکە و کەشتی و شتی لەو بابەتانەدا دەڕوا.. کارگەی چنین و تاقیگەکانی زەیتی نەرمکردنی پێستی مرۆڤ و پۆدرەی جوانکاری، هەموو دەکەونە کار و ئەنجامیش کچێکی ئەوپەڕی جوان ناوبانگی جولێت دەردەکا و دوای ئەوەی لە پێشبڕکێی جوانیدا بە یەکەم دەردەچێ سامان و خۆشگوزەرانی بە سەردا دەبارێن لە کاتێکدا ئەوانەی جوانییەکە دەخولقێنن و هاوکاریان تێدا هەیە، لەو کەشوهەوای پیرۆزباییەدا دەیەکی

بەختی جوانێکی بە بزەی ڕووخۆشیان بۆ ناوبانگ و بەدەستهێنانی کەرەسەی خۆشگوزەرانی نییە. نابێ بەختی ئەوانەشمان لە بیر بچێ کە یەدەگن و لە دەرەوەی پێشبڕکێی جوانیدان و زۆربەیان لە ناو پۆدرە و کرێم و برژانگی دەستکرد و ئەوەی لە وەرزش و بزاوتنی حیسابکراودا بۆ جوانکردنی ڕوخسار و وردیی ناوقەد و جەستەدا ئەنجامی دەدەن، دەدرەوشێنەوە. ئەو جیهانە سەربەخۆیەی سەرقاڵی ڕتووش و جوانی جەستە و ئەوانەی لە فەلەکی تەجریددا دەخولێنەوە [یا بڵێم: سەرقاڵن بە زەین و فکر و باوەڕەوە...هتد] خەریکە لە ناوچەکانی ناوبانگدەرکردن یا جێی ڕووداودا، بەر لەوەی دەست بە کاری جددی بکەن و بەرهەمیان هەبێ، دەست بە سەر زۆربەی ڕووبەری کۆمەڵایەتیدا بگرن [زۆربەی دەستەکان جگە لە خولقاندنی بشێوی هاوشانی پیکدادان و لێککەوتنی دەستەیەک لەگەڵ دەستە جیاوازەکاندا شتی تریان نییە]. ئەو داهێنەرانەی بواری تەجرید و فکر و بۆچوون، ئەگەرچی بەردێک ناخەنە سەر بەردیکەوە و نە زەرعاتێ ئاو دەدەن نە دارێک نە ئالێک دەدەنە ئەسپێک یا مانگایەک، لە بزواندنی سۆز و بزواندنی هەست بەرانبەر زوڵم و ئابڕووبردنی هەرچییەکی لەگەڵ ڕەوتی مێژودا نەیاتەوە لە چالاکترین دەستەی کۆمەڵگەن ئەگەرچی لە ڕووی ئایدۆلۆژیا و لایەنگریی سیاسیشەوە لێک دووریش بن بەڵام لەبەر ئەوەی کارێکی بەرهەمهێن ئەنجام نادەن کە چەندین توانای بوێ، وەک 1. هەبوونی کەرەسەی خاو 2. تەکنیکی پیشەسازی 3. بازاڕێک داوای بەرهەمی پیشەسازی و کشتوکاڵی بکا 4. تاقیکردنەوەی تەکنیکی و لێهاتوویی 5. توانای خەڵک بۆ کڕین... هتد ئەوان کارێک دەکەن ماتریاڵی ناوێ و تەنها فکر و باوەڕ و ڕەخنە و وروژاندن دەجوونەوە و ڕووبەرێکی کۆمەڵگە نییە ئەمانە سەردانی نەکەن و دەستی بە سەردا نەگرن و بە دەگمەن تیایندا هەیە لە سەرخۆ بن بە تایبەتی دوای ئەوەی قوتابیانی ئامادەیی و دوای ئامادەیی زۆر بوون تا ببنە سووتەمەنی کولاندن و خەڵکی هاندەر بۆ بێزاری و بشێوی ئەوانەن کە بە پێچەوانەی زانایانی سروشت و پیشەسازی و کشتوکاڵی و کیمیاگەری و ئەتۆمی و فەلەکی و بیرکاری سروشتەوە ڕۆشنبیرانی بیری سەرنجڕاکێشن.. ئەوانەش لایەنی پێچەوانەی وروژان و هەڵچوونن و لەگەڵ سروودی مارسدیس و (ئەی ڕەقیب)دا مووشەکێک بەرەو مەرێخ دەرناچێ و برینکاری بە دەم (بژێ و بڕووخێ)وە ئەنجام نادرێ و دووریش نییە کابانی مەتبەخ بە بە هۆی هاواری هەڵچووی شەقامەوە بۆ تۆڵەسەندن و کوڵنەدان هەڵە بکا و خوێی زیاد بکاتە باینجانەکەوە. ئەوانەی دەستیان بە سەر گۆڕەپانی هەڵچوون و گرژیدا گرتووە لە زۆربوونی گرژی و زیادکردنی داواکاری و بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی هیتافەوە بازنەی قەیران و بەربەست فرەوان دەکەن تا ئەوەی ئەگەر هەوڵە شۆڕشگێڕییەکانیان بەرهەمی بوو سستەمەکە ژێر و ژوور دەکەن و گێژەنگی ئاگرینی وەک شۆڕشی تەمموز بەرپا دەبێ و یەکەم خەمیان توندکردنی هەڵچوون و وروژاندن و داواکاری و ئیعدامکردن دەبێ چونکە ئەگەر لە سەرەتاوە ئەوە بە نیەتپاکیش بکات تا پەلاماری دەسەڵات نەدرێ، دوای جێگیربوون، باسکی لەو دەسەڵاتە درێژتر

دەبێ و توانای زیاتر دەبێ لەوەی کە ڕووخاندوویەتی. ئەوجا بەشی هونەرکاران و ئەهلی ئەدەب و فکر و ئایدۆلۆژیا ئەوە دەبێ بچنە ناو قاوغی خۆیانەوە بە پێوانە لەگەڵ بارودۆخی پێش شۆڕش، نەگونجان و ململانێی نێوان باڵە جیاوازەکانی تەجریدیش وەک خۆی دەمێنێتەوە... لە هەموو ئەو تێهەڵچوونانە چەپگەر لە پێشەوەی ڕیزەکانن و چەپ هەمیشە گردەبڕە لە چارەسەرکردن (کۆمەڵایەتی)دا بە تایبەتی لە جیهانی دواکەوتوواندا. ئەوەی سەیرە و بە عیراقدا تێپەڕیوە ئەوەیە دوای بەرزبوونەوەی بەهای نەوت لە چلەکاندا شتێ بە ناوی (کۆمکاری ئاوەدانکردنەوە)وە دامەزرا و چەپەکانیش باوەڕیان وابوو:

1. بنیاتنانی هەر قوتابخانە یا نەخۆشخانەیەک لە هەر وڵاتێکدا وەک سەربازگەیەک سەیر دەکرا بۆ دەرمانکردنی سوپای ئیستیعمار بێ کە لە دژی سۆڤیەت دەچێتە جەنگەوە.

2. هەموو بەربەستێکی سەر ڕووبارەکان دەکرێنە فرۆکەخانەی دەریایی و لە دژی سۆڤیەت بەکار دەهێندرێن.

3. هەموو پردێک لە سەر هەر ڕووبارێک دروست بکرێ، بۆ پەڕینەوەی سوپای ئیستیعمارە و بەرەو سۆڤیەت بەکار دەهێندرێ.

هەندێ لە مامۆستایانی ئەمڕۆ باسی بەشی ناوخۆیی سەردەمی خوێندکاری خۆیان دەکەن و دەڵێن کاتێ داوای زیادکردنی بەشەگۆشت و خۆراکی تریان دەکرد، لە سەر عەرزەحاڵێک ئیمزایان دەکرد کە ئاوها دەستی پێ دەکرد: 1ـ هەڵوەشانەوەی پەیماننامەی بەریتانی - عیراقی. 2ـ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان بۆ هەڵبژاردنی ئازاد و خاوێن 3. دانانی چاودێر لە ئەندامەتی کۆمکاری ئاسایش 4ـ خۆماڵیکردنی نەوت... 5ـ زیادکردنی گۆشت و شیرینەمەنی لە هەرسێ ژەمە خواردندا... وەک لە بیرم مابێ ئەو داواکارییەشی تێدا بووە کە بەرنامەی خوێندن لە خڵتوخاشی ئیستیعماریانە پاک بکرێتەوە. [بیرکردنەوەی خوێندکارانی ئەمڕۆ تێکەڵەیەکە لە بیری خوێندکارانی سیی ساڵ لەمەوپیش و بیری ئەم سەردەمە و ئایدۆلۆژیای غەیبیشیان چوونەتە سەر ـ بە شێوەی تێکەڵاو و تێکئاڵاو، ئەوجا هەر یەکەیان لە سەر شێوەی ئایدۆلۆژیای بەداربوو جیا دەبێتەوە]. دەبێ لێرەدا قسە لە ململانێی نێوان بیروباوەڕی جیهانی پێشکەوتوو وریا بێ کە لە دەروێشایەتی حاڵلیهاتنی ڕۆژهەڵاتی ئەوەندە دوورە وەختە لە هاوسایەتی بیری ڕۆژهەڵات و بیری ڕۆژاوایی پەراوێزێکی وا دروست نەبێ ئەوەندە بەرین بێ هەردوو لا تیایدا بەشدار بن و بیرێکی تێکەڵی وا پێکبهێنن پێکهاتەی تایبەتی خۆی هەبێ: بیری ڕۆژهەڵاتی ئامادە نییە شێوازێکی ئەندازەیی تایبەتی وەرگرێ و هەر دەستەیەکی لەوانەی خۆی بە کلکی بیری ڕۆژاواو و سەری

ئایدۆلۆژیای ڕۆژهەڵاتەوە هەڵواسیوە و لە ناو قوزاخەی خۆیەوە هەڵدەستێ و لە نزیککەوتنەوەی ئایدۆلۆژیای تر پارێزراوە و ئەوانە وەک دۆندرمەی ناو یەک کارتۆنن بەڵام هەر پاکەتێک لە دنیا دابڕاوە و لە سەر ژیانم و سەرمایە (کەم)ەکەم گرەو دەکەم لەم ڕۆوە هەتا ڕۆژێ لەناوچوون وەک ئەو تەپوتۆزەی با بەرپای دەکا، یەکێ لەو پاکەتانە یەک گوژاڵک و تەنانەت سێبەری گوژاڵکێک بەرهەمی نابێ و جگە لەو بنەما فکری و سیاسی و فەلسەفییەی کە لە (نەتەوایەتی)یەوە سەرچاوەی هەیە و بە بێ چاکەی کەس لە مێژووەوە گوازراوەتەوە، شتێ نییە ناوی (فکر، لێکدانەوە، ئاوات...) بێ و خاوەنی بۆچوونی هەمەشێوە و هەمەڕەنگ بە دەوریدا گرد ببنەوە. چۆن هەنگ بەو شانە هەنگوێنانەوە وابەستە دەبێ کە هەن، جیاوازیش لە نێوان خەیاڵ و هەبووندا زۆر زۆرە و هەنگوین هەیە و خەیاڵ لە ڕێی بە یەکگیشتنی ڕۆژانەوە، لە بۆشاییدا خۆی بوونی خۆی دەخواتەوە [لە ڕاستیدا نەبوونی خۆی دەخواتەوە] بزووتنەوەی کورد بە پاڵی مێژوو یا پێویستی ئابووری یا لەبەر پێویستی فەلسەفەیەکی سەردەم یا حوکمی ئایۆلۆژی یا سۆشیۆلۆژی [کە لای ئێمە نییە] بەڕێوە ناچێ. ئەوپەڕی هیوا لە سەرکەوتنیکدا کە بە بیری تێکۆشەرێکی کورددا بێ لە هەموو مۆخەکاندا و بە پێی پلانی داگیرکردنی ئەو بەشەی دەستی بە سەردا گیراوە، وێرانبوونی بادینان ـ سۆران ـ بابانە و بۆچوون و هیوای ئەمانەشی بە دوودا دێن: 1ـ بزووتنەوەی ئاینی 2ـ پاشماوەی چەپ کە ئاواتی زندووبوونەوەی ستالینی هەیە 3ـ پەراوێزی هەندێ حیزب کە لە ئاو چوون، هەندێکیان نەتەوەیی تێکەڵی مارکسی و هەندێکیان مارکسی بۆ بانگەوازی سەدوپەنجا ساڵ لەمەپێش دەجوونەوە و هەندێکیان نەتەوەیی تەواو کە لەبەر هەندێ هۆکار، هەرە بەهێزەکەیان پێنەگەیشتنی بیرۆکەی نەتەوەیی [پێنەگەیشتنی هیچ بیرۆکەیەکی تریش] لە ناو جەماوەردا لە ئاو چوون چونکە جەماوەر بە سەر ڕێکخراوەکاندا پارچەپارچە بوونە و گۆشەنیگایەکی تایبەت بە خۆیان نییە [لە ڕاستیدا گۆشەنیگای پێگەیشتووی پتەو لە بارەی مەسەلەی کوردەوە نییە کە بەردەوامیی بوونی کورەدە]. دەزانم خوێنەری ئەم دێڕانە گاڵتەی بەم قسانە دێ و من کە لە کونجی خۆم یا پەرستگا دنیاییەکەمدا توانایەکی ڕاستەقینەی وام نییە خەتێک بە سەر فکری ئەو خەڵکەدا بێنم بیر لە پلەوپایە دەکەنەوە یا حەزیان لێیە یا لێی نییە و کەرسەی منیش بیر و بۆچوون و هەستی خۆمە کە نێزیکەی چل ساڵە [زیاتریشە، پەنجا ساڵە] لە جێی پارێزراوی خۆیدا نەلەرزیوە و نالەرزێ و دەژێ.. وەک ئەوەی بەو پارێزگاریکردنە وەک چۆن بە قورسیی ئاسن و سووکی هەوا یەقینم هەیە یەقینم هەبێ و ئەوەندەم بەسە لە پێش چەپەکانی ئەوروپاوە ستالینم تاوانبار کردووە و لە پێش خەڵکی وڵاتەکەی خۆم و ناوچەکەدا ناواقعیەتی ئەو کۆمۆنیزمەم ڕاگەیاندووە کە لە سەر ڕووخاندنی چینایەتی (سەرووی پرۆلیتاری) هەڵچندراوە و لە دوورخستنەوەی شۆڕش بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات کۆمۆنیزمی ئەوروپا دوای من کەوتۆتەوە و ئەوەش جێی سەرسوڕمان نییە چونکە بۆ ئەوەی مرۆ بزانێ (دکتاتۆری) ناتوانێ نەجاتدەر بێ،

پێویست نییە پێغەمبەر بێ، بە تایبەتی دیکتاتۆرییەتی خەڵکانێک کە ڕەش و سپی لێکناکەنەوە و باوەڕیان تەنها بە ماسوولکە هەیە و ئەوان لە کوێ و تیۆری ڕێژەیی و تیۆرییە فەلەکیەکان و بایۆ کیمیا و ماتریالیزم و شەقکردنی ئەتۆم و بینینی کۆرپەی ناو زگی ژنی ئاوس لە کوێ... دیمەنەکە چەند سەیرە! کرێکارێکی کڵۆڵ و وەرزێرێکی کڵۆڵتر چارەسەری ئەو کونە دەکەن کە کەوتۆتە ئۆزۆنەوە و تەنانەت پێشڕەوی پرۆلیتاریا و بیرمەندەکەشی بەرانبەر [ڕەگی دووجای (ـ ج)] بە تەواوەتی دەستەوەستانە مەگەر لای پسپۆڕێکی بیرکاری فێری ببێ [لە سەر ئەم بابەتە بۆچوونی تایبەت بە خۆمم هەیە و لێرەدا، نە مەودای باسکردنی هەیە نە پێویست بە باسکردنی دەکا: بۆ شیکردنەوەی مەسەلەیەک لەگەڵ مەحاڵبوونی بیرکاریدا نیم و بۆ ئەوە پەنا بۆ لۆژیکێک دەبەم (ڕەنگە بشێ ناوی: لۆژیکی شتەکانی لێ بندرێ نەک لۆژیکی یاسا). بۆ نێزیککردنەوەی وێنەکە نموونەیەک دەهێنمەوە، ئەتۆمێک لە یەک کاتدا بە دوو کوندا تێپەڕێ، واتە یەک دووە و دوو یەکە و ئەوەش لە لۆژیکی ئاساییدا مەحاڵە]. لە کتێبەکەی گورباشۆڤدا کەناوی (پرۆسترۆیکای گۆربەشۆڤ)ە بۆ کۆمیتە چاودێرەکانی پیکهاتەی دەسەڵات و بەڕێوەبردن کەهەمیشە خەڵکی ڕۆشنبیر و کرێکار و وەرزێریان تێدایە بەڵام مەرج نییە هەمیشە بنە هۆکاری بڕیار، گوتی: کرێکار و وەرزێر و ڕۆشنبیر شیعر دەنووسن و لە دەسەڵات و بەڕێوەبردندا بەشداری دەکەن... پێم ناڵێن کریکار و وەرزێر و شاعیر لە بارەی داگیرکردنی ئاسمانەکان و نهێنی ئەتۆم چ دەزانن؟ (لە لاپەڕەکانی 51 هەتا 55 ی بەشی دووەمی کتێبی (بیروسترویکا غورباتشۆف) ڕەخنەی توندم لەو کۆمیتانە گرتووە) ئەو کۆمیتانە بەشێکن لە گاڵتەکردن بە واقیع و مەگەر لەو سستەمانەدا قەبووڵ بکرێن کە زەرەریان بۆ هەموو کۆمەڵگە دەگەڕێتەوە نەک تاکێک یا چەند تاکێکی دیاریکراو کە ئەگەر ئەو گاڵتەپیکردنە ڕێبازی بژێوی ژیانیان بگرێتەوە دەمرن.

هەر دەستەیەکی کۆمەڵگە بۆ بزواندنی واقیع بەرەو پێش بە ئارەزوو ڕەفتار بکا و بەرپرسیارەتی لە بەرهەمهێنان و دابەشکردن و بەڕێکردنی بەرژەوەندییەک لە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەدا نەبێ، دەبێتە بەربەست لە بەردەم ئەو تێروتەسەلییە کۆمەڵایەتییەدا کە دەشێ هەبێ. ئەو دەستانە، لە بشێوی شێتانەدا تێکدەر و دەستدرێژکەرن چونکە بەرهەمهێن نین و ئەگەر بشیانەوێ ناتوانن زەرەرەکە پڕ بکەنەوە. سۆز و خەیاڵ و جۆرەها بیرکردنەوەی سەراوکەتووی سەر ڕووبەری واقیعی ڕەقوتەق کە بەردەوام لە گەشەکردندان، بەرانبەر هەبوون و تێروتەسەلی و خۆشگوزەرانی خراپەکارن، لە ڕووی تێروتەسەلییەوە بێ بەرهەمن و لە ڕووی سەرفکردنەوە بە ناهەق سەرف دەکەن و لە بەردەم بەرهەمهێنەراندا بەربەستن و دوژمنی پێشکەوتنی بێبەربەستن و بیری نەزۆکیش دەخەنە هۆشی لاوان و هەرزەکارانەوە. ئەم قسانە ئەهلی فکر و هونەر و ئەدەب ناگرێتەوە (ئەوانەش کە لە ڕوانگەی زانستییەوە، دوور لە سۆز و سەرقاڵی مێژوو و کۆمەڵایەتین) و

دوورن لە دەروێشایەتی عاشقبوونی ورووژێنەرە پەکخەرەکانی هۆش، ئەوانە باشترین پاڵپشتی زانستی ئەو تیۆری و پراکتیک و تەکنیک و فکرەن کە پەنا بۆ ڕاستییەکانی کەون دەبەن بێ ئەوەی هەناسەبڕکێ بیانگرێ و ڕەگی لاملیان بئاوسێ و عارەقە هەڵڕێژن. لەڕاستیدا دەماغی خاوێن و ڕووناکی ئەوانە بەهێزترین دنگەی هیوای بوونی دەرمانی چارەسەرکردنی ئەو شێواندن و تێکچوونەی ناو ئەوانەن کە خاوەن قسە و دروشمی هاندانی هیستریایین. دەبوو خاوەن بۆچوونی بەرەواژی زانستی، لە چاو ئەوانەوە کە لە کاتی مانگگیراندا تەپڵ لێدەدەن خێراتر باوەڕی خۆیان بگۆڕن چونکە نەخوێندەوار چاوەڕوانی ئەوەی لی ناکرێ لیکدانەوەی زانستیانە بۆ کەون قەبووڵ بکا و ئەوپەڕی توانای بۆ لابردنی پەردەی نەزانین لەو بابەتە بوارەدا ئەوەیە بیرۆکەی عیفریت و جنۆکە ڕەت بکاتەوە و لە مەسەلەی مانگگیران و خۆرگیران و ڕووەکانی مانگ و بە دووی یەکداهاتنی وەرزەکاندا لە بۆشاییەکی عەقڵیدا بژێ و ئەگەر بۆ قەبووڵکردنی ئەوەی کە شەوێکی تەوەری زەوی شەش مانگە یەک ڕۆژیشی شەش مانگە زۆری بۆ بهێنی دوور نییە دووچاری تێکچوون بێ و ئەگەر قسەکەشتی قەبووڵ کرد لە باوەڕ و دڵنیاییەوە نابێ... باسەکە درێژە دەکێشێ و ئەوەندە بەسە بڵێم خەڵکی ساکار بە گشتی و ئەوانەی ئاستی ڕۆشنبیرییان نزمە، دوای دەیان ساڵی تێکەڵکردنی بۆچونی داستانئاسا کە لە ڕابردوویەکی دوورەوە گوازراونەتەوە، لەگەڵ بۆچوونی زانستانەی نوێدا، کە زۆربەی بۆماوەکان لە بواری لێکدانەوەی کەون و لێقەوماندا ڕەت دەکاتەوە، لەم ڕۆژگارەدا لە پەژارەیەکی ڕۆحیدا دەژێن و [لای هەندێک فکریش] چونکە داهێنانە هەم سوودمەند و هەم سەرسوڕهێنەکان وەهم و خەیاڵی خەڵکیان شێواند، بە تایبەتی لای خەڵکە نامەسیحییەکان و بە تایبەتیتر دینە بێتەکان و لە پێش هەموویانەوە ئیسلام کە پڕە لە کەلەپووری گوازراوەی سەردەمی دوای یەکەم سەدەی کۆچی کە وەرگێڕانی ڕۆشنبیری یۆنانی، کە لە لیکدانەوەی هەر شتێ کە ئەو سەردەمە لێکدانەوەی بۆ کرابێ، باوەڕی بە بیری دنیایی موتوربە کرد بێ ئەوەی دەستدرێژی بکرێتە سەر باوەڕ ئەگەرچی خەڵکیش هەبوون دینیان ڕەت دەکردەوە. هەندێک بیروباوەڕیانم خوێندۆتەوە تیایاندا هەیە بایی ئەوە بێ ببێتە دایکی تیۆرییەکەی داروین و گوتوویانە: دانی پێدا دەنێین کە گۆڕانکاری لە ڕەنگ و شێوە و قەوارە و درێژی بە هۆی کاریگەری گەرمی و ساردی و شی تەڕی و وشکی و بەرزی و نزمی جێگەوە ڕوو بدەن، بەڵام باوەڕ ناکەین لە چاوترووکانێکدا قەومێک ببنە مەیموون، مەبەستیان ئەو ئایەتەیە کە دەڵێ (کونوا قردة خاسئين ـ ببنە مەیموونی چرووک). ئیبن ڕاوەندی، ئەگەر ئیعجازی قورئان لەگەڵ کتێبێکی دەگمەندا، هەر یەکە و لەبواری خۆیدا یەک نەهاتباوە، ڕەتی دەکردەوە. سەرجەمی موسوڵمانان بە دەست دووبەرەکی و زۆریی و جیاوازی مەزەبەوە دەتلانەوە بەڵام چ دەسەڵاتیان نەبوو و ئاسانترین شت بۆ دەستەیەک ئەوە بوو بە بێ بیرکردنەوە و قووڵبوونەوە لە ناوەڕۆک و جیاوازییەکانی لەگەڵ مەزەبەکانی تردا دوای مەزەبی خۆی بکەوێ. لە ڕاستیدا ئەوەی لە

مەزەبێکدا بۆ لایەنگری خۆی شتێکی ڕووکەشە و بە دەگمەن خەڵک بووە چووبێتە قووڵاییەکەیەوە یا توانیبێتی بەرانبەر کەسێکی مەزەبێکی تر بەڵگەی باوەڕهێنەر بهێنێتەوە یا تەنانەت بەرانبەر ناموسوڵمانێکی پێ بگرێ و ئەوپەڕی توانای بۆ خۆدەربازکردن لە تێکشکان ئەوەیە ئەوانەی مەزەبەکانی تریش لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا، وەک خۆی پێخاوس و ڕووتن[27].پێشکەوتنی زانست بە ڕێژەی ئەندازەیی چۆتە مەودای خێراییەوە و گەورەترین بەربەست لەبەردەمیدا ڕەوتی کیسەڵئاسای ڕەشەخەڵکەکەی جیهانی پێشکەوتووە. کە کۆرپەی ناو زگت پیشان بدەن چۆن گەشە دەکا، جیاوازی زۆرە لەگەڵ ملیۆنان خەڵکدا کە یاریزانیکی تۆپی پێ دەپەرستن کە بە شەقێکی سەرکەوتووانە تۆپەکە دەخاتە ناو گۆڵی بەرانبەرەوە یا لەگەڵ ئەو پێنج ملیۆن کەسەی بە دوای جەنازەی شازادە دایانەدا دەڕۆن. خۆزگە بەکارهێنانی داهێنانی زانستانە لە لایەن خەڵکەوە بە میقداری تێگەیشتنیەوە مەرجدار بکرابا تا پەیوەندی لە نێوان ئۆتۆمبیل و فڕۆکە بزانێ هەروەها لە نێوان ئامێری تری سەفەریان، چونکە ئەوە کفری نیعمەتی زانستە کەرێک بە دوو پێوە سواری ئۆتۆمبیلی ڕۆڵزڕایز یا کادیلاک ببێ و ئەنگوستیلەی ئەڵماس لە پەنجەیدا بێ، ئیتر نازانم چی لە سەرمایە دەمێنێتەوە پەنجا خێزان، تۆ بڵێ سەد خێزان لە سەری بژێن.. چی بەشی کەری ڕێزدار دوکا کە لەو کەمالیاتانە بار کرابێ کە ناویان نازانم، هەر وەها عەتر کە سەر دەسووڕێنێ و لەگەڵیدا ڕانەهاتووە و پێڵاوێک لە پێ دەکا قەیتانەکەی لە سەری خاوەنی بەنرخترە... نوکتەیەکم بیر کەوتەوە بۆ ئەم جێیە لەبارە: لە ڕۆژنامەیەکی عارەبیدا خوێندمەوە ئەمەی لە گۆڤارێکی ڕۆژاواییەوە گواستۆتەوە گوایە یەکێ لە دەوڵەتانی باشووری ئەمەریکا ئینقلابێکی سەربازی تیایدا ڕوویدا و هەموو دەسەڵاتدارەکان سەربازی بوون و باسی جەنگەکانی ناپلیۆن هاتە نێوانیانەوە و یەکێ لە ئەفسەرەکان باسی ئەفسەرێکی ناوداری ناپلیۆنی کرد بێ ئەوەی ناوی بێنێ، سەرۆکی حکوومەت کە بەخۆشی ئەفسەر بوو پێی گوت: ناوی "جەنەراڵ مۆتۆرس" بوو. ئیتر حاڵوباری هاوڵاتیەکانمان، کە لە کاتی مانگیراندا خاوەن تەپڵن لە ڕووی نائاشناییەوە بە بەرهەمی زانست، بە حاڵوباری ئەوانە بپێوە کە لە سەرەوە باسم کردن و سەر بە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانن. دەتوانین بڵێین حاڵوباری ڕۆشنبیر لە وڵاتی دواکەوتوودا لە ڕووی ئاسوودەیی دەروونییەوە خوار حاڵوباری تاکی ئاسایی وڵاتێکی پێشکەوتووە چونکە ئەو ڕۆشنبیرە ناوبراوە تەنها پشت بە توانای تاکەکەسی خۆی و لێهاتوویی خۆی دەبەستێ تا بە ئاسوودەیی لەگەڵ منداڵی خۆیدا بە کەرامەتی پارێزراو و مافی پارێزراوەوە لە ناو ململانێی نامەعقوولەکاندا بژێ، کەچی تاکی ئاسایی لە دەوڵەتی پێشکەوتوودا پێویستی بە لێهاتوویی و توانا و زیادیی زانست نییە تا بە کەرامەتەوە بژێ چونکە کەرامەتی پارێزراوە و چونکە شتەکان ڕێکخراون و یاسا پارێزگاری لێ دەکا و پۆلیس بە دەگمەن نەبێ ناتوانێ بە پشت یاسادا پێچ بکاتەوە. ئەو بۆشاییەی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی دواکەوتوو و ئەو کەمایەتییەدا هەیە کە لە تورەهاتی سەدەکانی ڕابردوو دەرباز بوونە، لەبەر زۆر هۆ بە

ئاسانیی پڕ ناکرێتەوە و لەمەودایەکی نێزیکیشدا پڕ نابێتەوە، لەو هۆکارانەش باوەڕی گردەبڕی ڕەگدەرهێنانە لای خاوەنی تیۆرییە توندڕەوەکان کە لە دەمی گەشەکردنیدا سواری ملی خەڵک بووە، ڕێگای پشوودان نادا. ئەگەر بنیادەم مەودای پێشکەوتنی لەماوەی دەساڵدا... بیست ساڵدا... سیی ساڵدا لە کەشوهەوای ئاسوودەدا بە شێوەیەک هەبێ هەندێ لە مەوداکانی نێوان دواکەوتوویی خۆیان و جیهانی پێشکەوتوودا ببڕن، سوارەکانی توندوتیژی نیشتمانی دەستبەرداری یەک بستی ڕێگای پێشکەوتن نابن بەربەستێکی ترسناکی لە سەر دانەنێن ئەوەش لەبەر ئەوە نا کە ڕقیان لە پێشکەوتن بێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی سووتەمەنی ناخیان ڕێگەی هەوایەکی پاک نادا و قەوارەی کێشەکان بەوە زیاتریش دەبێ سوارەکانی توندوتیژی لە ناو خۆیاندا ناتەبان، ئەوەش بە شێوەی گردەبڕ وا دەگەیەنێ لەگەڵ ئارامی و ئاسوودەییدا ناتەبان و لەبەردەم هەموو ڕێکەوتنێکدا کە سروشتی مرۆڤی ئاسایی بیخوازێ ڕێگرن و بە ئامانجی دوورەدەست کەمتر ڕازی نابن. ئەوانە یا سەر بە حکوومەتێکن کە خەڵک بەند دەکا و خەڵک بە پەت ڕادەکێشێ و ئیعدام دەکا، یا بە جەزبەی سۆفییانە وابەستەی مەحاڵن: خەریکە بڵێم ئەوانەی لە جیهانی سێیەمدا لە دەست مرۆڤایەتی سروشتی دەرچوونە هەر بە فیترەت [لە ڕاستیدا ئەوەی بە خەیاڵ دروستی دەکەن و نایەتە دی] بەرەو ڕقبوونەوە لە ئاشتی و تەبایی دەچن، چونکە ئەو خێروبێرانەی دنیا کە لە ڕاستیدا کەمن، خەیاڵیان تێر ناکات و ئەو کەمەشیان بە ئاسانی دەست ناکەوێ. ئەو تێکەڵە قێزەونە کە لەهۆشی ساغدا، بە هۆی کەمییەوە دەبوو ببێتە نیعمەتێکی نازدار و بکرێتە تەڵەیەک و بۆ ئەوانە بندرێتەوە گێچەڵ بە دۆستەکان دەکەن و ململانێی دوژمنانی پێ بکەن. ڕاستە ئەو پیکدادانانە هەموو ڕۆژێ ڕوونادەن بەڵام ئەگەر بوونی نەگونجان لە سەر ڕزق و ئاسایش لە هەندێ وڵاتدا بخەینە حیسابەوە هەموو ڕۆژێ لێرە و لەوێ ڕوو دەدەن و ئەوەش ناکاتە ئەوەی ئەوانەی لە دنیادا ڕقیان لە داهاتە ئاگرێکیان لە هەموو خەرمانەکان بەردەواوە، چونکە ئەوەندە بەسە ئاگرێک لێرە کرابێتەوە و بە دوایدا ئاگرێک لەوێ بکرێتەوە و سێیەم و چوارەم و دەیەم لە نۆرەدا بن... ئەگەر نموونەیەکیشت دەوێ بەر چاو و زەینت پڕ بکاتەوە و ئەوپەڕی کارەسات بێ، جەنگی گشتی و ناگشتی هەزاران ساڵە بە دوای یەکتردا دێن و لە سێبەری کارەساتەکانیاندا هەموو کارەساتەکانی تر بزر دەبن: ڕەنگە بڵێن جەنگ لە بۆشاییدا ناقەومێ و ئەوەش قسەیەکی ڕاستە بەڵام ئەوەش ڕاستە کە دزیش، کە لە چاو جەنگەوە شتێکی ئەوتۆ نییە، لە بۆشاییەوە پەیدا نابێ: بەڵام خۆشبەختانە ئەم لۆژیکە سنووردارە و بەربەستی لە پێش دانراوە، مەبەستم دزیکردنە وەک پێوەر، تا لایەنی پێویستی و ناپێویستی ببینین دەبینین خەڵکێکی زۆر لەو کەشوهەوایەدا دەژین کە هانی دزیکردن دەدا بەڵام دزی ناکەن چونکە حەتمیەتێک نییە بۆ هەموو دزیکردنێک، هەروەها بۆ هەموو جەنگێک و بۆ هەموو کوشتنێک و خەبەردان و خوێڕێتییەک. تەنانەت من بە سروشتی لایەنگری دژە توندوتیژیمەوە، خەریکە لە هەموو مێژوودا جەنگێک نەبینم ناچاری و

پێویستییەکی مێژوویی بووبێ لەوەدا ڕاستی قسەکەم دەبینی کە دەوڵەتێکی لاواز ئەگەر بە دەردی خۆیەوە لێگەڕێی بیر لە جەنگ ناکاتەوە مەگەر سەرۆکەکەی عەقڵی تەواو نەبێ و بەرەو شێتبوونی مەزنایەتی بچێ [سەرۆکی کۆریای باکوور لەو بابەتەیە] و نموونەی ئەویش لە تەلعەت و جەمال و ئەنوەردا دەبینی کە سێگۆشەیەک بوون عاشقی هێزی ئەڵمانیا ببون و گرەویان لە سەر کرد و زۆری نەبرد دەسەڵاتی خەلافەت، دوای چەندین سەدەی دوورودرێژ لێبووەوە و دەیتوانی لەوەش زیاتر بەردەوام بێ... ڕێبازی ئەو سێیەش بەرەو نەمان بوو. لە مێژووی سەردەمدا سەرکردە هەیە ئاسوودەیی لە بشێوێنی وادا دەبینێ کە دەگاتە سنووری جەنگ و ئەگەر لایەکیان هەڵبژاردنی هەبێ و 70% لە سەرکەوتن دڵنیا بێ، بە، 100% ی هێزەوە دەچێتە جەنگەوە.. وەی خوایە چەند بەرانبەر جەنگ ناڕازیم و ڕیسوای دەکەم ئەگەر بەرپاکەرەکی جبریلیش بێ چونکە من شەیتانێکی کایەڵم[*] پێ چاکترە لە مەلایەکەتێکی شۆڕشگێڕ. شاعیرێک شیعرێکی گوتووە و تەنها بەشی دووەمی بەیتەکەم لە بیرە: (دعوني فإني آكل الخبز بالجبن... لێمگەڕێن با نان بە 'جبن'ەوە بخۆم، 'جبن'یش بەرهەمی شیرە و واتای ترسنۆکیش دەدا و ئەوەش لە شیعرەکەدا مەبەستی یەکەمە و خۆی و خەڵکی تر بە سەلامەتی لە ناو دەستێکدا خەلات دەکا ئازاری داوە و دۆستایەتی پاراستووە. خەریکە قورسترین سوێند بخۆم کە سوارچاکانی بشێوێنی و پەلەکردن و تەقڵەی پاڵەوانانە تەنها لە شوێنێکدا دادەساکێن کە خاوەنی هۆشی ئاسایی وەک مار خۆی لێیان دەبوێرێ. ئەوە لە ترسنۆکییەوە ناڵێم چونکە لە بارودۆخی سیاسیدا لە مردن نێزیک بوومەتەوە، شەش کەسبووین بۆ مردن بردیانین بەڵام نەمردین... شایەدی دەدەم هەر شەش کەسەکە بەرانبەر مردن قارەمان بوون... شەوی پێش ئەوە لە بەندیخانە بە گوێی خۆم بیستم یەکێ بە هاوڕێکەی خۆی دەگەت: ئەمانە ماوەیەکی تر ئیعدام دەکرێن، حەرەسقەومی وەریاندەگرن و کۆتاییان دێ. وامدەزانی تەنها من لەو بەرەبەیانەدا بەئاگام بەڵام خوالێخۆشبوو کاکە حوسێنی خانەقا و بابەکر مەحموود پشدەریش هەردووکیان بەئاگا بوون بێ ئەوەی هیچ بڵێن... ئەوەی بووە بەربەست لە بەردەم ئیعدامکردنمان ئەوە بوو کە بەرپرسی بەندیخانەکە هاوڕێیەکی کاکە حوسێن خانەقا بوو و هاودەمێتی منی پێ خۆش بوو و بە حەرەسقەومییەکانی گوتبوو بە فەرمانی سەرکردایەتی شۆڕش نەبێ لە بەغدا، ئەو بەندیانە نادەم. بەو شێوەیە دەرباز بووین.

جەنگ، نەفرەتی نەفرەتکەرانی لێ بێ ـ واتە نەفرەت لە هەڵگیسێنەرانی بێ ـ مۆرێکی هەمیشەیی بە کۆمەڵگەی مرۆڤەوە ناوە و ساڵێک تێناپەڕێ، تەنانەت ڕۆژێک تێناپەڕێ یەکێ لەو نەفرەتییانە نەهاڕێ و جاری وا دەبێ دوو سێ جەنگ لە یەک کاتدا هەڵدەگیرسێن و ماوەی زۆر دەخایەنن.

---

[*] کایەڵ: بێتاقەت و شلوشاو... وەرگێڕ

لەم ساتەدا کە قەڵەم بۆ نەفرەتکردنی جەنگ دەگێڕم ناتوانم ئەو وڵات و خەڵکە بژمێرم کە بە ئاگری جەنگ دەسووتێن و شەڕیان هەر ئەو دەوڵەتانە ناگرێتەوە کە لە جەنگدان بە ڵکو شەڕ و لایەنی زۆر لە لق و جۆگەی کە لێی دەبنەوە وا دەکەن ژمارەی بەشداران تیایدا چەند جار زیاتر بێ، چونکە هەموو لایەنێکی فرۆشیار و کڕیاری جەنگن و هەیانە لە یەک کاتدا کڕیاریشە و فرۆشیاریشە یا لە هەردوو لایەنی جەنگەکە دەکڕێ و بە هەردووکیشیان دەفرۆشێ. لەو تێکەڵوپێکەڵییە سامناکەی نێوان خەسڵەتی کڕیار و فرۆشیاردا لەگەڵ یەک لایەندا پێوەر نامێنێ و سەیر نییە لایەنیکی فرۆشیار لە لایەنێکی وەک خۆی بکڕێ تا جارێکی تر بەو دەوڵەتەی بفرۆشێتەوە کە لە جەنگدایە و پێویستی بەو کەرەسانە هەیە. کەمیی ئەو بەرهەمانەش بۆ فرۆشتن بەهاکەی چەند بار زیاد دەکا. لێرەدا قازانج بە جۆرێ بەرز دەبێتەوە ئیشتیا دەکاتەوە تا لەو (کان)ە ئەڵماسەدا بەردەوام بن کە نوقمی خوێنە. نەفرەت لە جەنگ و ئەو جەنگاوەرە بێت کە فیتنە دەگێڕێ. پیش پتر لە 1400 ساڵ زوهێری کوڕی ئەبو سەلمای خاوەنی (معلقات) خەڵکی لە جەنگ ئاگادار کردۆتەوە و گوتوویەتی:

إذا تبعثوها تبعثوها ذميمة وتضر إذا ضريتموها تضرم[*]

دەبینی ڕقبوونەوە لە جەنگ کۆنە بەڵام چالاکوانان لە دژی بەرپابوونی کەمن و هەرچۆنێ بێ ناتوانن دژایەتیکردنی جەنگ بکەنە پیشە و نە هەموو کەس و نە زۆربەی کەس و نە لەوەش کەمتر، ناتوانن شیعر لە دژی جەنگ دابنێن و ئەوانەی ڕقیان لە جەنگە ئەگەر دەوڵەمەندیش بن ناتوانن بە زۆر پێشی پێ بگرن چونکە ئەگەر بیەوێ بە هێز پێشی پێ بگرێ بەرگریکردنەکەی دەبێتە هۆکاری جەنگ یا زنجیرەیەک جەنگ و خۆی گەورەترین خەسارەتمەند دەبێ جا با عەنتەری کوڕی شەدداد یا ڕۆستەمی زاڵیش بێ. چارەسەری دەردی کۆمەڵایەتی دەرمانی حازربەدەست نیە چونکە چاکبوونەوە لەو دەردە کارێکی مەیلەو بایۆلۆژییە واتە لەو کەسانەوەیە کە هەست بە چاک و خراپ، و دینداری و بێدینی، زانیاری و نەزانیی و هەموو پێکهێنەری کۆمەڵایەتی دەکەن وئەوەش ئەوپەڕی زەحمەتە، ئەوەش لە بەر ئەوە نا کە لە سەرەوەی ئاساییدایە بەڵکو لەبەر ئەوەی کۆمەڵگە سوورە لەسەر بەرهەمهێنانی کەرەسەی فەساد و بێعەقڵی و گێچەڵ و بەشێکی وزەکەی بۆ ئەوە سەرف دەکا بەرەنگاری دزی ئەو ڕۆژە ببێتەوە و بەشێکیشی بۆ ئەوەیە بەرگری لە خۆی و خێزانی بکا و لەگەڵ ئەوەشدا کۆی هەردوو خەرجکراوەکە ناگاتە

[*] کاتێ بە دوای شەرحی ئەم بەیتەدا گەڕام لە چەند جێیەکدا بینیم بە (متى) دەست پێ دەکا نەک (إذا) بەیتەکەش ئاوها شەرح کراوە: جەنگ، ئەگەر بیکەن و بە ئاشتی ڕازی نەبن، لەگەڵتاندا دەکرێتەوە و لە ڕیشە دەرتاندێنێ ـ وەرگێڕ

دەیەکی ئەو فەسادەی لە مەیدانی چارەسەردا دەکرێ، هەموو ئەوانە قسەی شیرین و قەبوڵکراون بەڵام نرخی کەوڵی یەک ڕێوی نییە. لەگەڵ ئەوانە و ئەو باسانەی کە پێشتر کران و هەندێکیان ئەرێنی هاندەرن، چاوەڕوان ناکرێ نەسیحەتی وایان تێدابێ قورسایی حەرامە خۆشەکان لە جێی خۆی بجووڵێنێ چونکە زۆربەی حەرام خۆشە و نەفس عەودالێتی و تەنانەت تەماحیش پەکی ناخا چونکە سەرچاوەی حەرام بەدیهێنەری کۆشک و حۆری و کەنافە و شەرابە، خەیام دەڵێ:

ئەگەر مەی و مەعشووق هەڵبژێرین چ دەبێ   خۆ ئەنجامەکەیش هەر ئەو دووەیە

خەیام لەم چوارخشتەکیەدا زیاتر پێی لێ هەڵدەبڕێ:

ئەگەر وەک خوا دەستم بە سەر فەلەکدا بڕۆیبا

ئەو فەلەکەم لە ناو بووندا دەردەکرد

ئەوجا فەلەکی ترم لە جێیدا دادەنا

گەیشتن بە ئارەزوو تیایدا ئاسان بێ

ئیتر بە هیوای دیدار لە بەشی دووەمی درێژەی ئەم کورتەیە ئەگەر:

1 ـ تەمەن بە بەریەوە بێ.   2 ـ توانا بەرفراوان بێ و نیەت پاک بێ.

لە دوا چواریەکیساڵی 1998 لە بەغدا، لە نووسینی ئەم بەشە بوومەوە. نەخۆشییەکی ناهەمواری کاریگەر ڕایگرتم و بە ناچاری دەستم لە نووسینی هەکگرت.

مەسعوود محەمەد

## پەراوێزەکان

[1] بە پێویستم نەزانی هەستی ئاژەڵ بخەمە سەر باسەکە، کە هەندێکیان دەگەنە ئاستی ئیعجاز

[2] ئەم ڕاستییەم لە کتێبێکی گورباشێف زانی و بەو زەرەرەی ڕێکەوتنە سەرسام بووم کە ئەڵمانیا لە شۆڕشگێڕەکان زیاتر پێویستی بوو. ئەو ژمارەیە (پەنجا ملیۆن) دەکاتە نیوەی دانیشتوانی ڕووسیای سەرەتای سەدەی بیستەم. لە لاپەڕە 61ی کتێبی (لە پەرۆشەکانی ژیان)دا لایەنگری خۆمم بۆ لینین دەربڕیوە لە ڕێکەوتنەکەیدا لەگەڵ ئەڵمانیا چونکە ئاگام لەو نرخە زۆرەی نەبوو..

[3] یەکێ لەمامۆستاکانمان لە ناوەندی هەولێر ساڵی 1935 شارەزایی لە مەیلە قوتابیەکان هەبوو و ڕۆژێکیان ڕووی دەمی لە قوتابیەکان کرد و گوتی: ئێوە هەمووتان پێتان سەیرە بۆچی مامۆستایان نامردن. ئەوجا ڕووی لە یەکێکیان کرد و گوتی: ئێستا تۆ ئاواتەخوازیت من بەربمەوە و بمرم تا لە سەرهێشەی ئەم وانەیە ڕزگار بیت.

[4] باوکی (تۆفیق وەهبی)ی زانا بوو کە چەند ساڵێک لەمە بەپێش لە لەندەن کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی لە پیرمەگروونی دیار سلێمانی نێژرا کە 30 کیلۆمەتر لێیەوە دوورە.

[5] سەرەتای عقڵ حاڵەتی هەستکردنە بە غەریزە و جیاوازی لەگەڵ تێگەیشتنی غەریزەدا هەیە

[6] بابەتی پیگمی و هوتنتوت و ئەسکیمۆ و خەڵکی تری ئوستراڵیا و دوورگە دابڕاوەکان (پێشتر) لە شارستانەتی لێرەدا جێی باس نییە و ناشکرێ ڕوون بکرێتەوە و وەک بابەتێکی لاوەکی کۆتایی پێ بێ. تەنها بڕیاردان لە سەر ئەوەی دواکەوتن لە ماوەی دەیان هەزار ساڵدا دەبێتە غەریزە یا نابێ، تەمەنێکی تەواوی دەوێ لێی بێتەوە.

[7] زۆر بە تەوازوعەوە دەڵێم تێپەڕاندنی خێرایی تیشک دەرگا بە ڕووی جیهاندا دەکاتەوە و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو دەبێتە کارێکی ئاسان.

[8] پیتی تێکەڵی بێ واتایە بۆ نوکتە دەگوترا و 30 ـ 40 ساڵ لەمەبەر بە سەر زاری فەقێی مزگەوتەکانەوە بوو.

[9] بە بۆچوونی من سۆسیالیزمەکەی لە سەر نیەتسافییەکی وا دامەزرابوو خۆشگوزەرانی بە هەزاران بگەیەنێ، بەڵام ئەوەندەی بەس بوو داوای دادپەروەری کۆمەڵایەتی بکا، چونکە سۆسیالیزم مەرجگەلێکی هەیە هەتا ئێستا لە جیهانی سێیەمدا پەیدا نەبوونە. سۆسیالیزم لە سەردەمی جەمال عەبدلناسردا پەیڕەو کرا و خەریک بوو ئابووری میسر دارمێنێ.

[10] ئەگەر ئیلتیزام بە باسکردنی مەرجەکانی حەرام و حەڵاڵەوە لە دینە جیاوەزەکان و مەزەبەکانیاندا لە مەسەلەی هاوسەرگیری ژن و پیاودا بکەین دەبێ بۆ ئەمانەتی بابەتەکە دەست لە باسەکەمان هەڵگرین. یەک نموونە دەهێنمەوە: برا و خوشکی شیری لە ئاینەکاندا بەر چ حوکمێک دەکەون؟

[11] بە بێ زیادەڕۆیی دەڵێم: کیژێک کە ناوی ئەستێ بوو کچی حەسەنی کوێخا خدری گوندی کانیکەند بوو کە بە هاوینەهەواری چنارۆکەوە وابەستە بوو بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەری وا باڵۆرەی دەگەت کە شتی وا نابێتەوە. ڕاهاتن و خۆشیی دەنگی وایان لێی کردبوو جۆرە باڵۆرەیەک دابهێنێ کەپێشتر بوونی نەبوو و کەسی تریش پێی نەدەگوترا. بە جوانیی مرد و هونەرەکەی لەگەڵیدا نێژرا...بە داخێکی گرانەوە.

[12] ساڵی 1970 لە چین بۆ هەر 27077 کەس ئۆتۆمبیلێک هەبوو و ساڵی 1980 هەر 18673 کەسە و ئۆتۆمبیلێکیان بەر کەوتووە...

[13] من ساڵی 1919 هاتوومەتە دنیاوە.

[14] لە کاتێکدا من خەریکی ئەم نووسینە بووم شایەدێکی ڕاستگۆ شایەدی دا کە خوالێخۆشبوو سەدیق شەنشەلیش، ئەنجام سەرکەوتن بێ یا مردن، لەگەڵ مانەوەی شۆڕشدا بووە لە وڵات.

[15] شای گەمان: دوو دەستە بۆ گەشت و گوزاری بەهار دەچوونە دەرەوەی شار و لە کۆتایی ڕۆژەکەدا شەڕشاپیان دەکرد و مەرجیش ئەوە بوو شاپ بەر پاشەڵ بکەوێ و گەلێ جار بەر گونیش دەکەوت و دووچاری فتقی دەکرس. ئەو گەمەیە، وەک زۆر گەمەی تر لەناوچوو.

[16] پێشتر، لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژە بەم ڕووداوە کراوە.

[17] مەبەست سیاسەتمەدار و حیزبییەکانی گەلە پێشکەوتووەکانە.

[18] سەردانی جۆرج بوش بۆ چین لە سەردەمی ماودا، پێش ئەوە بوو بۆ سەرۆکایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەڵبژێردرێت.

[19] بەو حیسابەی مەودای نێوان زەوی و خۆر 93ملیۆن میلە و بە سەر خێرایی 10000میل/ سەعات دابەشی بکەیت ئەنجامەکەی دەبێتە 9300 سەعات.

[20] ئەو دوو ڕستەیە لە داهێنانی فەقێی مزگەوتەکانن وەک نموونەی بێبەهایی ڕای بەرانبەر و هیچیان چ واتایەکیان نییە.

[21] مەبەست لەو دوو دێڕە ئەوەیە کەسێکی بێهیممەت بەخیلی بە کەسێکدا دێتەوە هیممەتی کردبێ و دەوڵەمەند بووبێ. بەخیلەکە بە خەسڵەتی خراپ باس دەکرێ، بۆچی ئەویش وەک بەخیلی پێبراوەکە هەوڵ نادات؟ کەمترین شتێک کە لە هەژارێک داوا دەکرێ ئەوەیە باسی خەڵک نەکات. بە قسەی سووک لەبەر ئەوە زەرەر بە دەوڵەمەند و پایەدار ناگەیەنێ کە لەکۆنەوە خراپن.

[22] کۆلۆمبس بۆی نەلوا سەفەرەکی بە دەوری زەویدا تەواو بکا ، بەڵام دوایی ماجەلان ئەو شۆڕشەی کرد بەڵام لە کاتی گەڕانەوەیدا لە ڕۆژهەڵاتەوە، کوژرا و گەورە ئەفسەرەکانی سەفەرەکەیان تەواو کرد.

[23] زانست لە ڕێڕەوی باوی خۆی لای ئێمە زانستی مزگەوت و زانستی سەردەم دەگرێتەوە. لە ڕاستیدا زانا کوردەکان لە هیچ بوارێکی وانەگوتنەوەدا لە قافڵەی نەتەوە موسوڵمانەکانی تر دوا نەکەوتتوون. بە بیری خوێنەری دەهێنمەوە کە وشەی (زانست) لە کۆنەوە زانستە تیۆرییەکانی ئاین و زمان و شتی لەو بابەتانە بووە. بەڵام زانستی تاقیکاری پێی دەگوترا زانستی بارودۆخ (العلوم الوضعیة).

[24] لە کتێبە ئاسمانییەکاندا ئایەت هەیە بۆ هاندانی خەڵک بۆ جیهاد.

[25] لە سەردەمی پاشایەتی، بیست ساڵ زیاتر پێش تەممووزی 1958

[26] یەکێکە لە ئاغاکانی دزەیی ناوچەی مەخموور و شاری هەولێر.

[27] بۆ بەڵگەی ئەو قسەیەم: برادەرێک پرسیاری خۆری لە کەسێک کرد، ئەویش گوتی: واتە چاوی خوا. ئەوجا پرسیاری مانگی لێ کرد ئەویش گوتی: واتە چاوی خوا. منیش پێم گوت: کەواتە خوا خێلە و کێشەش ئەوەیە خۆر ئاوا بێ و مانگ بە دەرەوە نەبێ.

«...»